# مەملەكەتی پێغەمبەران

بەرگی یەكەم

دیدێكی نوێیە لە قورئان و سوننەت و خوێندنەوەیەكی واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

ماكوان كەریم

بسم الله الرحمن الرحيم

# مەملەکەتی پێغەمبەران

## بەرگی یەکەم

### دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت

### و خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

نووسین: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە و نووسینەوەی: باران ئاریایی

پێداچوونەوەی: پ. ی. د. جەعفەر گوانی


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394
بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی 07509998182
فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana
ئینستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana
لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف
ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: برەو نەججاڕ

چاپی یەکەم: ٢٠٢٥

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (١٢٠٠) ی ساڵی (٢٠٢٤)ـی پێ دراوە.

# مەملەکەتی پێغەمبەران

## بەرگی یەکەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت و

خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی مێژووە

لە ژیانی پێغەمبەران


نووسین:

ماکوان کەریم



چاپی یەکەم:

٢٠٢٥

کاتێک سەیری سروشتی دەوروبەرت دەکەیت، دەتوانیت سەرسوڕهێنەرەکانی پەروەردگار بدۆزیتەوە.

دەتوانیت لە هێزی دروستکەر تێبگەیت و بەم شێوەیە باوەڕتی پێی زیاد بکەیت.

ئەوەندە سەرسوڕهێنەر لەم سرووشتەدا هەیە کە ئەگەر هەموو ژیانت بە دوایاندا بگەڕێیت هێشتا ناتوانیت هەموویان بدۆزیتەوە!

هەموو ئەمانە شوێنەواری بوونی خالقت نیشان دەدەن...

تێبینی بۆ خوێنەرانی کتێبی مەملەکەتی پێغەمبەران:

جەنابی پ.ی.د. جەعفەر گوانی تەنها بە کتێبی یەکەمی مەملەکەتی پێغەمبەرستاندا چووەتەوە، چونکە جەنابیان شارەزا و پسپۆڕن لە بواری دەستپێکی خەلق و دروستبوونی ئادەم و حەوا و...هەروەها، بۆیە جەنابیان ئەرکیان کێشا و بە کتێبی یەکەمدا کە زیاتر لەو باسانەدا خۆی دەبینێتەوە چوونەوە و سودمان وەرگرت لە بۆچون و سەرنجەکانی، خوای گەورە پاداشتی خێریان باتەوە.

ماکوان کەریم

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

کاتێك بۆ یەکەمجار ئاشنایەتیم لەگەڵ کتێبەکانی تایبەت بە جیاوازی ئایینەکان پەیداکرد، هەستی بەراوردکاری لەناخم دروست بوو، ئەمەش دەرەنجامێکی ئاساییە کاتێك چەند تێڕوانینی جیاواز بۆ شتێکی هاوبەش دەخوێنییەوە، هەر لەوێدا ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە لە چەندەها بابەت بەشێکی مسوڵمانان قوربانیان بە ئایینەکەیان داوە لەڕێگەی پشبەستنیان بە سەرچاوەی دیکەوە، بۆ نموونە پرسی تاوانبارکردنی حەوا بە خواردنی بەری دارەکەی بەهەشتو ئینجا فریودانی ئادەم، بەمەش ژن تاوانباری یەکەمە، کە بەداخەوە لە وتاری مزگەوتو لە کۆڕو مەجلیسەکانو ناو کتێبەکانیش وەکو شتێکی سەلمێندراو پێشکەش دەکرا، لە کاتێکدا ئەمە پێچەوانەی دەقی ڕاشکاوانەی قورئانی پیرۆزە، سەرچاوەکەی بۆ کتێبی پیرۆز دەگەڕێتەوە. بۆیەش دەڵێم ئیسلامەکە کراوەتە قوربانی، چونکە بە پشتبەستن بە زانیارییەکی کتێبی موقەدەسو ئینجا داپۆشینی بە بەرگی ئیسلامی، وایکردووە ژنانو ئافرەتان دژی ئایینو ئیمان بوەستنەوە، بە پاساوی ئەوەی ئایین ژن دەکاتە تاوانبارو پیسی دەکاتو مۆری پلەدوویی لەنێوچاوانی دەدا.

بابەتی چۆنییەتی دروستبوونی یەکەم مرۆڤ یەکێکە لەو بابەتانەی بینەوبەردەی زۆری لەسەرە، پێشتر ئەوە بۆ خوێنەری ئێمە هیچ گرفتێکی تێدا نەبوو، چونکە بە بەرفراوانی ئاگاداری پێشکەوتنە زانستییەکان نەبووین تا پێویست بە بەراوردکاری بکات لەنێوان دۆزینەوە زانستییەکانو دەقەکانی قورئانی پیرۆز، هەروەها هەندێك بەسەرهاتیش وەکو پرسێکی ئەفسانەیی لەگەڵ زێدەڕۆییەکان دەڕۆیشتینو چاوئەبڵەق خەندەمان دەکرد، یان لە ئاست گەورەییەکەی واقمان وڕ دەما، بەبێ قوڵبوونەوە لە ڕاستیو ناڕاستی، بۆنموونە هەر لە منداڵییەوە هەموو ڕەمەزانان مامۆستای مزگەوت باسی عوجی کوڕی عەنەقی بۆ دەخوێندینەوە، وەکو ئەوەی ساڵی پێشتر نەبیسترابێت، بە تامەزرۆییەوە گوێی لێدەگیرایەوە، کە درێژییەکەی (٣٣٣٣) بووە، ئینجا کۆمەڵە کارێکیان دەدایە پاڵی، وەك ئەوەی بە دەستێکی شاخی دەردەهێناو وەکو بەرد دەیهاوێشت، دەیان خوڕافیاتی دیکە، بەبێ ئەوەی کەس پرسیاری ئەوەی بۆ دروست ببێت، کە چۆن لەگەڵ حەقیقەتو واقیعی مرۆڤ دەگونجێندرێت.

پشتی هاتنە ناو دونیای خوێندنەوەو بەراوردكاری دەركەوت ئەم قسانەو هاوشێوەكانی هیچ پەیوەندیان بە سەرچاوە ڕەسەنەكانی ئیسلامەوە نییە، بەشی هەرە زۆریان بۆ كتێبی پیرۆزی كریستیان و جووەكان دەگەڕێنەوە، یان بۆ (ئیسرائیلیات) زانیاری دیانو جووەكان دەگەڕێتەوە، ئەوانەی مسوڵمان بوونە، یان مسوڵمانان لەوانیان وەرگرتووە، لە هەموو بارێكەوە بابەتەكە هیچ بنەمایەكی ئیسلامی نییە، كەچی مسوڵمانان باجی دەدەن، نەخاسمە كە لەگەڵ لقەكانی زانست تێكدەگیرێو گرفتی كۆمەڵایەتیو بە كەمزانینیشی لێ دێتە ئاراوە، دواجار خۆشبەختانە مسوڵمانان قۆڵی پاكسازیان لێ هەڵماڵی.

یەكێكی دیكە بابەتی سەرهەڵدانو دروستبوونی مرۆڤە، ئەمە پێشتر زۆر بە سادەیی تێدەپەڕی، بەڵام دوای دەركەوتنی تیۆری جۆراوجۆرو بڵاوبوونەوەی توێژینەوەی جیاواز، قسەی نوێ هاتۆتە بەرباس، بەتایبەتی ئەو مێژووەی بۆ دەستپێكی ژیانو هاتنەبوونی یەكەمین مرۆڤ دەستنیشانكراوە، ئێستا زاناو بیریارانی مسوڵمان لەناوەخۆیان چەند ڕاو سەرنجێكی جیاوازیان هەیە، هەموویان ئەوە ڕەتدەكەنەوە، كە مرۆڤ بەرهەمی ڕێكەوت بێت، یان دەرەنجامی پەرەسەندنێكی كوێرانەی بێ ئامانجو بەبێ بوونی هیچ دیزاینو نەخشەسازێكی پێشوەختە بێت. دواتر ڕاجیاوازەكان دەربارەی دروستكردنی تایبەتو پەرەسەندنی ئاراستەكراون، ئەوەی جێگەی هەڵوەستەو سەرنجن دەقی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزە دەرفەتی لێكدانەوەی هەردوو لایەكەی تێدایە، لە یەكەم هەنگاویشدا مسوڵمانانو فیكری ئیسلامی لەژێر هەژموونی ئیسرائیلیاتو لێكدانەوەكانی كتێبی پیرۆز ڕزگاریان دەبێت، كە لەبەرئەوەی زۆر بە زەقی بەریەككەوتنی لەگەڵ پێشكەوتنە زانستییەكان هەیە، خەڵكێكی زۆر تووشی ئیلحادو بێباوەڕی بوونە، هیچ نەبێت سەرگەردانی ژیانی گرتوونە، بەڵام مسوڵمانان بۆ هەموو ئەوانە كێشەو ئاریشەیەكیان نییە، بەتایبەتی پرسی پەرەسەندنی ئاراستەكراوو بوونی جۆری دیكەی مرۆڤ لە پێش ئێمەوە، ئەمانە بە سانایی لە دەقەكانی قورئان جێگایان دەكرێتەوە، بۆیە كە دەبنە ڕاستییەكی سەلمێندراوی بێگومان، زانایانی مسوڵمان بە ئاسانی دەتوانن تێكهەڵكێشی دروست بكەن. ڕەنگە ئەمە بۆ كەسێكی ئاسایی نامۆو هەنگاوێكی سەیر بێتە بەرچاو، بەڵام بۆ ئەو مسوڵمانانەی لە بواری زانستەوە ئیش دەكەنو ڕۆژانە ئاگاداری دۆزینەوە زانستییەكانن‌و دەشزانن چ كاریگەری نەرێنی بەسەر ئیمانی خەڵك دەبێتەوە، بۆیە بە جددی ئیش دەكەن بۆ ئەوەی لێكدانەوەیەكی تایبەتی نەبێتە مایەی لادانو لەخشتەچوونی گەنجانی خوێندەوار بە پاساوی دژایەتی نێوان ئایینو زانست، خۆ ئەگەر ئەمە بۆ كتێبی پیرۆز ئاسایی بێت، ئەوە بۆ قورئان جێگەی نابێتەوە.

برای بەڕێزمان مامۆستا ماكوان كەریم، لە دەرەنجامی هەوڵی بەردەوامی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئیلحادو گفتوگۆی مولحیدەكان، هەروەها ئاشنابوونی بە كەسانێكی زۆری

کریستیان، ئەوانەی هیچ باوەڕیان بە دینەکەیان نەماوە، پەنجەی خستۆتە سەر یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو لادانە، کە خۆی لە بەریەکەوتنو نەگونجانی نێوان زانستو لێکدانەوەکانی کتێبی پیرۆز دەبینێتەوە، بۆیە وەکو هەوڵێکی پێشوەختە لە دەرگای نوێوە هاتۆتە ژوورەوەو تیشک دەخاتە سەر لێکدانەوە جیاوازەکان بۆ ئەو دەقانەی پێشتر تەفسیری دیکەیان هەبوو، ئەو سەرنجانەی مامۆستا ماکوان لێرە باسیان دەکات، پێشتریش بەشێکی زانایانی مسوڵمان باسیان کردووە، کە هەندێکیان ئێستاش لە ژیاندان، هەروەها لە ناو کوردانیش بەشێکی ئەو قسانە گەنگەشەکراون، بەڵام نووسەر لەو کتێبەدا ڕاشکاوانەترو فرەلایەنترە. بۆیە لەوانەیە بەشێکی ئەو سەرنجانە بۆ خوێنەری کورد نوێو تا ئاستێك نامۆش بن، بەڵام ئامانجەکەی نووسەر ڕوونە، کە هەوڵدانە بۆ پێکەوەهەڵکردنی لێکدانەوە زانستیو ئایینییەکان، کە دڵنیام ئەم نووسینەو کۆمەڵە نووسینێکی پێشتر وێکڕا دەبنە سەرەتایەک بۆ دەربازکردنی خوێندنەوەی ئیسلامی لەژێر هەژموونی ئیسرائیلیاتو خوێندنەوەی سادەو لاوەکی، بەرەو لێکدانەوەی جددیو بەراوردکاری بوێرانەی قووڵی زانستیو زمانەوانی، دواجار لەو بەراوردکارییەدا زیاتر لە ڕاستییەکان نزیک دەبینەوە، هەروەها لەبری پێکدادانی نەرێنی بێئامانج، زیاتر لە ڕێگایەکیشمان لەبەردەمدا دەکرێتەوە بۆ تێگەیشتن لە قورئانو بەرپەرچدانەوەی فیکرە دژە دینەکان.

پ.ی.د. جەعفەر گوانی
کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان
زانکۆی سەلاحەددین
٢٠٢٤/١٠/١٧

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پێشەکی کاروانەکە..

کاتێک ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، واتا دەچیتەوە ناو پڕۆژەی ( إقرا) هەست دەکەیت لەناو شەمەندەفەرێکی بە ناو سەردەم و زەمەن و شاخ و دۆڵ و دەشت و بیابان و تونێل دا ڕێگا دەبڕیت، دەچیتەوە ناو پڕۆژەی هەستانەوە کە (إقرا)ە، دەبێتە هۆکاری تەمەن درێژیت ئەم کتێبە، بەرەکەتێکی زۆر و زەبەند و گەورە دەخاتە ناو تەمەنت، چونکە فێری ئەزمونی هەزاران ساڵی باشترین مرۆڤەکان دەبیت، لەگەڵ کاروان و مەوکیبی پێغەمبەران دەڕۆیت و وێستگە بە وێستگە شەمەندەفەری ژیان دەتوەستێنێت، لە هەموو مەملەکەتێکدا وانەیەکی ژیانت فێر دەکات.

هەر لەم پڕۆژەیەدا فێر دەبیت یەکتاپەرستی چییە؟ فێر دەبیت بۆچی دەژی بۆچییش دەمریت؟

لەگەڵ کەژاوەی مەملەکەتەکانی پێغەمبەران ڕێ دەکەیت، فێری سیاسەتت دەکەن، سیاسەتی ئیسلام طەڵەب فێر دەبیت لە نزمەوە، ڕۆحی سیاسی و هێز و ڕوو بە ڕووبوونەوە لە ئیبراهیم-ەوە فێر دەبیت، لە یوسف فێری دامەزراندنی جۆری حکومەتی ئیسلامی دەبیت، لە حەزرەتی موسا فێری ئۆپۆزسیۆن بوون دەبیت...هتد، بەڵام کۆمەڵێک لە پرشنگی نوور تێپەڕ دەکەیت کە باشترین مرۆڤی سەر زەمین لەوان باشتر نییە، بەڵام ئادەم، نوح، عاد، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، موسا، عیسا و محمد سەلامی خوا لە هەموویان بێت ڕەد دەبیت، ژیانت پڕ دەبێت لە نوور، چونکە کلتوری ئەوان وەردەگریت، کاروانێکی بێ وێنەیە، بەڕاستی هاوشێوەی نییە، لە سایە و سێبەری ژیانی پێغەمبەرستان فێر دەبیت کە هەموو یەک ئومەتن

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾﴾ الأنبياء

واتە: بە دڵنیایی هەر ئوممەتی ئیسلام ئوممەتی ئێوەیەو یەك ئوممەتن و دینەکەشتان یەك دینە، بەتاك و تەنها یەك خوایەکیشتان هەیە کە منم بۆیە بەتاك و تەنها عیبادەتی من بکەن و عیبادەتی جگە لە من مەکەن﴿٩٢﴾

فێر دەبیت لە ژیانیان هیچ شتێک بە هەڕەمەکی و سوتفە نەبووە، بەڵکو: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾القمر واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروستکردووە﴿٤٩﴾

بەڵکو دەقیق تریش:

﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ الفرقان واتە: هەموو شتێکی دروست کردووە لەم بوونەوەرە حیکمەتی خۆیشی تەقدیری هەموو شتێکی کردووەو ئەندازەی بۆ داناوەو کاتی بۆ دیاری کردووە﴿٢﴾

لە ئەشکەوتێکی بچووک کە ئەوەندە تەنگەبەرەیە جێگای کەسێکی بە باشی تێدا نابێتەوە، بە شاخێکی ڕووتەڵەوە کە پڕە لە تاوێرە بەرد، وشەیەک هات، تەنها وشەیەک، ئەو وشەیە خێرا لەو ئەشکەوتەوە گۆڕا بۆ گەورەترین شارستانییەت و ژیار وشەی (إقرا) بوو.

لە ڕێگای خاوەن ووشەکەوە کە پەروەردگاری بەرز و پیرۆزمانە فێر بووین، ئەم کاروانە نەجیب و کەریمەی پێغەمبەران بناسین لە زۆر بۆنە و یادەوەری و بگرە قەیران و کێشە ڕووبەڕووی جیاواز و ململانێی بە هێز و دیسان دەنگی وشەی (اقرا) وەکو دەنگ دانەوە و ئێکۆ دێتەوە بەر گوێمان بخوێنەوەو فێر بن، کە سەردەمەکان لە یەک دەچن ئەزموونەکان وەکو یەکن، قەیرانەکان هەمان قەیرانن ناو و جێگا و گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، (بۆشی باوک و کوڕ)، جەنگیزخان-ە (جۆ بایدن)یش هۆلاکۆیە، ئەگەر بازنەکە گەورەتر بکەین، دەبینین فیرعەونن، هەرەمیان بە خوێنی سەری موسوڵمانان دروستکردووە.

بەردەوام وشەکە دەوترێتەوە ( اقرا) بەڵام کێ دێت بە دەم بانگەوازەکەوە، هەر کەس هات خۆی سەرکەوتووی دونیاو قیامەتە.

ژیانی پێغەمبەران بە تەواوەتی فێر دەکات، ئەوەی بە چاکی دەزانێ لە ڕابردوودا هەڵە بووە بە پێچەوانەشەوە ﴿فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾﴾ النساء

واتە: لەوانەیە ئێوە شتێکتان لەلا ناخۆش بێت، بەڵام خوای گەورە خێرێکی زۆری تێ کردبێ ئێوە نازانن لەوانەیە منالّی باشی ببێ بۆیە ئارام بگرن لەسەریان﴿١٩﴾

ژیانی پێغەمبەرانم نە نوسیوە تا لە شەوانی بێ کارەبای و نەبونی شەحن لە موبایەلەکەت، کات بەسەر بردن بیخوێنیتەوە، نوسیومە تا شۆڕشێک دروست بێتەوە لە هەموو بوارەکاندا، شۆڕشی فیکری بیر و باوەڕ، شۆڕشی سیاسی و سەربازی، بۆ هەڵسانەوەمان نوسیومە، بۆ ڕامانم نەنوسیوە، بەڵکو بۆ کارپێکردن نوسیوومە، بۆ ئەو ڕەوەندەم نوسیوە کە دێت، بۆ ئەو جیلەی کە سەر لە نوێ یەکتاپەرستی و جیهاد و قەڵەم و خوێندنەوە کارکردن وەکو یەک تەماشا دەکەن و ژیان و شارستانیەت دروست دەکەنەوە.

کلیلی زانینی ژیانی هەموو پێغەمبەران (بخوێنە) بە (اقرا) سەرەتاکەی لە ئەشکەوتێکەوە بوو، پێتان باشە بگەڕێینەوە بۆ ئەشکەوت کە پێشتر پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هێناوینیەتە دەرەوە لە تاریکی و جەهل و خورافات.

هەموو ژیانی پێغەمبەران بزانیت، بەڵام نەزانی چۆن گەردوون دروست بووە هەر کوێر بویت، بگرە کوێری باشترە لە نەزانی و دروست بوونی گەردوون، کەواتە هیچ شارەزا نابیت لە ژیانی پێغەمبەران ئەگەر سۆراغێکی دروست بوونی مەخلوق نەکەیت لە لایان خالقییەوە کە (الله)یە.

ئەم دیدو ڕوونییە لە دروست بوونی گەردوون لە لایەن خالقییەوە، دنیا بینی و جیهانبینیت پێدەبەخشێت، مەبدەئت دا دەمەزرێت، دید فراوانی و ئایدلۆژیای ئیسلام زیاتر چەسپاو دەکات، ئەم پرسە لە سەرەتایی ئەم کتێبەدا دەخوێنیتەوە لە کۆتای ژیانی پێغەمبەردا دید ڕوونییەکی فراوانت پێشکەش دەکات، دیسانەوە دەتخاتەوە ناو پرۆژە گرنگەکە کە (اقرا) سەر لە نوێ دارێژەی بیرو باوەڕ و فیکری دەبێت، پێش ئەوەی لە خۆتەوە ڕەتی بکەیتەوە یان لە خۆتەوە قبوڵی بکەیت، چونکە زۆرجار جیلی سەردەم لەبەر خاتری ڕیشی بانگخوازێک یان سیمای یان ناوی کە سەلەفیە یان سۆفییە یان موعتەزیلە هەڵبژاردن دەکات، بیری چۆتە کە پێوەرێکی هەیە، یان خاوەنی پرۆژەی (اقرا)ە، قورئان و سوننەت دید ڕوونیت پێ دەبەخشن، نەک فلان و فیسار.

بخوێنە کە ژیانی هەموو پێغەمبەرانە لەم کتێبەدا سەرەتایەکی نوێیە بۆ کەسایەتی تۆ، بە چاوێکی پڕ لە شەوقەوە بۆ تێگەیشتن لە جیهانێکی نوێ کە لە ڕابردوودا هاوشێوەی کەم بووە.

لەگەڵ ئەم کتێبەدا دەژیت بە دەروونێکی ئارام لە خۆشترین چرکەساتەکانی ژیانت، لە هەر وێستگەیەکدا لەم مەملەکەتەدا دەستی خوای پەروەردگار دەبینیت بە ڕووداوەکانەوە، هەست بە بوونی دەکەیت لە نزیکت کە جاری وا هەیە لەو هەستەش زیاتر دروست دەبێت لات کە لە ڕەگی پەنا گوێت نزیکە.

ئەگەر خۆتت ون کردووە بە دوای خۆتدا دەگەڕێیت ئەوا تێپەڕە بەم کاروانە موبارەکەدا تا خۆت و خودی نەفست بدۆزیتەوە، مەگەر ئەو خوایە نییە کە هاواری لێ بکەیت خێرا دێت بە هاناتەوە؟

﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ ﴿٦٢﴾﴾ النمل

واتە: کێ هەیە وەڵامی لێقەوماو بداتەوە کاتێك کە دەپاڕێتەوەو هانا بۆ خوای گەورە ئەبات جگە لە خوای گەورە؟کێ هەیە خراپەتان لەسەر هەڵگرێ و لایدات؟﴿٦٢﴾

هەر زاتی بەرزیەتی ئەیدۆزیتەوە لە ڕێگای ئەم مەملەکەتانەوە کە چاودێر و ئاگادارە بەسەرتەوە،

﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾﴾ الأنعام واتە: خوای گەورە باڵادەستە بەسەر بەندەکانیداو هەموویان ملکەچ و بێدەسەڵاتن لە ئاستیداخوای گەورە زۆر دانایەو زانیارییەکی وردی هەیە﴿١٨﴾

هەرچی دەنوسین هەرچی دەخوێنینەوە بۆ ئەوەیە کە بە باشترین شێوە خوا بناسین، دەی ژیانی پێغەمبەران خوای پەروەردگارت بە جوانترین شێوە پێ دەناسێنێت.

وشەی (إقرا) کە دابەزی هەموو بونیادی شارستانیەت بوون کە توخمی گرنگی ئەو شارستانیەت و ژیارە ژیانی پێغەمبەرانە، سیمای تەوەکول و پشت بەستن بوو بە خوای موتەعال، ئەوەی خوا بییەوێت دەبێت ببێت، ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴿١٦﴾﴾ البروج هەر کەس پشتی پێ ببەستێت خوای گەورە دەرگای خێری بۆ دەکاتەوە ئەوەش لە ژیانی پێغەمبەرانەوە فێر دەبین: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ﴿٣﴾﴾ الطلاق

واتە: هەر کەسێك تەقوای خوای گەورە بکات بەوەی کە سنووری خوای گەورە نەبەزێنێ و تاوان و سەرپێچی نەکات و شایەت دابنێت ئەوە خوای گەورە دەرووی خێری لێ ئەکاتەوە لەو کێشەیەی کە کەوتۆتە ناوی و ڕزگاری ئەکات، لە ناخۆشییەکانی دونیاو قیامەت ڕزگاری دەکات، یاخود کەوتە ناو هەر شوبهەو گومانێك لە دیندا خوای گەورە دەرووی لێ ئەکاتەوەو ڕزگاری ئەکات، یاخود لەسەرەمەرگدا لە ناخۆشییەکانی سەرەمەرگ ڕزگاری ئەکات ۞ هەر کەسێك سنووری خوا نەبەزێنێ و گەڕاندنەوەی لەسەر سوننەت بێ خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی ئەدات بە شێوازێك کە بە خەیاڵیدا نەهاتووە، بەڵام کەسێك کە تەقوای خوای گەورە نەکات یان گەڕاندنەوەی لەسەر سوننەت نەبوو لەسەر بیدعە بوو ئەو کاتە تەسکی و تەنگی لەسەر ئەو کەسانەیە کە سەرپێچی ئەحکامەکانی خوای گەورە ئەکەن و تەقوای خوای گەورە ناکەن، هەر کەسێك کارەکانی بە خوای گەورە بسپێرێ و تەوەکول بکاتە سەر خوای گەورەو متمانەی بە خوای گەورە بێت ئەوە خوای گەورەی بەسە بەوەی کە کارەکانی بۆ جێبەجێ بکات بە دڵنیایی خوای گەورە کاری خۆی ئەباتە سەرو جێبەجێی دەکات و هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێگری لە خوای گەورە بکات، یان خوای گەورە بێ دەسەڵات بکات۞

ئەوەی خوای ناسی دەزانێت خوای بەسە، ئیتر لە هیچ ناترسێت، ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۞﴾ الزمر

واتە: ئایا خوای گەورە بەس نییە بۆ ئەو بەندانەی کە دەیپەرستن و تەوەکول ئەکەنە سەری؟ واتە: بەدڵنیایی خوای گەورەیان بەسە و پێویستیان بە کەسی تر نییە، بەڵام کافران لە گومڕایی و نەزانی و نەفامیاندا هەڕەشەت لێدەکەن و دەتترسێنن بەو خوایانەی کە هەیانە۞

ژیانی پێغەمبەران ئەولەویەت و هەیمەنەتی بەسەر هەموو پرسەکانی تری دیندا هەیە، هەروەکو چۆن (اقرا) دەسەڵات و لە پێش دانانە لە بەرانبەر هەموو ئەحکامەکاندا.

مرۆڤ بە سروشتی زۆر حەزی بە وەرگرتنی دینی خوایە، مرۆڤ کائینێکی دیندارە بە فیطرەتی مەیلی هەیە بۆ پیادەکردنی شەریعەتی خەوای موتەعال چۆن ئەو مەیل و فیطرەتە تۆخ دەبێتەوە لە هەناویدا، بێ گومان بە ژیانی پێغەمبەران و خوێندنەوەی لەسەر ئەو پرسە، ئیتر لە جاهیل بوون و عەجول بوون و کافر بون و موشریک بوو، ڕزگاری دەبێت دەڕوات بۆ قۆناغی بەرزبوونەوەی ئیمان و پاکی ڕۆح و ئاسوودەی دڵ دەروون، تکاو مەنزڵگەی خۆی لەم مەلەکوتانەی خوای گەورەدا یاری بکات.

کەواتە خوشک برایانی ئیماندارم لەم ئەشکەوتی تاریکی و جەهالەتی سەردەمەوە دەستان دەگرم لەو ڕەوشە تاریکەی کە تێدا دەژین، لەو ژمارە بێشومارەی کە هەمانە و ناومان موسوڵمانە، لەو شکستە یەک لەدوای یەکانەی توشمان هاتووە، ئامادەتان دەکەم بۆ دەرچوون لەو ئەشکەوتە، بەرەو دیدێکی نوێ بەسەرەتایەکی نوێ لە پڕۆژەی بخوێنە لە ژیانی پێغەمبەران.

ئەم کتێبە لایەقە پێشکەشی بکەم بە کاک عمر علی حمە لاو کە دەستی خێری بەسەرمەوە زۆر زۆرە، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنی و پاداشتی خێری باتەوە، پێشکەشە بەو ڕەوەندەی کە دەبێ بێت.

**ماکوان کەریم ٢٠٢٤/٠٨/٢٠**
**زیندانی ئیولەشمۆ/نەرویج**

# پێشەکی باس

کاتێک ئەو هەموو بێباوەڕەم لە ئەوروپا بینی کەوا هەموو ئاینێک ڕەد دەکەنەوە و زۆر بە کەمی گرنگی بە خوای پەروەردگار دەدەن، پێم وابوو هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزی سیستەمەی عەلمانی و لیبراڵی و سیستەمەکانی تری جیهان بەگشتی، بەڵام لەڕاستیدا کاتێک کە زیندانی کرام و خەڵکی نەرویجم لە نزیکەوە ناسی بێباوەڕی تەواو بوون، وڵاتانی سکەندەناڤیا بە گشتی زۆر بێدینن و هیچ ئەرزش بۆ ئایینی باو و باپیرانیان دانانێن لە کاتێکدا پێناسی خۆیان و شارستانییەتیانە.

سەرنجی ئەوەمدا کاتێک بەهەر هۆکارێک دەخرێنە زیندان یەکسەر پەلاماری کەنیسەی زیندان دەدەن و داوا دەکەن کەوا (پرسێت) یان پیاوی ئایینی کڵێسا لەگەڵیان دابنیشێت و دەست بکەن بە پاڕانەوە و نوێژی تایبەت بە خۆیان.

ڕۆژێک لەگەڵ دوو زیندانی نەرویجی هاوڕێم کەوتینە گفتوگۆ لەسەر بەهێزی و باری دەروونی لە زیندان دا، هاوڕێکەم ناوی (سڤەین) بوو وتی: سەرنجم داوە ئێوەی موسڵمان زۆر لە ئێمەی نەرویجی بەهێزترن لە ڕووی دەروونییەوە و زیاتر بەرگە دەگرن.

(ئادریان) هاوڕێی دووەمم وتی: هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە بەهێزەی هەیانە لەگەڵ خواکەیان، بۆیە توانا دەروونییەکەیان لە ئیسلامەوە وەردەگرن.

منیش وتم باشە خۆ زۆرێک لە موسڵمانەکانی ئێرە هەر بەناو موسڵمانن، زۆربەیان دەرمان فرۆش و خراپەکار و تاوانبارن، زۆربەیان هەر نوێژ ناکەن.

سڤەین: ڕاستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانیان بەهێزە.

ماکوان: ئەی ئێوە بۆ ئیمانتان بەهێز نییە؟ هۆکار چییە؟

سڤەین: هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خورافاتی زۆر لەناو ئایینی مەسیحی و کتێبەکانی وەکو تەورات و ئینجیل، ئەگەر هەڵەیەکی بچووک لە تەورات و ئینجیل بدۆزینەوە کەواتە هەموو کتێبەکە هەڵەیە، چونکە نابێت و نەشیاوە خوا هەڵە بکات، کە هەڵە دۆزرایەوە کەواتە ئەو کتێبە پەیوەندی بە خواوە نییە!

تۆ دەڵێی چی ماکوان؟

ماکوان: وتەکەت زۆر ڕاستە، خوا نابێت هەڵە بکات ١٠٠٪ لەگەڵت دام.

سڤەین: ئەی پێت چۆنە کە لە تەورات و ئینجیل دا هەڵەی زانستی، مێژوویی، دەق و دنیایەک هەڵەی تریش هەیە، جا لەبەر ئەوە خەڵکی ئەم وڵاتانەی سکەندەناڤیا بەگشتی حەزیان بە ئایین نییە، بەڵام لێرەدا زانست جێگای گرتۆتەوە و خەڵک ئایینی لا بێبایەخە و گرنگی پێ نادات.

ماکوان: ئەی بۆ زۆربەتان کە دێنە زیندان دەچن بۆ کڵێسا؟

ئادریان: لەبەر ئەوەی هیچ چڵەپووش و پەتێک نییە لەناو زیندان دەستی پێوە بگرین، ناچار بۆ ماوەیەک تا حوکم دەدرێین یان ئازاد دەبین دەبینە دیندار، بەڵام لەناخەوە باوەڕمان نییە، درۆ لەگەڵ خۆمان و کڵێساش دەکەین، مەگەر وانییە سڤەین؟

سڤەین: من ئیماندارم؛ وەک تۆ نیم ئادریان، زۆربەمان واین، لەگەڵ ئەوەی کە من بڕوام بە عیسا هەیە، بەڵام هیچ بڕوام بە ئینجیل و تەورات نییە!

ماکوان: هۆکارەکەی چییە؟

سڤەین: هۆکارەکەی دروستبوونی ئەم گەردوونەیە، زۆر میتۆلۆجی و خەیاڵ باسی دەکات، هۆکاری ژیانی پێغەمبەرانە، کە زۆر خورافی و ناواقعی و دوورە لە ڕاستییەوە.

ماکوان: وەکو چی؟

سڤەین: وەکو ئادەم و حەوا، ئیبراهیم و سەربڕینی ئیسحاق، نووح و کەشتییەکەی یاخود دروستبوونی ژیان و دروستی بوونی ژیار و شارستانییەتییەکان، تەورات و ئینجیل زۆر لاوازن، ئیتر نازانم بۆ قورئان.

ماکوان: کەواتە هۆکاری سەرەکی بێئایینیتان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی باستان کرد؟

سڤەین و ئادریان پێکەوە وتیان: بەدڵنیاییەوە!

ماکوان: ئەمجارە ئەگەر پرێسەکە[1] هات من بانگ بکەن با قسەی لەگەڵ بکەم بزانم ئەو ڕای چییە لەسەر ئەوەی خەڵکی لەم دەڤەرەدا بێباوەڕە.

لەگەڵ ئەوان جیابوومەوە چاوەڕوانی جەنابی پرێست بووم، ماوەیەکی پێ چوو هات، کە بینیم پیاوێکی بەڕێز و زۆر لەخۆبووردوو بوو، پرسیارم لێکرد زۆر بە ڕاشکاوانە وەڵامی دامەوە بە کورت و پوختی وتی: وەڵامی پرسیاری گەنج و مامۆستا و خەڵکی خوێندەوارمان پێ نییە، ئەوەی نەخوێندەوارە و هیچ نازانێت مەسیحییە.

وتەکەی زۆر کاریگەری هەبوو لەسەرم لە پاشاندا وتم: ئەی ئەوە نییە زۆربەی زانایانی فیزیا و زانستەکانی تری ئەکادیمیاکان مەسیحی و یەهوودین؟ شتی زۆر جوان لەسەر باوەڕ بوون بە خوا دەدرکێنن.

پرێست: ڕاستە خۆت وتت بیروباوەڕ بەخوا، بەڵام لەڕووی ئینجیل و تەوراتەوە قسەیەک ناکەن تەنها باوەڕ بە خوا، لەبارەی ئایینەوە ئەگەرچی ئاشکرای ناکەن بەڵام خۆیان نادەن لە نووسراوەکانی تەورات و ئینجیل مەگەر زۆر بەکەمی، ئەگەر بە نمونە باسی بکەین یان پشتی پێ ببەستن.

سوپاسم کرد بۆ وەڵامەکانی و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، بیرکردنەوەیەکی قوڵ دایگرتم وەکو فیلمێکی سینەمایی قسەی زۆرێک لە لاوەکانی کورد و نوخبەکان و ئەوانەی خۆیان بە پابەند بوو بەئایینەوە دەزانن، پرسیارگەلێکی یەکجار زۆریان لەمیشکدایە و ئەوەی کە بۆمان گوازراوەتەوە لەسەرچاوە مێژووییەکان و پاشان تەفسیرەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەرنجیان لەسەری هەیە، بەڵام ناوێرن باسی بکەن لەکۆمەڵگادا و بیدرکێنن، سەرچاوەی ئیسلامییەکان بخەنە ژێر پشکنین و ڕاستی و دروستی.

دەمزانی ئەم بێدەنگی و کپ کردنەوەیە هەروا نامێنێتەوە، ڕۆژێک دێت دەنگ بەرز ببێتەوە بەرانبەر بەو هەموو خورافیات و چیرۆکی بەر ئاگردانانەی کە خزێنراوەتە ناو باسی ژیان و ڕووداوی پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێبێت- و کاریگەری نەرێنی لێدەکەوێتەوە.

هەرچەندە من لەگەڵ پریسار کردن و پشکنین و لێکۆڵینەوە و لێورد بوونەوە لەهەموو بوارەکاندام، بەڵام لە شتێک دەترسم کە کاتەکەی گونجاو نەبێت و زاناو خەڵکی تایبەتمەند نەبێت لەو بوارانەی کە دەنگی تێدا بەرز دەبێتەوە، دەنا یەقینم هەیەو لەسەرووی دڵنیاییەوە دەڵێم ئایینی ئیسلام وەکو وەحی دوورە لە هەموو هەڵەو خێچ و خوارییەک، بەڵام کێشەم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(١) - قەشە بە زمانی نەرویج.

لەگەڵ ئەواندا بۆ دروست دەبێتەوە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا بەتایبەت زۆرێک لە بانگخواز و مامۆستایان بەناوی قوتابخانەی جیاواز جیاواز تەفسیر و تەئویل بۆ باسەکان دەکەن و زۆر جار باس و تەفسیرەکانیان پەرچەکردارە، دوورە لە بواری زانستی پوخت سەلەفی لەداخی سۆفی ئەشعەری لە داخی حەنبەلی، جەهمی لە داخی موجەسیمەکان، موعتەزیلە لە داخی ظاهیرییەکان...هتد.

سەرچاوەکانمان بە کۆنی لە لێکۆڵینەوەو تەفسیری زانایان ماونەتەوە، لەلایەن زانایانی سەردەمەوە نوێ نەکراونەتەوە، ئەگەر کرابێتەوە هێرش زۆر کراوەتە سەریان ئەوانەی کە هەمیشە لە پەرچەکرداردان.

ئەوەی کە من مەبەستمە لەنوێکردنەوە مەبەست لە تەفسیر و فیکر و بوارەکانی دەقی قورئانییەکەیە کە چەندین تەفسیری جیاواز هەڵدەگرێت، واتا لەسەر ئاستی بیروباوەڕی ئیسلامی و فیکری ئیسلامی زیاتر لە چەندین تەفسیر هەڵدەگرێت.

بە پشتیوانی خوای گەورە منیش دەستم داوەتە ئەو پڕۆژە سەختە و داوادەکەم لەخوای گەورە پشت و پەنام بێت و سەرکەوتووم بکات و نیەتم پاک بکاتەوە لەبەرخاتری خۆی بێت و دووربم لە هەموو پەرچەکردار و دەمارگیرییەک لەهەمان کاتدا ببێتە توێشووی قیامەتم.

ئەو سەرچاوانەی پشتم پێ بەستوون هەمووی سەرچاوەی ئیسلامی باوەڕپێکراوە، بەدوورم خستۆتەوە لە قسەوباس و ئیسرائیلییات و تەنانەت ئەگەر گومانم هەبووبێت کە نزیکە لە ئیسرائیلییاتەوە هەوڵی تەواوم داوە کە ئاماژەی پێ بکەم، سەرچاوە مێژووییەکانیش سێ کوچکەیەکم دروست کردووە لێی لەجەنابی (محەمەدی کوڕی ئەبی جەریری طەبەری) مێژووەکەی بەناوی (تاريخ الأمم والملوک) هەروەها جەنابی (ئیبنو ئەسیری جەزەریی) پەرتوکەکەی کە ناسراوە بە (الكامل في التاريخ)، کوچکەی سێیەم (البداية والنهاية)ی جەنابی (ئیبن کەثیر).

ئەم سێ کوچکەیە میحوەری سەرەکی بوون، بەڵام مانای وانییە کتێبی مێژووی ترم بەکار نەهێنابێت، زیاتر لە دەیان پەرتوکی تری مێژووی تێدابەکار هاتووە.

هەروەها هەوڵم داوە کە لە هەربوارێکدا فەرموودە ڕاست و دروستەکان کۆبکەمەوە و هەموو لایەنەکانی باس بکەم و ناوی شیکارەکەی بنووسم، بەهەمان شێوە ناوی ڕاڤەکارانی ئایەتە قورئانییەکانیش ئاماژە پێبدەم، چونکە ئەم بابەتە زۆر هەستیارە و زۆرێک بە بواری عەقیدەی دەزانێت، هەرچەندە لای من ناچێتە بواری بیروباوەڕەوە، مەگەر بەگشتی نەبێت واتا

بڕوا بوون بەخودی پێغەمبەران، بەڵام لێکۆڵینەوە لە ژیان و کەسایەتی و باسی زەمەن و کات...هتد هەمووی دەچێتە خانەی مێژووەوە.

کەواتە لێکۆڵینەوەکەمان لێکۆلێنەوەیەکی مێژوویی پوختە لەسەر سێ بنەمای زانستی مێژووی دادەمەزرێت، کە بریتییە لە (گێڕانەوە، پاشماوەی دێرین، بەڵگەی نووسراوی باوەڕپێکراوی دێرین).

# مەملەکەتی یەکەم:
# کەرەستەو توێشوو بۆ لێکۆڵینەوە

هەموو تیۆرو لێکۆڵینەوەیەک خاوەنی زەمینەی تایبەتی خۆیەتی کە پێکهاتووە لە چەندین زاراوە و بواری زمانەوانی و پاشان هاوکێشە چەقبەستو کۆنکرێتییەکان تا لێکۆڵینەوەکەی لەسەر دابمەزرێت.

کەرەستەی ئەم کتێبە لە چەندین مەملەکەت پێک دێت، هەر مەملەکەتە خاوەنی کەرەستە و توێشوی خۆیەتی، بۆ نمونە کاتێک باسی بەروار دەکەین دەبێت بزانین کەی دامەزراوە، یەکسەر کوێرانە بە ڕۆژمێری ئێستا بیری لێنەکەینەوە، کاتێک باسی دەقە قورئانییەکان دەکەین کە هەڵگری چەندین ڕاڤەی جیاوازن، لەم لێکۆڵینەوەدا بۆمان گرنگ نییە، بگەڕێینەوە بۆ پێشینەمان، چونکە قسە لەسەر بیروباوەڕ و عەقیدە ناکەین کەوترا (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) گومانمان نییە کە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانی سەلەف لە پێشن بۆ هەموو باسە عەقیدەییەکان، بەڵام کە هاتە سەربواری زانستی نوێ وەکو باسەکانی گەردوون و بەگشتی و باسی جیۆلۆجی (زەویناسی) و کۆسمۆلۆجی (گەردووناسی)و بایۆلۆجی(زیندەزانی)...هتد گومانی تێدا نییە کە لە ئیبنو عەباس یان ئیبنو عومەر...هتد ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت نابنە بەڵگە و حوججە بۆ شیکاری و ڕاڤەی ئایەتەکان کە چەندین ڕاڤە هەڵدەگرن.

یاخود وشەو زاراوەی قورئانی لە زمانی عەرەبییەوە تەماشا دەکەین بە پێوەری سەرەکی قورئانی و فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

جیاکاری لە بواری بەدیهاتن و بواری بەندایەتی و عبودیەتی دەقەکاندا دەکەین، هەندێک دەق باسی بەندایەتییە، هەندێکی تر باسی گەورەیی و عەزەمەتی خوایە لە دروستکراوەکانیدا.

بواری کۆمەڵناسی و ژیار و شارستانییەتی و زانینی هاتنە کایەی زمان و نووسین لە سەر ژیانی پێغەمبەران بەگوێرەی قورئان و سوننەت و پاشماوەی دێرین و نووسینە باوەڕپێکراوەکانی ئیسرائیلییات و مەجووس و هندۆس و کۆنفۆشیۆس...هتد پشتیان پێ ببەستین بەو مەرجەی لە ژێر پشکنینی تەواوی یەک بوونیان دەرچن کە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ وەحی دا.

جێگای پێغەمبەران دەست نیشان دەکەین بە گوێرەی ئەطڵەس و جوگرافیای قورئانی (شوقي أبو خليل) پاشان بە لە بەرچاو گرتنی هەموو بوارە زانستییە ئەکادیمییەکانی تری ژیان و مرۆڤ و کۆمەڵگە و گەردوون.

لەسەروو هەموویانەوە هەردوو کتێبە نایابەکەی (دوکتۆر عەمر شەریف) (گەشتی عەقڵ و چۆن بوونەوەر هاتە دی).

هەروەها جیاوازی نێوان (الأنبياء و الرسل) بەوشەی (هەواڵهێنەر) واتا (الأنبياء) و (پێغەمبەران) واتا (الرسل) باسمان کردووە.

ئەگەر وشەیەک نەمتوانیبێت بە کوردی بکەم وەکو خۆی نووسیومەتەوە بۆ نمونە وشەی (الإنسان) واتا مرۆڤ، (بنى آدم) واتە نەوەکانی ئادەم (البشر) وەکو خۆی نووسیومەتەوە بە (بەشەر)، چونکە ئەمانە لە زمانی کوردی هەمووی بەواتای مرۆڤ دێت، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ماناکانی جیاوازن و هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە و بنەمای لێکۆڵینەوەکەی ئێمەی لەسەر دادەمەزرێت. زیاتر لەناو باسەکاندا کەرەستە و ئامراز و توێشووەکانی بەدی دەکەین.

## ئامانج لەم کتێبە

ئامانج لەم کتێبە بە دڵنیاییەوە پاداشتی قیامەتە، خوای گەورە لێم قبوڵ بکات، پاشان ڕاستکردنەوەی چەمکانێک کە خەڵکانێکی زۆریان خستۆتە گومان و تەنانەت بێباوەڕی، ئامانجی گرنگتر هەموو لەوانە بە واقعیی نیشاندانی ڕووداوەکان و لابردنی ئەو تەمومژە خورافیاتانەی کە ژیانی پێغەمبەرانی لای زۆرێک لە خەڵکی کردۆتە چیرۆکی بەرئاگردان.

ئەو ئامانجانەی کە بەر خوێنەر دەکەوێت و خوێنەر سوودی لێ وەردەگرێت زۆرن، هەندێک لەوانە دەخەمە ڕوو...

یەکەم: دڵدانەوەو سەبووری هاتن بۆ ئەو کەسەی ژیانی ئەم پێغەمبەرانە دەزانێت دەبێتە ئەزموون و ڕاگیرکردنیو ئارام بەخشی پێی لەکاتی ناڕەحەتی و ناهەمواری و ناسۆر و سوێدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ١٢٠﴾ هود

واتە: لە هەموو هەواڵی پێغەمبەرانت بۆ ئەگێڕینەوە کە خوای گەورە چۆن سەریخستوون و کافرانی لەناوبردووە کە بەهۆیەوە دڵت پێی جێگیرو دامەزراو و پڕ لە دڵنیایی بێت، لەم

سورەتەیشدا حەق و پەندو ئامۆژگاری و بەسەرهاتی ئوممەتانی ترت بۆ هاتووە، یادخستنەوەیەكە بۆ باوەڕداران.

دووەم: دڵنیایی و خۆڕاگری لەسەر ژیانی پێغەمبەران، كە شارەزابوویت لە ژیانیاندا ئەوەی بەسەرت دێت لە مردن و نەخۆشی و زیندان و دووری و ناسۆری و ئازارەكانت ئارامی لەسەر دەگریت و سارێژی دەكەیت بە ژیانی ئەم پێغەمبەرانە، وەكو یەعقوب عَلَيْهِ السَّلَامُ كە خوای گەورە بۆمان باس دەكات و دەفەرموێت: ﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرًاۖ فَصَبۡرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴿١٨﴾﴾ یوسف

واتە: قەمیسەكەی یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ یان هێناو بەرخێكیان سەربڕی و خوێنێكی درۆینەیان پیادا كرد بەبێ ئەوەی كە قەمیسەكە دڕابێت و هیچ شتێكی لێ هاتبێت (ئەگەر گورگ بیخواردایە دەبوایە قەمیسەكەی بدڕایە)، یەعقووب عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: بەڵكو نەفسی خۆتان ئەم كارە ناشیرینەی بۆ ڕازاندونەتەوەو جوانی كردووە ئەوەتا قەمیسەكەی نەدڕاوەو ئەمە گورگ نەیخواردووە، بەڵام غەیبیشی نەزانی كە بزانێ لەناو بیرەكەدایەو دەری بكات (كە پێغەمبەرێكی خوا لە كاتێكی ئاوا غەیب نەزانێت چۆن كەسانێكی ئەم سەردەمە بانگەشەی زانینی غەیب دەكەن!)، فەرمووی: ئارام ئەگرم ئارامگرتنێكی جوان كە هیچ گلەیی و گازاندەیەكی تیادا نەبێ لە خوای گەورە، وە داوای یارمەتی لە خوای گەورە ئەكەم لەسەر ئەو وەسفەی كە ئێوە كردوتانە كە دەڵێن یوسف گورگ خواردوویەتی (كاتێكیش بوهتان بۆ عائیشەی دایكی باوەڕداران كرا ئەم ئایەتەی خوێندەوە).

یاخود ئەیوب پێغەمبەر خوای گەورە بۆمان باس دەكات و دەفەرموێت: ﴿۞وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴿٨٣﴾فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةً مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ﴿٨٤﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئەیووب پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ كاتێك لە خوای گەورە پاڕایەوە كە من تووشی نەخۆشییەكی سەخت بوومە (كە ئەوترێت حەوت ساڵ یان هەژدە ساڵ نەخۆش بووە) هەر تۆ خوایە لە هەموو بەڕەحم و سۆزەكان بەڕەحم و سۆزو میهرەبانتری.

چەندین نموونەی تری ژیانیان.

سێیەم: لاسایی كردنەوەی پێغەمبەران و بە پێشەنگ دانانیان و ڕەنگدانەوەی كارەكانیان لە ژیانماندا وەكو نموونەی حەزرەتی یوسف كە ئارامگر بوو لەبەرانبەر جوانی و ناسكی لاشەی

وروژێنەری خێزانی وەزیری میسر، خوای گەورە بۆمان باسدەکات و دەفەرموێت: ﴿قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ﴿٣٢﴾﴾ یوسف

واتە: ئافرەتەکە وتی: ئا ئەمە ئەو کوڕەیە کە ئێوە لۆمەتان کردم لەسەری دانی پێدا دەنێت کە من داوام لێ کرد کە بێت لەگەڵمدا کاری خراپە بکات، بەڵام ئەو خۆی پاراست وە کاری خراپی لەگەڵمدا نەکرد (ئەمە شایەتیدانە بۆ پاکێتی یوسف لەلایەن ئافرەتەکەوە) دووبارە داوای ئەوەی لێ ئەکەم ئەگەر ئەنجامی نەدات لەگەڵمدا، ئەبێ بیخەمە سجنەوە ئەبێ زەلیل و ڕیسوا ببێ لەناو سجندا.

یاخود باوکان بەتایبەت کە چاو لە پێغەمبەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بکەن کە هەموو جۆرێک لەناڕەحەتی چەشتووە لە (ماندوو بوون، لە نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، بێزار بوون، لە ئارەق کردنەوە و بێتاقەتی، لە ئەبڵەق بوون و سەرسوڕمان).

چوارەم: بەدوای پاداشتەوە نەبین لە خەڵکی و لەخوای گەورە داوا بکەین کە هاوکارمان بێت و پاداشتمان بداتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنعام

واتە: ئا ئەمانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون، ئەی محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە، شوێنی پێغەمبەرانی پێش خۆت بکەوە. ئەی محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ: من داوای ئەجرو پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەم لەسەر ئیمان هێنان و هیدایەت، بەڵکو ئەم قورئانە تەنها یادخستنەوەیەکە بۆ هەموو جیهان بە قورئان یادتان ئەخەمەوە.

پێنجەم: پەند وەرگرتن لە ژیانی پێغەمبەران و لە ڕووداوەکانی ژیانیان و بەهێزکردنی ئەزموونی خۆمان بە ڕووداوەکانی ژیانیان و بەهێزکردنی کەسایەتی خۆمان بە چاولێکردن لە هەڵسووکەتیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴿١١١﴾﴾ یوسف

واتە: بە دڵنیایی چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتانیان، یان ئەم چیرۆکەی یوسف لەگەڵ براکانی و باوکیدا پەندو عیبرەت و ئامۆژگاری تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵێکی سەلیمن و تێدەگەن ئەم قورئانە قسەیەك نییە هەڵبەسترابێ، بەڵکو بەڕاستدانەری

کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆیەتی لە تەورات و ئینجیل و زەبوور، درێژەی هەموو شتێکی تیایەو شەریعەتی بەدرێژی تیادا باسکراوە، هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ کەسانێك کە ئیمان بێنن، والله أعلم.

شەشەم: دامەزراوەیی لە بیروباوەڕ و نەگەڕانەوە و پاشگەزبوونەوە لە ژیانی پێغەمبەران، ئەو ئیمتیازانەی هەیە کە مرۆڤ وەکو شاخ ڕاوەستاو دەکات و بیروباوەڕی بەهێز دەکات و بە باوەڕی ساغ و سەلامەت، مرۆڤ ئەنجامی زۆر باش بەدەست دەهێنێت لە دنیاو قیامەت دا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ۝٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ۝٨٨﴾ الأنبياء

واتە: خوای گەورە یونس پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ لای خەڵکی نەینەوا نارد لە زەوی موسڵ، ئەمیش بانگەوازی کردن بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، کاتێك کە لە قەومەکەی تووڕە بوو بەجێی هێشتن، هەڕەشەی لێ کردن پاش سێ ڕۆژی تر خوای گەورە سزاتان دەدات، ئەوانیش دواتر دڵنیا بوون ڕاست دەکات دەرچوون بۆ بیابان و ئیمانیان هێناو لە خوا پاڕانەوە خوایش سزای نەدان، یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ گومانی وابوو کە سزای نادەین، یان لە ناو سکی نەهەنگەکە جێگای تەسك ناکەین، دوای ئەوەی کە سواری کەشتییەك بوو ترسان لەوەی نقوم بێت، سێ جار تیرو پشکیان کرد یەکێکیان زیاد بوو فڕێی بدەنە ناو دەریاوە، هەر سێ جارەکە یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ دەرچوو، بۆیە خۆی هەڵدایە ناو دەریاکەوەو ئەمیش لەناو تاریکی لە خوای گەورە پاڕایەوە ئەی پەروەردگار هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی تۆ تاك و تەنهاو بێ شەریکی پاك و مونەززەهی بۆ تۆ بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم و ستەمم کرد کاتێك کە قەومەکەی خۆمم بەجێ هێشت لێم خۆشبە۝٨٧ ئێمەش وەڵاممان دایەوەو لێی خۆشبووین لەو تەنگی و غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد، بەم شێوازەش باوەڕداران ڕزگار ئەکەین ئەگەر بۆ لای ئێمە بگەڕێنەوەو ڕوو لە ئێمە بکەن۝٨٨

حەوتەم: فێری چۆنییەتی بانگەوازت دەکات کە بە چ شێوەیەک لە واقیعەکاندا بانگەواز بکەیت، لە ڕووداوەکاندا دەبێتە ئەزموون بۆت کە چۆن بانگەواز بکەیت و لە کوێدا نەرم و نیانی بەکار دەهێنیت و لەکوێ دا ڕەق و چەسپاو دەبیت و هیچ گۆڕانکاری ناکرێت و لەڕوودا و کات و شوێنەکان دا چۆنییەتی بانگەوازی پێغەمبەران هەڵدەبژێریت.

هەشتەم: بە خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەران باشتر لە قورئان تێدەگەیت و وەری دەگریت و کاری پێ دەکەیت، ئەو کات قورئان دەبێتە گەنجینەی دڵ ودەروونت کە مرۆڤ لە قورئان گەیشت، دڵنیا دەبێتەوە لە ژیان و لە سێکتەرەکانی و بەواتای خەمی ڕزق و ڕۆزی نییە و پاشان ترسی لە گومڕا و زاڵمانیش نییە و هەمیشە ئاسوودە و ئارامە و دوورە لە دڵە ڕاوکێ.

نۆیەم: ڕێکخستنەوەی ناو ماڵەکانمان، چاککردنی ناو خێزانەکانمان بە ڕووداو و ژیانی پێغەمبەران، دەبێت باوک منداڵەکانی وەک ئیبراهیم پەروەردە بکات، کە لە دوای خۆی ئیسحاق و یەعقوب بوونە پێغەمبەر، وەکو بنەماڵەی (آل عمران) کە هەوڵیان بۆ ڕزگاری بوو لەژێر دەستی طاغوت و بێ باوەڕانی ڕۆم و فێڵبازی جوولەکە وەکو داوود کە سولەیمانی کردە جێنشینی خۆی...هتد.

دەیەم و کۆتایی: ئامانجم لەم کتێبەدا پەروەردەکردنی خودی تۆیە کە خوێنەریت، جا لە هەر چین و توێژێکی ئەم کتێبە خۆت بە خاوەنی بزانە و لەبەر خاتری خوای پەروەردگار بگەیەنە بەخەڵکی تر، پیاوان بۆ خێزانەکانیان بخوێننەوە یان بە پێچەوانەوە ئافرەتەکان هەوڵبدەن باسی بکەن لە دانیشتن و مەجلیسەکان دا بیگێڕنەوە، بۆ ئەوەی خۆت بەهێزتر بیت لە ڕووی ئینسانییەوە، پاشان سوود بە خەڵکی تر بگەیەنە.

کەواتە دەتوانیت ئامانجی زیاتری لێ هەڵبگۆزیت، بەڵام من بەوەندە کۆتاییم پێهێنا، بۆ ئەوەی تۆی خوێنەر ماندوو نەکەم، جا با هەڵوەستەیەک بکەین و جارێکی تر باسەکە ڕێک بخەینەوە و ئیداری و ڕێکخەر بین و بە سیستەم بین، ئامانجەکان دیاری بکەین.

١. دڵنیایی و یەقین و خاوەن خۆڕاگریمان فێردەکات.

٢. دڵدانەوە و سەبووری ئەداتەوە بۆ دەروونمان.

٣. لاساییکردنەوەی پێغەمبەران و بە پێشەنگ دانانیان.

٤. بەدوای پاداشتەوە بین لە خوای گەورە و چاوەڕێی پاداشت نەبین لە مرۆڤ.

٥. پەند وەرگرتن لە ژیانی پێغەمبەران، بەهێزکردنی ئەزموونی ژیان و کەسایەتیمان.

٦. دامەزراوی لە بیروباوەڕماندا و خۆراگر بین.

٧. فێربوونی چۆنیەتی بانگەواز کردن لە پێغەمبەرانەوە.

٨. باشتر تێگەیشتنمان لە قورئان بەهۆکاری ژیانی پێغەمبەران.

٩. ڕێکخستنەوەی ناو ماڵی خۆمان و کەسووکار و دراوسێ.

١٠. خۆتت بیر نەچێتەوە و کارکردن بە ژیانی پێغەمبەران و ڕەنگدانەوەی لە ژیانی خۆت دا.

هەرچەندە ئامانجی گەورەتر هەیە کە دەبوو باسی بکەم، بەڵام هێشتمەوە کە لە ئەنجامی ئەو ئامانجانە بۆمان دروست بێت، ئەویش گەڕانەوە و هێنانەدی حوکمی خوای پەروەردگارە کە ئامانجی هەموو ئامانجەکانە.

## ڕەوانەوەی تەمومژەکان
## لەسەردەمی وجوودی پێغەمبەران

بوونی پێغەمبەران لەسەر زەویدا حەقیقەتی ڕەهایە، چونکە زنجیری پەیوەندییە لە نێوانی خوای کردگاری بوون و مرۆڤ بەگشتی، هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێداوە، ئەگەر ژیان و وردەکاری ژیانی پێغەمبەران دەچێتە خانەی مێژووەوە، بەڵام پەیامەکەیان هەر لە خانەی عەقیدە و بیروباوەڕدا دەمێنێتەوە، چونکە پەیوەندی بە خوای پەروەردگارەوە هەیە، پەیامەکەیان چۆنیەتی ناسینی خوای موتەعال و داواکاری خوای موتەعالە لە فەرمان و ئەرکی سەرشانی مرۆڤەکان بەرانبەر بە زاتی پەروەردگار و لەهەمانکاتدا بەرانبەر بە مرۆڤ و ژینگەو دەورووبەری.

ئەوانەی کە مێژوونووس و هەروەها پاشماوەی دێرین و نووسراو و دیکۆمێنتە دێرینەکان هەموو باسی پێغەمبەران و وجوودی پێغەمبەرانیان کردووە، نموونەی نووسراوەکەی گلگامێش کە ناسراوە بە داستانی گلگامێش (ملحمة جلجامش) باسی نووح و لافاوەکەی نووحی لە نووسراوەکاندا کردووە، هەروەها لە نووسراوە (هیرۆگلۆفییەکان)ی فیرعەونەکاندا باسی ئادەم و حەوا کراوە وەکو مێژوو یاداشت کراوە.

تەنانەت لای یۆنانییە کۆنەکان و فارسەکان کە لە نووسراوەکانی (مەجووسەکان) وەریان گرتووە ئەوانیش یاداشتی پێغەمبەرانیان کردووە لەسەر نووسراوی بەردو ئێسقان و دیواری ئەشکەوتەکان بەناوی (جیومرث) یان (جیومرس).

مرۆڤ بە سرووشتی حەزی بە خواناسی و بەندایەتی هەیە، خوای گەورە ئەم فیطرەتەی لە ناخی مرۆڤ دا ڕواندووە، هەر بۆ ئەم مەبەستەیە پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووە تا پەیوەندی نێوان مرۆڤ بەخوای موتەعالەوە ڕێکبخات و ناونیشانی ڕاستی خوا بە خەڵکی ڕابگەیەنن، لە لایەکی ترەوە گومانی ئەوە هەیە لەسەر پێغەمبەران بۆچی هەموو پێغەمبەران لە ڕۆژهەڵاتی ناڤینەوە هاتوون و هەموو لەو ناوچانەی زەویدا بڵاوبوونەتەوە کە لە هیندستانەوە دەست پێدەکات تاکو میسر و سوودان، لە نێوانیاندا عێراق و ئێرانی ئێستا و شام بە گشتی.

ڕاستی و دروستی وەڵامی ئەم گومانە لە پرسیارەکەدایە، چونکە ئەوانەی کە ژیانی پێغەمبەران بە ئەفسانە دەزانن، هەڵبەت لە ژیارناس و کۆمەڵناسەکان و مێژووناسان، هەر بەم پرسیارە وەڵامی خۆیان ئەدەنەوە، چونکە لە نێوانی ڕووباری سەیحون و جەیحون لە هیندستان و دیجلە و فورات لە وڵاتانی میزۆپۆتامیا و ڕووباری نیل لە میسر، جێگای دەستپێکی شارستانییەت بووە لەهەموو جیهاندا و خەڵکی لەدەوری ئەو ڕووبارانەدا کۆبونەتەوە.

مێژووی ئەم شارستانییەتانە دەگەڕێتەوە بۆ نزیک هەشت هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، واتا سەرەتای دەستپێکی کۆمەڵگا و فەرمانداری و کشتوکاڵ و پێکەوە ژیان و گۆڕینەوەی پێداویستی مرۆڤەکان و ئاڵوگۆڕ کردنیان، دەگەڕێتەوە بۆ هەشت هەزار ساڵ، ئەم مێژووە تا ڕادەیەک کۆ دەنگی لەسەر دروست بووە هەموو ئەکادیمیا و زانکۆکانی جیهان و دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی زانستی لەبوارەکانی (ئارکۆلۆژیا) شوێنەوارناسیدا هەموو هاوڕان.

هاتنی پێغەمبەرانیش بۆ ئەو ناوچەیە، هەروا هەڕەمەکی نییە، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی مرۆڤی یەکجار زۆر لەو ناوچانەدا و ڕێکخستنی ژیانیان بە ژیار و شارستانییەتەوە.

هەروەها هاتنی مێژووی پێغەمبەرانیش تێپەڕ ناکات لەو مێژووە لە ئادەمەوە تا خاتەم کە محەمەدە ﷺ ، نزیکی هەشت هەزار ساڵ دەکات تا ئەم سەردەمە.

گومانێکی تری ئەوانەی کە لە بواری مێژووی شوێنەوارناسیدا لەسەر پێغەمبەران دایانناوە، بریتییە لەوەی کە پێغەمبەران لەدوای خۆیان شوێنەواریان جێنەهێشتووە و هیچ قەڵا و قولەیەک لەدوایاندا بەجێ نەما.

لەوەڵامدا بۆ ئەم گومانە ئەگەر بهاتایەو پێچەوانەی بەرجەستە بوایە، ئەوا وجوودی پێغەمبەران نەدەبوو، بەڵکو پادشا و مەلیک دەبوون و بەدوای سەروەری ناوو ناوبانگ و مانەوە دەبوون لەم دنیا و ژیانەدا، ئەگەر بەچاوی واقیعیەوە تەماشای پێغەمبەران بکەین، کاری ئەوان گەیاندنی پەیامەکەیان بووە، نەک دروستکردنی شکۆ و سەروەری.

پێغەمبەران وەکو هەموو کەسێکی ئاسایی و سادە ژیاون و جیاوازیان ئەوە بووە کە پەیامیان بۆ هاتووە، یاخود ئەگەر لەدوای خۆیان قەڵا و مۆنۆمێنت و نزرگایان جێ بهێشتایە، ئەوکات گومان لە ڕاستگۆییان دەکرا.

کۆتا گومانی گشتی لەم بەشەدا ئەوەیە بۆچی باسی کەمترین پێغەمبەر کراوە لە کاتێکدا لە ماوەی ئەو هەشت هەزار ساڵە زیاتر لە (٢٥) پێغەمبەر هاتووە، لەکاتێکدا لە ئیسلامدا دان بەوەدا نراوە لەلایەن پێغەمبەر محەمەد ﷺ کە لەسەروو سەد هەزار پێغەمبەر وجوودیان هەبووە، بۆ تەنها (٢٥)یان ئەگەر زیاتر ناگاتە ٤٠ پێغەمبەر کە باس کرابێت و لە قورئان و فەرموودەدا.

لەوەڵامدا دەڵێم؛ گومان لە زۆری پێغەمبەران نییە، بەڵام ژیانی هەموو پێغەمبەران، ژیانی هەر جۆرە لە پیشەوەران وەربگرین دەبینین نزیکە لەیەکەوە، یاخود ژیانی پادشا و مەلیکەکان ئەگەر لێکۆڵینەوە لە ژیانیان بکەین، دەبینین زۆر لەیەکەوە نزیکن و لێکچوون و هاوبەش زۆرە لە نێوانیاندا.

هەروەها ژیانی پێغەمبەران بەگشتی لەیەک دەچن، بانگەواز و دەربەدەری و ناڕەحەتی و ناسۆرە، هەروەها پەروەردەکردنی خەڵکی و بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستییە، هەر بەم هۆکارە خوای گەورە ناوی ٢٤ پێغەمبەری بردووە لە قورئان دا بێجگە پێغەمبەری ئیسلام محەمەد ﷺ واتا بە خودی پێغەمبەرەوە ٢٥ پێغەمبەرن (عليهم الصلاة والسلام).

ئەوانیش بریتین لە: ئادەم، ئیدریس، نووح، هوود، صاڵح، ئیبراهیم، لووط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یوسف، شوعەیب، ئەیووب، ذولکفل، مووسا، هاروون، داوود، سولەیمان، ئیلیاس، ئەلیەسع، یونس، زەکەریا، یەحیا، عیسا و پێغەمبەری نازدار محەمەد (سەلامی خوای گەورە لە هەموویان بێت)، جا لەناو ئەم پێغەمبەرانەدا ٥ پێغەمبەری خاوەن عەزم و هێزی تێدا هەڵبژاردوە، خوای موتەعال ناوی ناون بە (اولو العزم) کە خاوەن پایەو پێگەی تایبەتن ئەوانیش (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا و محەمەد)ن، لەناو هەموویاندا پێشەواو ئیمامێکی هەڵبژاردووە بەناوی محەمەد ﷺ کە ئیمامی پێغەمبەرانە.

باسی ژیانی ئەم ٢٥ پێغەمبەرە هەموو پێکهاتەی ژیان و ژیار و یەکتاپەرستی و بانگەواز و جیهاد...هتد تێداکۆبۆتەوە، ئەوەندەش بۆ خەڵکی خاوەن بیروهۆش و عەقڵ بەسە بیریان لێ بکاتەوە و لەژیانیان بکۆڵێتەوە.

ئەم چەند گومانە سەرەتاییەم لێرەدا یاداشت کرد مانای وا نییە، ئیتر گومان نەماوە، بەڵکو ئەم گومانانە گشتییەو بۆ چوونە ناو باس سەرەتا پێویستمان پێی دەبێت، بەڵام یەشتا گومان گەلێکی زۆر ماون کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە جوانی و زانستیانە هەمووی دەڕەوێنینەوە بە پشتیوانی خوای گەورە.

لێرەدا دەبێت ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە باس لە چیرۆک و حیکایەت ناکەین، وەکو خەڵکانێکی تر ناویان ناوە چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران، بەڵکو ئەمانە ڕووداوی ڕاستەقینەن و ڕوویانداوە، دوورە لە چیرۆک و خەیاڵ و فەنتازیا، لە ڕاستیدا نەشیاوترین وشە کە بەکار دەهێنرێت وشەی (چیرۆکە) بۆ پێغەمبەران.

ئەوەی کە باسی دەکەین وەحییە، هیچ کات وەحیی خوای ناچێتە خانەی چیرۆک، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ۝٥٢﴾ الشورى

واتە: بەم شێوازە ئێمە ڕوحێکمان بە وەحی بۆ ناردوویت، کە مەبەست پێی قورئانە، بە ڕۆح ناوی بردووە لەبەر ئەوەی چۆن لاشە بەبێ ڕۆح ناژی مرۆڤیش بەبێ قورئان ناژی، ئەی محەمەد ﷺ تۆ پێش ئەوەی قورئانت بۆ بێت نەتدەزانی قورئان چیەو چی تیادایە و ئیمان هێنان و درێژەی ئیمان چیە، بەڵام ئەو قورئانە پیرۆزەمان کردووە بە نوورو ڕووناکییەك کە هیدایەتی هەر کەسێکی پێ ئەدەین لە بەندەکانی خۆمان کە ویستمان لێ بێت و شایەنی هیدایەت بێ، تۆ ئەی محەمەد ﷺ هیدایەتی خەڵکی ئەدەیت و ڕێنماییان ئەکەیت بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە.

کەواتە ژیانی پێغەمبەران چیرۆک نییە، بەڵکو ڕووداو و مێژووە، لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە بیروباوەڕە.

## تایبەتمەندی پێغەمبەران

پێغەمبەران تایبەتمەندییان زۆرە، سەرەتا هیچکام لە پێغەمبەران نەیانزانیوە دەبنە پێغەمبەر، واتا پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردنی خوای موتەعالە، لەم بارەوە خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ۝٧٥﴾ الحج

واتە: خوای گەورە خۆی لە فریشتەکان نێردراوی خۆی هەڵئەبژێرێ وەکو (جبرائیل و ئیسرافیل و میکائیل و ملك الموت) لەناو خەڵکیشدا پێغەمبەران هەڵئەبژێرێ، مەلائیکەتەکان وەکو نێردراو بۆ لای پێغەمبەران بۆ ئەنجام دانی فەرمانی خوا، لەناو مرۆڤیشدا کەسانێك هەڵئەبژرێ ئەیانکات بە پێغەمبەری خۆی، بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر بیسەرو بینایە.

هەروەها لە جێگەیەکی تردا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿۞إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ۝٣٣﴾ آل عمران

واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە ئادەم و نووح و ئالی ئیبراهیم خۆی و نەوەکانی کە پێغەمبەر بوونە و ئالی عیمران کە عیسا لەوان بووە ئەمانەی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو جیهاندا.

کەواتە هیچ پێغەمبەرێک نەبووە بەهۆکاری زیرەکی یاخود فەیلەسوفی و بیرمەندی بووبێتە پێغەمبەر، بەڵکو هەڵبژاردەی خوایی تەنها بەس بووە و کە خاوەنی عەقڵی سەلیم بێت.

* پێغەمبەران پێش هاتنیان هەموویان خەڵکی خاوەن ڕەوشتی بەرز و ئاکاری پڕ جوانی بەهای بەنرخ بوون، چونکە لەکاتی هاتنی وەحیدا بۆیان خاوەنی تاوانی زەق و گەورە نەبوون تا لەناو خەڵکیدا تانەیان لێ بدرێت و بەچاویاندا بدرێتەوە، بگرە لەو پەڕی ڕەوشتجوانی و ئاکاری بەرزدا بوون، بەڵام مرۆڤ بوون وەکو هەموو مرۆڤەکانی تری دنیا ژیاون، بگرە هەڵەی بچووکی مرۆییان هەبووە، بەڵام وەکو ئەوەی مەی خۆر و زاڵم و داوێن پیس..هتد لەم جۆرە تاوانانە حاشا پێغەمبەران بەگشتی پاک و بێگەرد بوون، ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ۝٧٣﴾ الأنبياء

واتە: کردیانمان بە پێشەواو بە ڕێنمایی ئێمە هیدایەتی خەڵکیان ئەدا، خەڵکی شوێنیان ئەکەوتن، وەحیشمان بۆ ناردن کە کردەوەی چاك ئەنجام بدەن. نوێژەکانتان بکەن و زەکاتی ماڵتان بدەن بەڕاستی ئەوان بە جوانترین شێواز عیبادەتی ئێمەیان ئەکرد.

* پێغەمبەران (الرسل) یان هەواڵهێنەران (الأنبياء) خاوەنی پەیام بوون و مەرج بووە لەسەریانە پەیامەکە بگەیەنن کە ناسینی خواو ڕۆژی قیامەت و شەریعەتە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ۝٢﴾ النحل

واتە: خوای گەورە فریشتەکان دائەبەزێنێ بە وەحی بە فەرمانی خوای گەورە، وەحیەکەی ناوناوە بە ڕوح لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێی ئەژێت چۆن بە ڕوح ئەژی، بۆ هەر کەسێك لە بەندەکانی خۆی کە ویستی لێ بێت وەحی دائەبەزێنێ و ئەیکات بە پێغەمبەر. کە ئاگاداری خەڵکەکە بکەنەوە کە هیچ پەرستاوێك بەحەق نییە شایەنی پەرستن بێت ئیلا زاتی پیرۆزی الله نەبێ، کەواتە ئێوە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و خۆتان بپارێزن لەوەی کە شەریك بۆ خوا دانێن چوونکە ڕووبەڕووی سزای خوای گەورە ئەبنەوە.

هەروەها مافی ئەوەشیان نەبوو کە بیروباوەڕی تری تێکەڵ بکەن و واجب بووە لەسەریان کە وەکو خۆی بیگەیەنن بەبێ گۆڕانکاری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَـٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَـٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾﴾ یونس

واتە: کاتێك ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەردا ئەخوێندرێتەوە، ئەوانەی کە بە ئومێدی گەیشتن نین بە ئێمەو باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نییە ئەڵێن: ئەی محەمەد ﷺ قورئانێکی تر بێنە جگە لەمە یاخود بیگۆڕە ئەی محەمەد ﷺ پێیان بڵێ: من بۆم نییە لەلایەن خۆمەوە دەستکاری بکەم و بیگۆڕم من تەنها شوێن ئەو وەحییە ئەکەوم کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆم دێت، من ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بکەم لە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە ئەترسێم کە ڕۆژی قیامەتە.

* ناکرێت و ناشێت نازناوی تر لەخۆیان بنێن وەکو چاکەخواز یان بیرمەند و فەیلەسوف...هتد. ناشکرێت و جائیز نییە خەڵکی بەم ناوانەوە بانگیان بکات، ڕێز بۆ پێغەمبەران ئەوەیە کە بە پێغەمبەر ناوبرێن.

* جیاوازی نێوان پێغەمبەر و هەواڵهێنەر (الرسول و النبي)

الرسول واتا خاوەنی پەیامە و دەبێت پەیامەکەی بگەیەنێت و پەیامەکە تایبەتمەندە بۆ خۆی کە پیویستە بیگەیەنێت، بەڵام هەواڵهێنەر خۆی خاوەن پەیام نییە، بەڵام دەشێت پەیامی پێغەمبەری تر بگەیەنێت وەکو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل کە هەموو فەرمانیان بە (تەورات) و (صوحف) کردووە کە بۆ مووسا هاتووە، سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

* پێغەمبەران بۆ هەموو گەلانێك ڕۆشتوون، خوای گەورە لە پەیامی خۆی ئاگاداری کردونەتەوە، پەیامی خوایی ڕوونە و هەر هەمان پەیامە لە ئادەمەوە تا خاتەم محەمەد

صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ کەواتە خوای گەورە دادپەروەرە و حوججەی لەسەر هەموو مرۆڤەکان کردووە و دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ﴿٣٦﴾﴾ النحل

واتە: بەدڵنیایی ئێمە بۆ هەموو کۆمەڵە خەڵك و نەتەوەیەك لە شوێنێك ژیابێتن پێغەمبەرێکمان بۆ ناردوون، ئیشی هەموو پێغەمبەران ئەوە بووە بە خەڵکەکەیان وتووە: ئەی خەڵکینە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن، خۆتان دووربخەنەوە لە تاغوتەکان وەکو شەیتان و فاڵچییەکان و ساحیرەکان و بت و هەموو کەسێك کە بپەرسترێت و ڕازی بێت بەو پەرستنە، یان بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ پەرستنی خۆی، یان باوەڕی بە حوکمی خوای گەورە نەبێت و بە کۆنەپەرستی بزانێت، یان حوکمێکی تر بەباشتر بزانێت لە حوکمی خوا، یان یەکسانی بکات بە حوکمی خوا، هەیان بووە خوای گەورە هیدایەتی داون لەسەر دەستی پێغەمبەران، هەیشیان بووە گومڕایی بەسەریاندا جێبەجێ بووە لەبەر ئەوەی شایەنی هیدایەت نەبوونە، دەی ئێوە بەسەر زەویدا بگەڕێن و پەندو ئامۆژگاری وەرگرن و بزانن سەرەنجامی ئوممەتانی پێشتر کە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە وەکو عادو ثەموودو ئەوانە چیان بەسەرهاتووەو سەرەنجامیان چۆن بووەو خوای گەورە چۆن لەناوی بردوون.

* پێغەمبەران و هەواڵهێنەران لە پلەو پایەدا جیاوازن، بەڵام بۆ مرۆڤ نییە موجادەلە و شەڕ لەسەر ئەوە بکات کە کامەیان باشە، ئەوە فەزڵ و ئەجر و پاداشت و پلەیە کە خوای گەورە داونیەتێ وەکو خۆی باسی دەکەین وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ لە پرسیارێکی ئەبو زەڕی غیفاری ئاراستەی پێغەمبەری کرد وتی: ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ٣٢٥ پێغەمبەرن، پاشان ئەبو زەڕ پرسی ئەی ژمارەی هەواڵهێنەران چەندە؟ فەرمووی ١٢٠ هەزار بە گشتی و ٣١٥ لەناویاندا پیغەمبەرە[٢].

هەروەها لە پلەوپایەی پێغەمبەران دەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴿٨٣﴾وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ كُلًّا هَدَيْنَا وَنوحا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ﴿٨٤﴾وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴿٨٥﴾وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلوطا وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴿٨٦﴾﴾ الأنعام

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢]- عن أبي ذر قال: قلت: يَا رَسُولَ اللهِ كَمِ الْأَنْبِيَاءُ؟ قَالَ: مِائَةُ أَلْفٍ وَعِشْرُونَ أَلْفًا. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ كَمِ الرُّسُلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: ثَلَاثُ مِائَةٍ وَ خمسة عَشَرَ رُسُلًا أخرجه الإمام أحمد في مسنده.

واتە: ئەمەی كە باسمان كرد حوججەو بەڵگەیەك بوو كە دامان بە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بەسەر قەومەكەیداو بۆی باس كردن، ویستمان لێ بێت پلەی هەر كەسێك بەرز ئەكەینەوە بەهیدایەت بۆ ڕێگای حەق هەروەكو پلەی ئیبراهیممان عَلَيْهِ السَّلَامُ بەرز كردەوە پەروەردگاری تۆ بەڕاستی زۆر كاربەجێ و زانایە(٨٣) ئیسحاقمان بە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بەخشی كاتێك كە خۆی و سارەی خێزانی بێئومێد بوون لە منداڵ، لە نەوەی ئیسحاقیش یەعقووبیشمان پێی بەخشی و كوڕەزای خۆی بینی هیدایەتی هەموویانمان دا پێش ئەمانیش هیدایەتی نووحمان دا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە نەوەی ئەمانیش داود، سولەیمان، ئەیووب، یوسف، مووسا و هاروون هیدایەتی هەمووومان داون و هەموومان كردوون بە پێغەمبەر بەم شێوازە پاداشتی چاكەكاران ئەدەینەوە(٨٤) هیدایەتی زەكەریاو یەحیاو عیسا و ئیلیاسمان داوەو كردوومانن بە پێغەمبەر، ئەمانە هەموویان لە پیاوچاكان و پێغەمبەرانی خوای گەورە بوونە(٨٥) ئیسماعیل و یەسەع، كە وتراوە: خضرە، یاخود وتراوە: هاوەڵی ئیلیاس بووە، یونس و لووطیش ئەمانە هەموومان هیدایەت داون و كردوومانن بە پێغەمبەر هەموو ئەم پێغەمبەرانە فەزڵمان داون بەسەر هەموو جیهاندا بەوەی ئەمانە وەحیان بۆ هاتووەو كراون بە پێغەمبەرو لە خەڵكی باشترن(٨٦)

پاشان جیاوازی كردنی ئێمە بۆ پێغەمبەران دەچێتە بوارێكی ترسناک و كوفرەوە، خوای گەورە بۆمان باس دەكات كە بەنی ئیسرائیل چۆن بوون لەگەڵ پیغەمبەراندا و دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا(١٥٠)﴾ النساء

واتە: بە دڵنیایی ئەو كەسانەی كە كوفر ئەكەن بەخوای گەورەو بە پێغەمبەرانی ئەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرانی بەوەی كە ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەخوا هەیە، بەڵام ئیمان بە پێغەمبەران ناهێنن، یاخود ئەڵێن: ئێمە ئیمان بەهەندێ لە پێغەمبەران دێنین وە كوفریش بە هەندێكیان ئەكەین، كە جوولەكە ئیمانیان بە مووسا هێنابوو كوفریان بە عیسا و محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كرد، گاورەكان كە ئیمانیان بە عیسا هێنا و كوفریان بە محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كرد ئەیانەوێ بە حیسابی خۆیان ڕێگاو دینێكی مام ناوەند بگرنە بەر.

بەڵام پلەوپایەی پێغەمبەران جۆراوجۆرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۘ مِّنۡهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُۖ وَرَفَعَ بَعۡضَهُمۡ دَرَجَٰتٖۚ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ

بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخۡتَلَفُواْ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ وَمِنۡهُم مَّن كَفَرَۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقۡتَتَلُواْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴿٢٥٣﴾ البقرة

واتە: ئەم پێغەمبەرانە فەزڵی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا لە پلەو پایەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ باشترینیانە، هەیانە قسەی لەگەڵ خوای گەورە کردووە وەکو مووسا عَلَيْهِ السَّلَام، پلەوپایەی هەندێکیانی بەرز کردۆتەوە کۆمەڵێك بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو موعجیزەمان بە عیسای کوڕی مەریەم عَلَيْهِ السَّلَام بەخشی، پشتیوانیمان کرد بە (روح القدس) بە جبریل، یان بەو ڕۆحەی کە خوای گەورە کردیە بەری، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە (ویستی کەونی قەدەری نەك ویستی شەرعی) خەڵکی لە دوای ناردنی پێغەمبەران کوشتاری یەکتریان نەئەکرد، بەتایبەتی لەدوای ئەوەی کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هات، بەڵام ئیختیلاف و جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، هەیان بوو ئیمانی هێنا بە پێغەمبەران و شوێن پێغەمبەران کەوت و هەیان بوو کوفری کرد، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە ئەوان کوشتاری یەکتریان نەئەکرد، بەڵام خوای گەورە ویستی لە هەر شتێك بێ ئەیکات کەس نییە ویستی خوای گەورە بگەڕێنێتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴿٥٥﴾﴾ الإسراء

واتە: پەروەردگارت زاناترە بە حاڵی ئەو کەسانەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن کامیان گوێڕایەڵ و کامیان سەرپێچیکارن بە دڵنیایی ئێمە فەزڵی هەندێك پێغەمبەرانمان داوە بەسەر هەندێکی تریان وەکو ئیبراهیم و مووسا و عیسا و نووح و محەمەد (سەلامی خوا لە هەموویان بێت) کە گەورەترینیان پێغەمبەری خوایە ﷺ زەبووریشمان بە داوود پێغەمبەر بەخشیووە.

بەڵام ئیماندار دەبێت ئیمانی بەم شێوەیە بێت و جیاوازی نەکات لە نێوانیاندا، خوای گەورە فێرمان دەکات لە قورئان دا کە بەم شێوەیە بین، ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴿٢٨٥﴾﴾ البقرة

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەڕداران ئیمانیان بەو قورئانە پیرۆزە هێناوە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیان دابەزیوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە لەم قورئانەدا هەیە، هەموویان ئیمانیان بە خوای گەورەو مەلائیکەتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکانی و پێغەمبەرانی هێناوە، ئێمە

جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران و ئیمان بە هەر هەموویان ئەهێنین باوەڕداران و پێغەمبەرەکان فەرموویان: ئەی پەروەردگار ئێمە بەگوێ فەرمایشتی تۆمان بیست و لێی تێگەیشتین و گوێڕایەڵی تۆمان کردو وەڵاممان دایتەوە، ئەی پەروەردگار تۆش لێمان خۆشبە و مەصیرو سەرەنجام و گەڕانەوەی ئێمە هەر بۆ لای تۆیە.

هەروەها خوای گەورە ناوی نەبردوون، زاتی پاکی دەفەرموێت: ﴿وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء

واتە: چەندەها پێغەمبەری تر کە لە پێشتردا یان لە پێش ئەم سوورەتەدا چیرۆك و بەسەرهاتیمان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە ئەی محەمەد ﷺ لە قورئانی پیرۆزدا چەندەها پێغەمبەرانی تریش هەیە کە چیرۆك و بەسەرهاتیمان بۆ تۆ نەگێڕاوەتەوە، خوای گەورە قسەی لەگەڵ مووسادا کردووە بە دڵنیایی و بە حەقیقەت کە ئەمەیش ڕێزێکە بۆ مووسا هەر بۆیە پێی وتراوە: (کلیم الله).

لەناویشیاندا پێنج پێغەمبەر ئولول عەزم هەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَاغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾ الأحقاف

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئارام بگرە هەروەکو چۆن پێغەمبەرانی (ئولول عەزم) کە خاوەنی عەزیمەت و دامەزراوی بوونە ئارامیان گرتووە لەبەرامبەر ئازاری قەومەکانیان، پەلەی سزا مەکە سزایان بۆ داببەزێت ڕۆژێك کە بە چاوی خۆیان سزای خوای گەورە دەبینن کە لە دونیا هەڕەشەیان لێ کرا بوو پێی، وەك ئەوە وایە کە لە دونیادا نەژیابێتن تەنها چەند کاتێك لە ڕۆژدا ئەم قورئانەی کە تۆ ئامۆژگاریانی پێ ئەکەی ڕاگەیاندنێکە تا عوزریان نەمێنێ لە قیامەت هیچ کەسێك لەناو ناچێ تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوونە.

* هەموو پێغەمبەران پێشەنگن و دەبێت چاویان لێ بکرێت و لاسایی بکرێنەوە، ئەمەش فەرمانی خوای گەورەیە دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰؤُلَاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۖ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ ۗ قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَالَمِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنعام

واتە: ئا ئەمانەن کە کتاب و حوکم و بڕیارو زانیاری و پێغەمبەرایەتی و پەیامان پێ بەخشیوون، ئەگەر کافرانی قورەیشیش کوفر بکەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئیمان ئەبەخشین بە کەسانێکی تر کە موهاجیرو ئەنصارو صەحابەی پێغەمبەری خوان ﷺ و شوێنکەوتوانیانن تا ڕۆژی قیامەت کە ئەمانە کافر نین و ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە﴿٨٩﴾ ئا ئەمانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون، ئەی محەمەد ﷺ تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە، شوێنی پێغەمبەرانی پێش خۆت بکەوە، ئەی محەمەد ﷺ پێیان بڵێ: من داوای ئەجرو پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەم لەسەر ئیمان هێنان و هیدایەت، بەڵکو ئەم قورئانە تەنها یادخستنەوەیەکە بۆ هەموو جیهان بە قورئان یادتان ئەخەمەوە﴿٩٠﴾

یاخود دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ الأحزاب

واتە: بەدڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە پێشەوایەتییەکی زۆر جوان هەیەو پێشەواو مامۆستای چاکی ئێوەیەو چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ کەن و شوێنی بکەون، بەڵام بۆ کەسێك کە بە ئومێدی خواو ڕۆژی دوایی و پاداشتی خوای گەورە هەبێت، زیکری خوای گەورەی زۆر کردبێت.

هەروەها لەکاتی نوێژدا داوا دەکەین لەخوای پەروەردگار کە بمانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و ڕێگای پێغەمبەران و چاکەخوازان و شەهیدان و ڕاستگۆیان، ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴿٦﴾صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴿٧﴾﴾ الفاتحة

واتە: ئەی پەروەردگار هیدایەتمان بدەو ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست و بەردەوامیمان پێ ببەخشە لەسەر ڕێگای ڕاست کە ئیسلامە﴿٦﴾ ڕێگای ئەو کەسانەی کەوا نیعمەتی خۆت ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان کە ئەوانە باشترین هاوەڵن، نەك ڕێگای ئەو کەسانەی کەوا غەزەبت لێیان گرتووەو لێیان تووڕەبووی کە جوولەکەن، چوونکە زانیاریان هەبوو بەڵام کاریان پێ ناکرد، نە ڕێگای ئەو کەسانەی کەوا وێڵ و گومڕاو سەرگەردان بوون کە گاورەکانن، چوونکە بە نەزانی و بێ زانیاری کاریان دەکرد واتە: خوایە ئەم دوعایانەمان قەبووڵ بکە﴿٧﴾

* هەموو پێغەمبەران خاوەنی موعجیزە بوون، کە سەرکەشان و لوتبەرزەکانی پێ سەرشۆڕ و زەلیل کردووە، ئەویش کارێکە خوای پەروەردگار ئەنجامی ئەدات لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی، کە لە توانای مرۆڤ سەردەمی خۆیدا نەبووە.

* لەسەر هەموو ئیماندارێک واجبە کە بڕوای بە پێغەمبەران هەبێت، خۆ بە پێچەوانەوە ئەگەر بڕوای بە یەکێک لە پێغەمبەران نەبوو کە ناویان هاتووە لە قورئان و سوننەت دا، ئەوە بە دڵنیاییەوە کافر دەبێت و لەخانەی مێژوو دەردەچێت، دەبێتە بیروباوەڕ و عەقیدە، خوای موتەعال فەرمانمان پێدەکات کە بڕوایان پێبهێنین و دەفەرموێت: ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾﴾ البقرة

واتە: موسڵمانان ئێوە بڵێن: ئێمە ئیمانمان بەخوای گەورە و بەو قورئانە پیرۆزە هێناوە کە بۆ ئێمە دابەزیوە. ئیمانمان بەو کتێبە ئاسمانیانە هێناوە کە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباطیش دابەزیوە ئەسباط، نەوەکانی یەعقووب بوونە ئەوەی کە بۆ مووسا و عیسا دابەزیوە و هەرچی کتابێ هەیە بۆ پێغەمبەران هاتبێ لەلایەن پەروەردگار ئێمەی موسڵمان باوەڕمان بە هەر هەمووی هەیە جیاوازی ناخەینە نێوان هەندێکیان باوەڕ بەهەندێکی بێنین و باوەڕمان بە هەندێکی نەبێ بەڵکو باوەڕمان بە هەر هەمووی هەیە، ئێمە موسڵمانین خۆمان تەسلیمی خوای گەورە کردووە.

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾ البقرة

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەڕداران ئیمانیان بەو قورئانە پیرۆزە هێناوە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیان دابەزیوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە لەم قورئانەدا هەیە هەموویان ئیمانیان بە خوای گەورەو مەلائیکەتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکانی و پێغەمبەرانی هێناوە، ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران و ئیمان بە هەر هەموویان ئەهێنین باوەڕداران و پێغەمبەرەکان فەرموویان: ئەی پەروەردگار ئێمە بەگوێ فەرمایشتی تۆمان بیست و لێی تێگەیشتین و گوێڕایەڵی تۆمان کردو وەڵامان دایتەوە، ئەی پەروەردگار تۆش لێمان خۆشبە و مەصیرو سەرەنجام و گەڕانەوەی ئێمە هەر بۆ لای تۆیە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ١٥٠ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ١٥١﴾ النساء

واتە: بە دڵنیایی ئەو کەسانەی کە کوفر ئەکەن بەخوای گەورەو بە پێغەمبەرانی ئەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرانی بەوەی کە ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەخوا هەیە، بەڵام ئیمان بە پێغەمبەران ناهێنن، یاخود ئەڵێن: ئێمە ئیمان بەهەندێ لە پێغەمبەران دێنین و کوفریش بە هەندێکیان ئەکەین، کە جوولەکە ئیمانیان بە مووسا هێنابوو کوفریان بە عیسا و محەمەد کرد ﷺ گاورەکان کە ئیمانیان بە عیسا هێنا و کوفریان بە محەمەد کرد ﷺ ئەیانەوێ بە حیسابی خۆیان ڕێگاو دینێکی مام ناوەند بگرنە بەر(١٥٠) بەڕاستی کافری ڕاستەقینە و تەواو ئەمانەن بۆ کافرانیش لەناو ئاگری دۆزەخ سزایەکمان داناوە کە ڕیسواو سەرشۆڕیان ئەکەین(١٥١)

* هەموو پێغەمبەران مەعصومن واتا پارێزراون لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، ئەو پاراستنەش بریتییە لە تاوانی گەورە، وەکو زینا، مەی خواردنەوە، ڕیبا، نەپاراستنی حەقی دایک و باوک، وازهێنان لە بەندایەتی، پێغەمبەران دووربوون لەهەموو هەڵەو تاوانێک، بەڵام هەڵەی بچووکیان هەبووە وەکو هەڵەی لە پێش دانان، یاخود لەبیرچوونەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لە مرۆڤ بوون دەرنەچن.

## مەنهەجی گێڕانەوەی سەردی مێژوویی
## لەم مەملەکەتی پێغەمبەرانەدا

پێویستە ئەوە بۆ خوێنەر ئاشکرا بکەین لێرەدا بە گێڕانەوەی سەردی مێژوویی باسەکە دەست پێناکەم، بەڵکو بە شێوازی(ئوسلوبی) یەقینی و دڵنیابوون دەست پێدەکەم بە داڕشتنەوەی باسەکان، چونکە ڕاستی ئەوەیە من ناتوانم لە خۆمەوە بنووسم، بەڵکو ئەمە وەحیە و ئەوەندەی بواری منی تێدا دەست دەکەوێت، چەند باسێکی گرنگ بکەم، ئەویش لە ئەنجامی خوێندنەوەمە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا لە دەقەکانەوە وەردەگرم، بریتییە لە خوێندنەوەیەکی واقعی و گونجاندنی لەگەڵ واقعی سەردەم دا، ناساندنی بوارەکانی کۆمەڵناسی بە مەنهەجی ئبن خەلدوون، پاشان باسی دید و تیڕوانینی ئابووری لەسەربنەمای ئابووری ئیسلامی و فیقهی ئیسلامی بەتایبەت مالیک بن نەبی، پاشان هەموو ئوسلوبە ئەکادیمییە شوێنەوارناسی و خوێندنەوە بۆ مێژوو بە قوتابخانە جیاوازەکانییەوە، هەوڵئەدەم

برۆمە ناو وردەکاری، بەڵام ئەو وردەکاریانەی کە پێداویستی ژیانی مرۆڤایەتین، بۆ من گرنگ نییە لەم باسەدا بزانم (هوودهوود) نێر بووە یاخود مێ، گرنگ نییە بزانم ژنەکەی نووح یان لووط ناوی چی بووە، بەڵام بزانم دایکی حەزرەتی مووسا ناوی چییە، چونکە میحوەری سەرەکییە و ڕۆڵی گرنگی هەیە لە ڕووداوەکاندا، هەروەها خوشکی حەزرەتی مووسا...هتد. بەم شێوەیە گرنگە حیوار و گفتوگۆکان وەکو قورئان باسی کردووە بنووسمەوە، ئەگەرچی دووبارەش بێت، بەڵام هەرجارەو گۆشەنیگایەک لە ڕووداوەکاندا نیشان ئەدات.

لەم نووسینەوەی مێژووەدا پێنج کەرەستەی سەرەکی بۆ من لەم کتێبەدا کاردەکات.

یەکەم: قورئان

دووەم: سوننەت (واتا فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ )

سێیەم: مێژوو

چوارەم: واقع و ڕەوشەکەی ئەو دەمە و گونجاندنی لەگەڵ واقعی ئێستادا

پێنجەم: ئەقڵ کە بێجگە بواری ئیمان کە ئەقڵ پێوەر نییە، بەڵام هەموو باسە مێژووییەکان بە گوێرەی ئەقڵی مرۆڤەکان و ئەکادیمییە باوەڕپێکراوەکان بە دڵنیاییەوە تاوتێ دەکەین، لەبەر ئەوەی لەم باسەدا وەکو وتم چیرۆک نییە سەرەتا و ناوەند و کۆتایی پێبهێنم، نا؛ بەڵکو لێکۆڵینەوەیە، ئەمانەتی قیامەتی و زانستی دەبێت ون نەکات و لە بواری خورافە و ئەفسانە و فەنتازیا کارناکات، پاشان کار ناکات لەسەر بواری فیقهی و ڕاڤەی تەفسیری قورئان و شیکاری فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ . ئەوەی کە لە بواری عەقیدە بە دڵنیاییەوە لەئاستیدا ملمان تاڵە موویەکە، ئەوەش کە مێژووە بە ئارەزووی خۆمان و فراوانی ئەقڵمان و فراوانی ئەقڵی زانایان ئەسپی خۆمانی تێدا تاو ئەدەین، سوپاسی ئەو کەسەش دەکەین ڕەخنەی جدیمان لێ دەگرێت و هەڵەکانمان بۆ ڕاست دەکاتەوە، بەڵام ڕەخنە واتای ئەوەیە کە کەموکوڕی ئەدۆزێتەوە، زۆر خۆشحاڵمان دەکەیت، بەڵام ڕاستەکە چییە؟

کە ڕاستییەکەت پێوتین و هەڵەکەت ڕاستکردەوە ئەوکات بە ئەژنۆوە وەک ماکوان لە خزمەتا دادەنیشیم، بەڵام قسەی بێ بەڵگە لای بواری ئەکادیمیا و زانستی هیچ ئەرزش(نرخی)ی نییە.

مەنهەجمان لەم لێکۆڵینەوەیە ئەو مەنهەجە قورئانیەیە کە فێرمان دەکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴿١١١﴾﴾ یوسف

واتە: بە دڵنیایی چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتانیان، یان ئەم چیرۆکەی یوسف لەگەڵ براکانی و باوکیدا پەندو عیبرەت و ئامۆژگاری تیایە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵێکی سەلیمن و تێدەگەن ئەم قورئانە قسەیەك نییە هەڵبەسترابێ، بەڵکو بەڕاستدانەری کتێبە ئاسمانییەکانی پێش خۆیەتی لە تەورات و ئینجیل و زەبوور درێژەی هەموو شتێکی تیایەو شەریعەتی بەدرێژی تیادا باسکراوە هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ کەسانێك کە ئیمان بێنن.

## مێژوو چییە؟ بەروار و ڕۆژمێر چین؟

مێژوو دروست نابێت ئەگەر بەروار نەبێت، بەرواریش دروست نابێت ئەگەر ڕۆژمێر نەبێت، بەڵگەش بۆ ئەم وتەیەم ئەوەیە:

کاتێک عومەری کوڕی خەتاب نامەی دەنووسی بۆ ئەمیرەکانی سوپا و جێگاکان بەرواری لەسەر نەبوو، بۆیە ئەبو زەڕی غیفاری نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتاب کە نامەکانت زۆرن بۆیە جیاناکرێنەوە، بۆیە بەرواری لەسەر بنووسە، ئەویش بیری کردەوە کە بەروارێکی ئیسلامی دابمەزرێنێت، کە بریتییە لە ڕۆژمێری هیجری قەمەری.

هەرچەندە پێشتر پێشنیاری بەرواری فارسی و ڕۆمی بۆ کرا، بەڵام بە هیچییان ڕازی نەبوو، تا ڕازی بوو بە ساڵی هیجری و مانگی عەرەبی کە پێشتر هەبوون سەرەتای مانگی هیجری دامەزرا لەمانگی موحەرەم، بەم شێوەیە ڕۆژمێر و بەروار لە ئیسلامدا دامەزرا.

لە ڕابردوودا فارس لەنێوانی پادشاکانی و شاهەکانی بەرواری دامەزراندبوو، ڕۆمیش لەسەر بنەمای پادشا و قەیسەرەکانی.

لەلای فارسەکان ساڵ ٨ مانگ بوو، لای ڕۆمەکان ساڵ ٩ مانگ بوو، تا گریگۆری لەساڵی ١٥٠٠ ز. دا سێ مانگی تری زیاد کرد بەناوی مارس و یەنایەر و ئۆگستین، بەمەش ناونرا بە ڕۆژمێری گریگۆری کە هەموو جیهان لە ئێستادا بەکاری دەهێنن، بێجگە چەند وڵاتێکی تر کە خاوەنی ڕۆژمێری تایبەتی خۆیەتی وەکو سعودیە، خاوەنی ڕۆژمێری هیجری قەمەریە، ئێران و

ئەفغانستان خاوەنی ڕۆژمێری هیجری شەمسییە، چین خاوەنی ڕۆژمێری تایبەت بەخۆیەتی، هەندێک وڵاتی تر لە ئاسیا و ئەفەریقا...هتد.

پێش ئیسلام عەرەب ساڵەکانی بەڕووداو ناو دەنا، وەکو ساڵی فیل، پێشتر جوولەکە لە ئاگرەکەی ئیبراهیمەوە یان لە سەربڕینی ئیسحاق، لای جوولەکە پێیان وایە کە ئیسحاق بووە کە ویستراوە سەر ببڕدرێت نەک ئیسماعیل سەلامی خوا لەهەموویان بێت. لای فیرعەنەکان ساڵێک بە سێ مانگ پێوەرکراوە، ئەویش لە کەنعانی و هۆزی فەڵەسطینی و قوبروسییەکان وەرگیراوە، لەناو ئەکەد و ئاشوور و بابلییەکانیشدا ساڵ بە خۆشی پێوەر کراوە، ڕۆژ بە ساڵێک لێکدراوەتەوە، زۆرێک لە گۆڕە کۆنەکانی ئاشووری و بابلی و ئەکەدییەکان لەسەری نووسراوە کە ٨ هەزار ساڵ ژیاوە یان ٢ هەزار ساڵ ژیاوە، هەر هەمان سەردەم نووسراوە ١ ڕۆژ ژیاوە، زۆرێک لە پادشاکانیان نووسراوە کە ٢ هەزار یاخود ٣ هەزار ساڵ ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژمێریان مانگ بووە، یاخود هەفتە بووە، یاخود دەڵێن هەفتە و مانگ و ساڵ بەدوای یەکدا بە ڕۆژ پێوەر کراوە، بەهەرحاڵ کەواتە کاتێک باسی بەروار دەکەین یان مێژوو دەبێت بزانین واقعی ئەو سەردەمە چۆن بووە، وەکو نووسراوی سەر فیرعەنییەکان کە ژمارەی ژیانیان دیار نییە، نەک لەبەر ئەوەی نەیان زانیوە، بەڵکو چاوەڕوانی گەڕانەوەی بوون. هەموو ئەم باسانەی کە کردمان لە شوێنەوار ناسییەوە بەدەست هاتووە، بەڵام ئێستا ئامێری پێشکەوتوو هەیە، کە بە (ڕادیۆی کاربۆنی) ناسراوە، بگرە جۆری بەهێزتر هەیە لە ڕادیۆی کاربۆنی کە زۆر بە دەقیقی ڕاستی ژیانی ملیارەها ساڵ دەست نیشان دەکات.

ئەمەش مانای وانییە کە شتێکی خەیاڵی بێت، بەڵکو خوای پەروەردگار ڕۆژمێری جیاوازی داناوە، کە خودی زاتی پاکی پێداویستی بە ڕۆژمێر و کات و جێگاو شوێن نییە و پاک و بێگەردە و هەموو موحتاجی ئەوین و دەستەنەخواری خوای پەروەردگارین، زۆرجار بۆ تێگەیشتنی ئێمە ڕوونی کردۆتەوە بۆ نمونە ڕۆژمێری قیامەت بۆی ڕوون کردوینەتەوە، دەفەرموێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴿٤٧﴾﴾ الحج

واتە: ئەی محەمەد ﷺ کافران پەلە ئەکەن لە داوای سزا کردن وەکو گاڵتە پێکردن و سووکایەتی پێ کردن دەڵێن: بۆ خوایەکەت سزامان نادات، پێیان ڕابگەیەنە کە خوای گەورە بەڵێنی خۆی ئەباتە سەرو جێبەجێی ئەکات، بەڵام با کاتی دیاریکراوی خۆی بێت، ڕۆژێکیش لەلای خوای گەورە کە ڕۆژی قیامەتە وەکو هەزار ساڵی دونیا بەسەر کافران تێ ئەپەڕێ لە سەختی و سەغڵەتی و ناخۆشیدا.

کەواتە ڕۆژێک لە قیامەت دا هەزار ساڵە بە گوێرەی ساڵی هیجری قەمەری، بەڵام ڕوون نییە لامان ئەو ٦ ڕۆژەی کە زەوی و ئاسمانی دروست کردووە، بەکام پێوەری ڕۆژمێرییە. ئەوە هەر زاتی الله دەیزانێت، چونکە مادام باسی گەردوونە بە ڕۆژمێری سەر زەوی لێکدەدرێتەوە، چونکە شەو و ڕۆژ لە ئەستێرەیەک بۆ ئەستێرەیەکی تر جیاوازە، بۆ نموونە لە زوهرە نزیک ترە لە ڕۆژ، زەوی ماوەی شەو و ڕۆژی ٢٤ کاتژمێرە بەڵام ئۆرانۆس، نیپتۆن و پلۆتۆ شەوو ڕۆژێک بە شەش مانگ و ساڵ دروست نابێت، ئەی خودی پێوەری گەردوون بەچی بپێوین کە تەنها کۆمەڵەی خۆر لەچاو گەلەئەستێرەی ئاسمانی یەکەم یاخود (درب التبانە) بە خاڵێک هەژمار دەکرێت خودی گەلەئەستێرەی درب التبانە کە بریتییە لە زیاد لە ١٥٠ ملیۆن کۆمەڵەی خۆر لەچاو گەلەئەستێرەکانی تری فراوانی ئاسمان دا بە خاڵێکی زۆر بچووک هەژمار دەکرێت، کەواتە ڕۆژمێری ٦ ڕۆژی خوای پەروەردگار بە ڕۆژی دنیای لێکبدرێتەوە، خوای گەورە خۆی دەزانێت و داواکارم کە تیمەی نەزان زیاتر شارەزا بکات بە شەریعەت و مەخلوقاتی، کەواتە زۆر گرنگە بزانین بەروار و مێژوو و ڕۆژمێر، پەیوەندی هەیە بەسەر سەردەم، کات و شوێن و شارستانییەتەکان، خوای موتەعال کەباسی یارانی ئەشکەوتمان بۆ دەکات بە دوو بەروار بۆی باس کردووین، چونکە بەرواری یەکەم عەرەبی ناوچەکە بەکاریان هێناوە، بەرواری دووەم ڕۆم بەکاری هێناوە، ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعٗا ﴿٢٥﴾﴾ الكهف

واتە: لە ناو ئەشکەوتەکەیاندا سێ سەد ساڵی هەتاوی مانەوە نۆ ساڵیش زیاتر.

کەواتە کاتێک باسی ژیانی پێغەمبەران دەکەین وەکو حەزرەتی نووح سەلامی خوای لێ بێت، دەبێت بزانین بەکام ڕۆژمێر پێوەرکراوە جێگاو شوێن و سەردەمەکەی بزانین، یاخود ئیبراهیم سەلامی خوا لەهەموویان بێت، مرۆڤ ئێستا لە کامڵی دایە، خوای گەورەش یاسای خۆی تێکنادات و دەفەرموێت: ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٦٢﴾﴾ الأحزاب

واتە: ئەمە سوننەتی خوای گەورە بووە لە ئوممەتانی پێشتریشدا بەم شێوەیان لێکراوە، هەرگیز نابینی سوننەتی خوای گەورە گۆڕانی بەسەردا بێت و بەردەوامە.

﴿ٱسۡتِكۡبَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾ فاطر

واتە: بەهۆی خۆبەگەورەزانییان لەسەر زەویدا بەهۆی فێڵ و خەڵەتاندن و کردەوەی خراپیان کە ڕێگری خەڵکیان دەکرد لە موسڵمان بوون، بەڵام فڕوفێڵ و نەخشەو پیلانی خراپ تووشی

هیچ کەسێك نابێت تەنها خاوەنەکەی خۆی نەبێ، ئایا چاوەڕێی چ شتێك ئەکەن تەنها سوننەتی خوای گەورە نەبێ لەناو ئوممەتانی پێشتر کە ئەوانی چۆن لەناوبرد ئێوەش لەناو ئەبات نابینی سوننەتی خوای گەورە هیچ گۆڕانێکی بەسەردابێ بەهەمان شێوە گۆڕان بەسەر سوننەتی خوای گەورە نایات چۆن ئوممەتانی پێشتری لەناو بردووە ئێوەش لەناو ئەبات.﴿٤٣﴾

خوای پەروەردگار یاسای خۆی تێک نادات ژیانی ئادەم و ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمە وەکو یەک[٣] DNA لە ئێستادا باشتر و کامڵتر کار دەکات تا سەردەمی کۆن. بگرە مرۆڤی ئەمڕۆ ناگاتە ١٢٠ ساڵ خۆ ئەگەر بگات زۆر ماندوو شەکەتە و لاشەی لاواز دەبێت، ئەمە باسی مرۆڤی ئاسایی دەکەین لە موعجیزە بەدەر، ئەگەر بڵێین نووح تەنها لەسەرو هەزار ساڵ ژیاوە دەبێت بەڵگەمان هەبێت کە نووح بە موعجیزە ئەوەندە ژیاوە، یان ئەگەر مرۆڤ لەسەردەمی نووح دا لەسەرو هەزار ساڵەوە ژیاوە بەگشتی، شتی وا لە زانست دا نییە و زانست بەو پێشکەوتنەی خۆیەوە دان بە شتی وادا نانێت، هەرچەندە ئێمە قورئان ناخەینە ژێر پێوەری زانستی، بەڵکو ڕێک پێچەوانەکەی لای ئێمە بەجێیە، ئێمەش وەکو ئەهلی ئیسلام و سوننەت مەبەستمە، بەڵام خۆ زۆر ئاساییە بڵێیت ژیانی حەزرەتی نووح بە ڕۆژمێری سەردەمی خۆی هەژمار کراوە، کەواتە ١٠٠٪ وەکو خوای موتەعال دەفەرمووێت: ٩٥٠ ساڵ تەنها پێغەمبەرایەتی کردووە، بەڵام ئەم ٩٥٠ ساڵە بەکام ڕۆژمێر؟

لێرەدا من نەهاتووم پەنا بەخوا ٩٥٠ ساڵەکە بەدرۆ بخەمەوە، پەنا بەخوا جا ئەوە زۆرێک لە خەڵکی جۆری تەفسیرەکەی ئامادە کردووە، بەڵکو لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ٩٥٠ ساڵە دەکەین

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣] مێژوو بە پێی فەلسەفەی قورئان کۆمەڵێ یاسای نەگۆڕی وەکو یاسا سروشتی یەکان دووبارە دەبنەوە، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ﴿... فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾ فاطر.

﴿سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾﴾ الإسراء.

لە زانایانی خۆرئاوا (شبنگلر) پێ ی وایە، شارستانییەکان و کۆمەڵگاکان و دەوڵەتەکان وەکو مرۆڤ لە دایک بوون و گەشەو مردنیان هەیە، شارستانی خۆرئاواش بەرەو ئاوا بوونە.

( تدهور الحضارة الغربية)ی ئەو بخوێنیەوە، بە درێژی باسی ئەو یاسایانەی کردووە.

لای زانا خۆرئاوایی یەکانی مێژوو وەکو ( گیبون) پێی وایە: مێژوو بەشێکی زۆری تۆماری تاوانی مرۆڤەکان و نەگبەتی و گەوجی یەکانی ئەوانە.

تا ( نیچە/مردنی مێژوو ڕادەگەیەنێ، بەڵام مێژوونوسانی گەورەی وەکو (تویتی و ڤیگۆرد شبرنگلر و ئبن خلدون) پێیان وایە: مێژوو کۆمەڵێ پرەنسیپ و یاسایە لە دایک بوون و تەمەن و مردنیان هەیە.

قورئانی پیرۆزیش مێژوو بە یاسایەکی نەگۆڕو دووبارە دادەنێ، بۆیە ئەو ڕووداوە ڕاستەقینانەی گەلان و شارستانییەکانی ڕابردبوو بۆ پێغەمبەر (ص) دەگێڕێتەوە.

( طبيعة المعرفة التأريخية وفلسفة التأريخ/ د. محسن محمد حسين. سەیر بکە.

واتا تەئویلی دەکەین بۆ تەحقیق کە بەروارەکە پێش سۆمەر و ئەکەد و ئاشووریش بووە، پێوەرەکە کە دەشێت ٧١ ساڵ بکات بەڕۆژمێری ئێستا، کە لە باسەکانی داهاتوودا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، بە پشتیوانی خوا (والله أعلم).

## گەڕانەوە بۆ بنەڕەت

خوای پەروەردگار هەموو مەخلوقاتی بەدیهێناوە هەرچی لەم بوونەدا هەیە خوای موتەعال خاوەنیەتی، هەر زاتی بەرزی ئیدارەی ئەم گەردوونە دەکات بە ورد و درشتی چواردەوری هەموو مەخلوقاتیەوە، یان باشتر بڵێم دەسەڵاتی ڕەها و تەواوی بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکانیدا هەیە، هیچی لێ ناشارێتەوە، ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە ناخەوێت و وەنەوزیش نادات و ماندوو نابێت، پێویستی بە پشوودانیش نییە، خاوەنی سیفەتی کامڵ و تەواو ڕەهایە لە هیچ ناچێت و هیچیش لەزاتی بەرزی ناچێت، نامرێت و هەتا هەتایە و پێش زاتی بەرزی هیچ نەبووە، دوای زاتی بەرزیشی بێجگە مەخلوقات کە هەمووی لەناو ناچێت هیچ خوایەکی تر نییە، زاتی پیرۆزی سەرەتا و کۆتاییە.

(خالق) واتا هەموو شتێک زاتی بەرزی بەدیهێناوە، (فاطر) بۆ داهێنانە، کاتی پێویستی بەهیچ شتێک نییە (الباريء) لە نەبوون هەموو مەخلوقات دێنێتە بوون پێویستی بە هیچ کەرەستە و ماوەیەک نییە، (بديع)ە بە جوانترین شێوە و باشترین شێوە دروست کراوەکانی دیزاین دەکات...هتد.

کە وتمان خوای گەورە لەهیچ ناچێت (ليس كمثله شيء) کەواتە ئەستەمە بە ملیۆنەها قەڵەم و لاپەڕە لەوەسفیدا باس بکەین، ئەوکات ناگاتە دڵۆپێک لە وەسف پێناسەی بەرزی، ناتوانین درکی پێبکەین باشترین وتە ئەوەیە لە پاشاندا بڵێین (سبحان الله، سبحان ربي العظيم، سبحان الله العظيم).

دوای دروستکراوەکانی بۆ پەیوەندی کردن بە مرۆڤەوە، خوای گەورە کۆمەڵێک مەخلوقاتی بەدیهێناوە بەناوی فریشتە (الملائكة)، هەڵبەت یەکێک لە کاری ئەم مەخلوقە پەیوەندی کردنە بە مرۆڤەوە، دەنا خوای گەورە ئیدارەی ئەم گەردوونەی پێ ڕێک خستوون. فریشتە بەشدارە لەگەڵ مەخلوقاتدا بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کەونە بەفەرمانی خوای گەورە، خوای موتەعال نە پێداویستی بە فریشتەیە نە بەهیچ مەخلوقێکی تر، بەڵام بەشداری پێکردنی فریشتە لە بەندایەتی و ئیدارەی گەردوون لە ڕەحم و خۆشەویستی خوای پەروەردگارە بۆ فریشتەکان، جۆری کارکردنیان زۆرە لە خودی بەندایەتییەوە بیگرە تا ئاگادار بوون بەسەر شاخ، ئاو، خاک،

باران، هەوا، مادده و وزە، گەردوون بەگشتی، تەنانەت بەشدارن لە ڕەحمی دایکدا بۆ چاودێری کردنی ساواکەی تا دێتە دنیاوە.

لەنێوان ئەم فریشتانە سەرەکی ترین فریشتە کە جوبرەئیلە پەیوەندی هەیە بەو مرۆڤانەی لەسەر ئەم زەوییەدا کە دەبنە پێغەمبەر، کەواتە پەیوەندی ئەم گەردوونە هەمووی بەیەکەوە بەستراوەتەوە، زۆر بەوردی و دەقیقی. هەڵبەت پەیوەندی جوبرەئیل بە خودی پێغەمبەرانەوە هەیە بەگشتی، دەشێت پەیوەندی تری فریشتە بە مرۆڤەوە هەبێت، بێجگە کاری پێغەمبەران وەکو نموونەی هاروت و ماروت، یان پەیوەندی فریشتەی شاخ بە پێغەمبەری خواوە، یاخود هاوکاری کردنیان لە جیهاد و جەنگ دا بەفەرمانی خوای پەروەردگار...هتد.

ئەوەی کە گرنگە بۆ ئێمە لەم کتێبەدا پەیوەندی خوای پەروەردگارە لە ڕێگای فریشتەی وەحییەوە جوبرەئیل عَلَيْهِ السَّلَام، کە گەورەی هەموو فریشتەکانە لە ڕێگای جوبرەئیلەوە وەحی دادەبەزێت بۆ پێغەمبەران.

جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوەش بکەین کە بێجگە لە حەزرەتی جوبرەئیل خوای گەورە پەیوەندی تری هەیە بە پێغەمبەرانەوە، لە ڕێگای خەو، یاخود ڕاستەوخۆ زاتی بەرزی ئەنجامی ئەدات، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە ڕێگای ئەم فریشتە بەڕێزەوە وەحی بۆ پێغەمبەران دادەبەزێت. لە قورئاندا باسی زۆرێک لە فریشتەکان کراوە، هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە کە لە (نوور) دروستبوون، شێوەو لاشەی تایبەت بەخۆیان هەیە و بەهیچ شێوەیەک سەرپێچی ناکەن و گوێرایەڵی تەواوی پەروەردگارن.

خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ①﴾ فاطر

واتە: حەمدو سەناو ستایش بۆ خوای گەورە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە، ئەو خوایەی کە فریشتەکانی کردووە بە نێردراوی خۆی بۆ لای پێغەمبەران وەکو جبرائیل، کە فریشتەکان هەیانە دوو باڵی هەیە، هەیە سێ باڵی هەیە و هەیە چوار باڵی هەیە. هەیە زیاتری هەیە وەکو جبریل کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دوو جار لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی بینیوێتی شەش سەد باڵی هەبووە، هەر باڵێکی ئاسۆی ئاسمانی داپۆشیوە لە گەورەییدا خوای گەورە ویستی لە هەر شتێك بێت بۆ دروستکراوانی زیادی ئەکات وەکو باڵی فریشتەکان، یاخود جوانی ڕووخسار، یان زانست و عەقڵ، یان دەنگ خۆشی، یان هەرشتێکی تر کە ویستی لێ بێت زیادی ئەکات بە دڵنیایی خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ۝٥﴾ الشورى

واتە: نزیکە ئاسمانەکان لەت و شەق ئەبن لە ترسی گەورەیی خوادا، یاخود لە قورسی و زۆری ئەو مەلائیکەتانەی کە لەسەرین، یاخود لەبەر وتەی موشریکان کە ئەڵێن: خوای گەورە منداڵی بۆ خۆی بڕیار داوە فریشتەکانیش تەسبیحات و عیبادەت و زیکرو حەمدو سەناو ستایشی خوای گەورە ئەکەن، داوای لێخۆشبوون ئەکەن بۆ تاوانی ئەو خەڵکەی کە لەسەر زەویە لە باوەڕداران و دەڵێن: خوایە لە باوەڕداران خۆشبە بزانن کە بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بە بەزەییە.

﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ۝٩٨﴾ البقرة

واتە: هەر کەسێك دوژمنی خوای گەورەو مەلائیکەتەکانی و پێغەمبەرانی و جبریل و میکائیل بێت، ئەوە بە دڵنیایی ئەو کەسانە کافرن و خوای گەورەش دوژمنی کافرانە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۝٦﴾ التحريم

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنییەکەی خەڵکی و بەردە، یاخود بەردەکە مەبەست بتەکانە، خەڵکیش ئەچێتە ئاگری دۆزەخ و ئەو بتانەیش کە ئێوە ئەتانپەرستن و کردبوتانن بە خوای خۆتان هەمووی لە دۆزەخدا ئەبن بە سوتەمەنی بۆ ئێوەو ئاگری جەهەننەمی پێ خۆش ئەکرێ و ئێوەی پێ ئەسوتێنرێ، جا خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەو ئاگرە بەوەی پەروەردەیەکی جوانیان بکەن و فێرە ئایینیان بکەن و فەرمانیان پێ بکەن بە چاکەو ڕێگرییان بکەن لە خراپە بۆ ئەوەی نەچنە ناو ئەو ئاگرەوە، ئەو ئاگری دۆزەخە هەندێك مەلائیکەتی لەسەرە کە (زەبانیە)ن خوای گەورە تایبەت بۆ ئەوە دروستی کردوون کەسانێکی زۆر دڵ ڕەقن و زۆر سەخت و توندو ترسناکن هیچ ڕەحم و بەزەییەك لە دڵیان دا نییە بەرامبەر بە دۆزەخییەکان، هەر فەرمانێك کە خوای گەورە پێیان بکات ئەوان سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ناکەن، هەر فەرمانێکیان پێ بکرێ لەلایەن خوای گەورە ئەوان لە کاتی خۆیدا ڕاستەوخۆ جێبەجێی ئەکەن.

کەواتە پوختەی باس ئەوەیە کە پەیوەندی خوای پەروەدگار ڕێکخراوە بە مرۆڤەوە لە ڕێگای فریشتەوە بۆ گەیاندنی پەیامەکانی خواو ئاراستەکردنی بۆ هەموو مرۆڤەکان ئەویش ناسراوە بە (وەحی) بۆ پێغەمبەران وەحی دەشێت بۆ کەسانی تریش بێت، بەڵام وەحی کە لە ڕێگای

فریشتەوە دابەزی بۆ پێغەمبەران، ئەوە وەحی پێغەمبەرایەتییە، بەڵام وەحی ئاراستەی بۆ مەریەم دایکی عیسا سەلامی خوایان لێ بێت یاخود دایکی مووسا، ئەم جۆرە وەحییە پەیوەندی نییە بەکاری پێغەمبەرانەوە، بەڵام ئاراستەی خوای پەروەردگارە، دەشێت خوای گەورە وەحی بۆ گیانداران و باڵندەی بەگشتی بنێرێت، وەکو خوای موتەعال وەحی ئاراستەی هەنگ کرد، کەواتە وەحییەکان پۆلێن دەکرێن بە وەحی ئاراستەکان بۆ پیاوچاک و ئافرەتانی خواناس، هەروەها بۆ گیاندارەکان کە خزمەتی مرۆڤ دەکەن بە بەرهەمەکانیان.

## پەیامی پەیامبەران

پێغەمبەران و هەواڵهێنەران بەگشتی خاوەنی پەیامن دەشێت لە دوو توێی کتێبێکدا ئاراستەی بکرێت، یاخود وەکو هەواڵهێنەرەکان کارو پەیامی پێش خۆیان بکەن.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا بە کتێبە سەرەکییەکان باسی کردووە و دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ۝١٩٦﴾ الشعراء

واتە: ئەم قورئانە لە کتێبەکانی سەرەتایشەوە وەکو تەورات و ئینجیل باسکراوەو موژدەی پێدراوە، یاخود لە زەبووری داوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ باسکراوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە فەرموودەیەکدا لە ئیمامی طەبەری لە مێژووەکەیدا باسی کردووە، هەروەها ئیمامی ئەلسیوطی لە کتێبی (الدر المنثور)دا هێناویەتی دەڵێن: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: خوای پەروەردگار ١٠٤ (صحوفی) ناردووە، ٥٠ صحوفیان بۆ (شیث)، پاشان بۆ حەزرەتی ئیدریس ٣٠ صحوف هاتووە، هەروەها بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ١٠ صحوف هاتووە، هەروەها پێش تەورات ١٠ صحوف بۆ حەزرەتی مووسا دابەزیووە، دوای ئەوە زەبور و تەورات و ئینجیل و قورئان دابەزیووە[٤].

---

[٤]ورد في حديث رواه ابن حبان في صحيحه(١٥٣/١)، وكذا رواه ابن مَرْدَوَيْه وعبد بن حُمَيد وابن عساكر كما ذكر ذلك السيوطي في الدر المنثور(٣٤١/٦)، والقرطبي في التفسير، كلهم عن أبي ذر الغفاري رضي الله عنه أنه سأل النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كم كتابا أنزل الله؟ قال: **مائة كتاب، وأربعة كتب، أنزل على آدم عشر صحائف، وأنزل على شيث خمسون صحيفة، وأنزل على إدريس ثلاثون صحيفة، وأنزل على إبراهيم عشر صحائف، وأنزل التوراة والإنجيل والزبور والفرقان. هەروەها لە قەولێکی دیکەدا هاتووە** مائة كتاب، وأربعة كتب، أنزل على شيث خمسون صحيفة، وأنزل على أخنوخ (إدريس) ثلاثون صحيفة، وأنزل على إبراهيم عشر صحائف، وأنزل على موسى قبل التوراة عشر صحائف، وأنزل التوراة والإنجيل والزبور والفرقان.

ئەگەر تەماشای ژمارەکان بکەین بۆ پێغەمبەرانی سەرەتایی کتێبی زۆر هاتوون، چونکە مرۆڤایەتی پێویستی زیاتری بە فێر بوون هەبووە.

دەشێت هەریەک لەو صحوفانە لە جێگای خۆیدا ناوی تایبەتی هەبێت، چونکە زۆربەی کتێبەکان لە هیندستان دابەزیووە، لە داهاتوودا لە ژیانی پێغەمبەرانی ناوبراودا بەوردی باسیان دەکەین، هەروەها صحوف بە واتای کتێب دێت، چونکە بە قورئانیش دەوترێت (مصحف)، هەموو ئەم پەیامانە لە ڕێگای وەحییەوە دێت بۆ پێغەمبەران، بنەمای پەیامەکە بریتییە لە یەکتاپەرستی و گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە و پاشان ناردنی ڕێساو یاسا بۆ مرۆڤەکان، ناونانیان بە خەلیفە لەسەر زەوی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و چۆنیەتی پێکەوە ژیان و چۆنیەتی دروستبوونی زمان و نووسین و... هتد. کە هەموو لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە ئەنجام دراوە بە ئاراستەی وەحی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

## یاسای گەردوون (کن فیکون)

خوای پەروەردگار ئەم گەردوونەی بە یاساو سیستەم ڕێکخستووە، زانایانی کیمیا و فیزیا بەسوود وەرگرتن لە یاسا سرووشتییەکان کە مەبەست لە سروشت واتا ژینگەیە بەگشتی کە خوای موتەعال خالقیەتی، هەموو یاساکانی سروشت جێگیرن و گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت، چۆنیەتی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردگار، جا ئەم یاسایانە لەچاوتروکانێکدا وەکو خوای موتەعال دەفەرموێت: لە (کن فیکون)دا خەلقی کردوون، یاخود بە گوێرەی پەرەسەندن هاتوون سەبارەت بە یاساکانەوە دەشێت وابێت، چونکە هەموو کات (کن فیکون) مەرج نییە بە واتای ببە و خێرا بێت، هەروەکو شێخ ولئیسلام دەفەرموێت: ئەم باسە گفتوگۆی زۆری مەنطقییەکان و فەیلەسوفە ئیسلامییەکانی لەسەر دروست بووە، لە ٧ جێگادا خوای گەورە باسی کن فیکون-

ی کردووە، شێخ ولئیسلام دەڵێت: بەکارهێنانی وشەی (کن فیکون)[٥] کە هاتووە لە قورئان دا لە چوارچێوەی قەزاو قەدەر و ئیرادەی خوای گەورەیە لە کەون دا[٦].

گومان لەوەدا نییە کە وشەی (کون فیکون)ی خوای موتەعال دەست بەجێ دەبێت، بەڵام خەلقی سەرەتاییە، بۆ نموونە کاتێک خوای گەورە باسی دروستبوونی عیسا دەکات و دەفەرموێت: وتمان ببە و بوو، ئەوەش مانای خەلق و ئیرادەی خوایە کە لە سەرەتادا بێ هیچ دروستی کرد و خستییە ناو سکی خاتوو مەریەم، بەڵام وەکو هەموو ساوایەک بە ٩ مانگی لەدایک بوو، کەواتە وشەی (کن فیکون) خوای گەورە لە خەلقی سەرەتایی و پاشان موعجیزات دا بەکار دەهێنرێت وەکو وشترەکەی صالح، یاخود ساردبوونەوە و سەلامەتی ئاگرەکەی ئیبراهیم.

بۆ ئەم مەبەستە خوای گەورە هەرچی بوێت دەیکات، بەڵام مانای وانییە ئەم گەردوون و ژیان و مرۆڤ و زیندەوەرانەی لە (کن فیکون) دا دروست کردبێت، بەڵکو بەگوێرەی پەرەسەندنی ئاراستەکراوی خوایی بەدیهاتوون([٧])، لە سەرەتادا (کن فیکون) دەشێت خوای موتەعال بەکاری هێنابێت، پاشان خوای گەورە یاسای گەردوون تێک نادات دەفەرموێت: ﴿...فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ۝﴾ فاطر.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥] لە زانستی گەردوونی و بایۆلۆژیدا، گەردوون و ژیان لە هیکرا لە نەبوونی ڕەهاوە دروست بوون، بەڵام پەیتا پەیتا گەشەیان کرد.

وشەی ( الکون- cosmic) لە وشەی ( کان) هاتووە: ( کن فیکون).

ئالان گوس ( ١٩٧٩) دەری خست گەردوون لە نەبوون پەیدا بووە، بە تێکڕایەک عەقڵ قبوڵی ناکات، لە ماوەی کەمتر لە تریلۆن چرکەیەک گەردوون دەست بە گەشە دەکات و فراوان دەبێ، بە بڕی ژمارە (١٠) کە (٧٨) سفری لە پێشەوە بێت.

( عن هذا الکون الفسیح) نیل دیغراس تایسون/ل: ١٣٨.

(٦) استعمالات التي وردت فيها هذه المادة إنما في سياق القضاء والإرادة الله الكونية/ مجموعة الفتاوى في بحث كن فيكون

(٧) بەڵام لە قورئاندا گەردوون بە (٦) ڕۆژ یان قۆناغ بووە، چونکە ( الأيام) هەم ڕۆژ و هەم قۆناغ دەبەخشێت،

زانای ئەمەریکی ( دوان.ت. کیش) دەڵێ: زانایانی پەرەسەندن پێیان وایە ژیان پەیتا پەیتا لەیەک خانەوە پەرەی سەندووە، ئەو خانەش لە ماددەی نائۆرگانی دروست بووە،

بەڵام یارانی تیۆری دروست بوون ( نظرية الخلق) بڕوایان وایە: ئێمەو تەواوی شێوەکانی ژیان لە ڕێگای فەرمانی کردگارەوە پەیدا بوون.

ئەوەیە مانای ( کن فیکون) لە زانستدا، بەڵام بە قۆناغ گەشەیان کردووە: (وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا) هل تعرضت لغسيل الدماغ/ دوان.ت. کیش/ ت. اورخان محمد علی/ل: ٢٤.

واتە:...نابینی سوننەتی خوای گەورە هیچ گۆڕانێکی بەسەردابێت، بەهەمان شێوە گۆڕان بەسەر سوننەتی خوای گەورە نایەت، چۆن ئوممەتانی پێشتری لەناو بردووە ئێوەش لەناو ئەبات.

تەنانەت خوای پەروەردگار مرۆڤی بە قۆناغ دروست کردووە *لەباسی حەزرەتی ئادەم زیاتر* ڕوونی دەکەینەوە.

نەگۆڕانی یاساکانی خوای پەروەردگار لە ڕەحم و کەرەمی خۆیەتی خۆ ئەگەر گۆڕانکاری بەسەردا بهاتایە ئەوا ژیان جێگیر نەدەبوو، زوو ئەم گەردوونە لەناو دەچوو.

خوای پەروەردگار لە بەدیهێنەری هەر بەدیهێنراوێکی دروستی کردووە و پاشان ئاراستە و چاودێری کردوە بۆ مانەوەی خۆی بەهۆکاری یاساکانی گەردوون بەگشتی، ﴿...لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف...

واتە:...ئایا دروست کردن و فەرمان دەرکردن هەر بۆ خوای گەورە نییە؟ واتە: چۆن لە دروست کردندا کەس شەریکی خوا نییە لە فەرمان دەرکردن و ئەحکامی شەریعەو یاسادانانیشدا نابێت کەس شەریکی خوای گەورە بێ، الله کە پەروەردگاری هەموو جیهانە خێرو بەرەکەتی یەکجار زۆرو فراوانە.

# مەملەكەتی دووەم:
# پەروەردگار بوونەوەری چۆن دروست كرد؟

ئەم باسە بەشی زۆری دەچێتە خانەی ئیمان و بیروباوەڕەوە، بەشێكی توانای قسەكردن و تەفسیر كردنیمان نییە، بەڵكو وەكو ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی بڕوامان پێیەتی لە ئیماندا جێگیربوو إن شاء الله.

وەكو باسی عەرش و پاشان كورسی و قەڵەم و ئەو ئاوەی كە عەرشی لەسەرە یاخود بەهەشت و دۆزەخ ...هتد.

پێش ئەوەی باسەكان بەناونیشان و مانشێت لە مەملەكەتی دووەم دا بكەینەوە پێمان باشە ئەوە بە خوێنەری بەڕێز بڵێین ڕۆچوون لەم باسانەدا هیچ ئامانجێك نادات بەدەستەوە، بێجگە لەوەی كە خاوەنەكەی تووشی وەسوەسە و دڵەڕاوكێ دەكات یان بەرەو گومڕایی دەبات، چونكە هیچ مەخلوقێك زانیاری تەواوی لەسەر نییە، تەنها مەگەر ئەوەی خوای پەروەردگار بۆی باسكردبێتین، بێجگە سوودی ئیمانی كە دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت ١٠٠٪، بەڵام وەكو شتی تر هیچی لەسەر دانامەزرێت بۆ مرۆڤایەتی، تەنها لەبواری پەنهانی دا دەمێنێتەوە و غەیبییە.

زانایانی مێژووی ئەم ئیسلامە سەردی باسەكانیان هێناوە بەم شێوەیە، منیش وەكو ئەوەی زانایان ڕێكیان خستووە دایدەنێمەوە، بەڵام بەهەندێك شیكارییەوە، ئەوەی كەلە باسی غەیبی و ئیمانی دەردەچێت، بەجیاوازتر لە زانایانی پێشینی ئەم ئیسلامە دەینووسمەوە و زیاتر پشت بە زانایانی سەردەم دەبەستم لە بواری زانستی كۆسمۆلۆجی و جیۆلۆجی و بایۆلۆجی (گەردوون ناسی، زەوی ناسی و زیندەوەرناسی).

## چوار مەخلوقی گەورەی پەنهانی
## ئاو، عەرش، كورسی، قەڵەم

وەكو پێشتر ئاماژەمان پێدا قسەكردن لەسەری ئەنجامی نییە، چونكە من بەش بە حاڵی خۆم لەدوای خوێندنەوەی زۆرم بۆ ئەم بەدواداچوونە و ئەو چوار مەخلوقە نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك، لەبەر ئەوەی بەڵگەی تایبەتە قورئانی و فەرموودەكانی لەسەر دەهێنمەوە، هەروەكو سەردی زانایانی پێشینمان. هەڵبەت پێشین بەواتای سەلەف نا، بەڵكو وەكو ئیبنو

کەثیر، ئیبن قەیم، ئیبنو تەیمییە، ئیبن حەجەر و جەلالەئاییینی ئەلسیوطی، بەگشتی زانایانی سەردەمەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی.

خوای پەروەردگار لەو بارەی ئاو و عەرشەوە لە سورەتی هوود کۆی کردونەتەوە بە شێوازێکی بیروباوەڕی ئیمان و یەکتاپەرستی و باوەڕبوون بە ڕۆژی قیامەت کە عەزەمەت و گەورەیی دەسەڵاتی زاتی بەرزی تێدا نیشان دەدات و دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٧﴾ هود

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، عەرشی خوای گەورە لەسەر ئاو بوو، تا تاقیتان بکاتەوە بزانێ کامتان باشترین کردەوە ئەکەن، کە باشترین کردەوە ئەوەیە کە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت و بیدعە نەبێت، ئیخلاص و دڵسۆزی تیابێ و نیەتت پاك بێت بۆ خواو بۆ ڕیات نەبێت، ئەگەر پێیان بڵێیت ئێوە لە پاش مردن بەدڵنیایی زیندوو ئەکرێنەوەو لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت، بە دڵنیایی کافران و بێباوەڕان ئەڵێن: ئەمە تەنها سیحرو جادوویەکی ئاشکرایە.

زانایان زۆربەیان ڕایان وایە کە خوای گەورە یەکەم جار قەڵەمی دروست کردووە، هەندێکی تر دەفەرموون ئاوی دروست کردووە، بەهەرحاڵ فەرمووده ڕاست و سەحیحەکان لێرەدا یاداشت دەکەین لەوبارەوە پێغەمبەر دەفەرمووێت: یەکەم مەخلوقی خوا قەڵەمە، پاشان پێی فەرموو بنووسە ئیتر لەو کاتەوە کەوتە نووسینی هەموو کائینات تا ڕۆژی قیامەت[٨].

هەندێک لە زانایان دەڵێن ئاو لە پێشدا دروست بووە، یەکەم مەخلوق ئاوە خوای گەورە پێش عەرشیش دروستی کردووە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە ئیبن عەباس و ئیبن مەسعود لە پێغەمبەری خواوە ڕێوایەتیان کردووە و دەفەرموێت:

---

[٨] إنَّ أولَ ما خلق اللهُ القلمُ، فقال لهُ: اكتبْ، قال: ربِّ وماذا أكتبُ؟ قال: اكتُبْ مقاديرَ كلِّ شيءٍ حتى تقومَ الساعةُ/ صحيح/ أخرجه أبو داود (٤٧٠٠)، الترمذي (٣٣١٩)، وأحمد (٢٢٧٠٥)

عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، خوای گەورە هیچی دروست نەکردووە پێش ئاو[9]، بەڵام فەرموودەکە بەرزکراوەتەوە بۆ پێغەمبەر (مەرفوعە)[10].

بۆ ساغکردنەوەی ئەم دوو باسە بوخاری بۆمان ساغ دەکاتەوە و دەفەرموێت: لە عیمرانی کوڕی حصین کە خەڵکی وڵاتی یەمەن هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتیان: هاتووین بۆ ئەوەی فێری دین بین، لێت دەپرسین کە یەکەم دروست کراو چییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زاتی خوا هەبووە پێش زاتی ئەو هیچ شتێک نەبووە، عەرشی لەسەر ئاو بووە و پاشان لەسەری نوسیووە لەسەر هەموو شتێک لەم بوونەدا، پاشان گەردوونی دروست کردووە[11].

کەواتە دەتوانین بڵێین سەرەتا ئاو پاشان عەرش دوای ئەو قەڵەم و کورسی، خۆ ئەگەر لەسەر ئەم چوار مەخلوقە بڕۆین کامیان پێش کامیانە، هیچ سوودێک بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت و تەنها کات بەفیڕۆ دانە.

## شیکاری بۆ چوار مەخلوقەکە

خوای گەورە ئەم گەردوونە و مەخلوقاتی بە جوانترین سیستەم ڕێک خستووە، هەموو بۆ زانینی مرۆڤ و پەی پێ بردنیەتی لە جوان ڕێکخستن و باشترین شێوەی دیزاینی گەردوون و مەخلوقات بەگشتی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(9) عەرشی خوا گەردوونی مەزنە. کە کورسی و حەوت ئاسمانی لەناودایە: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ﴾ المؤمنون. ﴿... وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ...﴾ البقرة.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: (وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ)هود ٧. مەبەست لە بوونی عەرشی خوای لە سەر ئاو چییە؟

ستیڤن هۆوکینگ دەڵێ: ( مادده قۆناغی سەرەتایی دروست بوون لە گەردووندا لە قۆناغی سمتریدا زۆر لەشلەی ئاو چووە، واتە: لە هەموو لایەکەوە شلەیەکی سمتری بووە و یەک بووە نەک وەکو کریستاڵی بەفرکە بو نییە یان جیاوازە) الكون في قشرة جوز/ ستيف هوكينگ/ل: ١٢٨.

(10) روى إسماعيل السدي، عن مرة الطيب عن ابن مسعود، و عن أبي مالك وأبي صالح عن ابن عباس، وعن مرة عن ناس من أصحاب النبي، في قوله: ثم استوى إلى السماء. قال: إن الله تعالى كان عرشه على الماء، ولم يخلق شيئا قبل الماء/ حديث مرفوع.

(11) رواه البخاري عن عمران بن حصين رضي الله عنه قال: دخلت على النبي ﷺ ، وعقلت ناقتي بالباب، فأتاه ناس من بني تميم فقال: "اقبلوا البشرى يا بني تميم"، قالوا: قد بشرتنا فأعطنا - مرتين -، ثم دخل عليه ناس من أهل اليمن، فقال: "اقبلوا البشرى يا أهل اليمن، إذ لم يقبلها بنو تميم"، قالوا :قد قبلنا يا رسول الله، قالوا: جئناك نسألك عن هذا الأمر؟ قال: "كان الله ولم يكن شيء غيره، وكان عرشه على الماء، وكتب في الذكر كل شيء، وخلق السماوات والأرض."

خوای گەورە داوای لێکردووین کە بگەڕێین بەدوای دروستکراوەکانیدا و بەهەمانشێوە فەرمانە بۆ مرۆڤەکان بۆ موسڵمانان بەتایبەتی کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْآخِرَةَ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ العنكبوت

واتە: پێیان بڵێ: بەسەر زەویدا بگەڕێن و تەماشا بکەن و بزانن سەرەتا خوای گەورە چۆن دروستکراوەکانی دروست کردووە، پاشان دووەم جاریش لە دوای مردن لە ڕۆژی قیامەت زیندوویان ئەکاتەوە بە دڵنیایی خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

بەهەرحاڵ دەشێت قەڵەم دەزگایەکی تایبەت بێت بە مەلەفی هەموو مەخلوقاتی خوای گەورە کە لە پلان و ئەرشیفەوە دەست پێدەکات، بەفەرمانی خوای موتەعال و هەروەها عەرش و ئاو، دەسەڵاتی خوای موتەعال دەردەخات بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا، وەکو زانراویشە کورسی جێگای قاچی موبارەکی خوای موتەعالە کە گەورەی و فراوانی ئەم مەخلوقاتە لە ڕادەبەدەرە و بەخەیاڵیش وێنا ناکرێت، هەروەها خوای گەورەش پێویستی بە هیچ نییە، بەڵکو هەموو پێویستمان بە زاتی بەرزی خوای موتەعال هەیە، لەدوای ئەم دروستکراوانە خوای گەورە پێداویستی گەردوونی هێنایە بوون، تا گەردوون و ئاسمان و ئەستێرەکان خوای گەورە دەیانهێنێتە بوون.

## سەرەتای دروستبوونی گەردوون

سەرەتای دروستبوونی گەردوون (الكون) لە پارچەیەک ماددەی نازیندوو دروست بووە، بەڵام زۆر ورد و بچووک کە لە ئاستی ڤایرۆس یان بەکتریایەکی بچووک کە بە میکرۆسکۆپ دەبینرێت، خوای موتەعال سەرەتا ئاسمانی بۆ فراوان کردووە، بەشێوەیەکی تر بۆشایی بۆ دروست کردووە بەدەستی موبارەکی زاتی بەرزی دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ الذاريات

واتە: ئاسمانیشمان دروست کردووە بەهێزو توانا، ئێمە بەردەوام فراوانی ئەکەینەوەو توانای فراوان کردنەوەمان هەیەو بەرزمان کردۆتەوەو بەبێ کۆڵەکە ڕامانگرتووە.

ئەم کشانە بەفەرمانی خوایە بەردەوام لە کشاندایە، پاشان خوای گەورە ئەو ماددە نازیندووەی لە (كن فيكون) یاخود بەهۆکاری پەرەسەندن دروست کردووە، بۆمان گرنگ نییە چونکە سەرچاوەی یەکەم لای ئێمەی ئیماندار خوای موتەعالە و سەرچاوەی هەموو داهێنراو و مەخلوقێک دەگەڕێتەوە بۆ زاتی پاکی موبارەکی (الله).

پاشان لەدوای فراوانی بۆشایی ناو ئاسمان کە دەڵێین ئاسمان بۆ ئێمە ئاسمانە، بنەڕەتی وشەکە (سمأ) کە ناونراوە بە (السماء) بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین بۆشایی ئاسمان ئەو بۆشاییەش خوای گەورە خەلقی کردووە لەو بۆشاییەدا ماددە نازیندووەکەی تێرکردووە کە لە شێوەی ماددەی ڕەق هەڵاوساوە و پاشان پەرشوبڵاو بۆتەوە، لەگەڵیدا خوای موتەعال ئاوی دروست کردووە بۆ بەدیهاتنی زیندەوەران، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ الأنبياء

واتە: ئایا کافران نابینن و بیر ناکەنەوە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەرەتادا یەك پارچەیەك بوون، پاشان خوای گەورە لێکی جیا کردونەتەوەو وای لە ئاسمان کردووە باران ببارێنێت و وای لە زەوی کردووە ڕووەك بروێنێت کە پێشتر وا نەبوو، لە ئاویش هەموو شتێکمان زیندوو کردووەو دروست کردووە وەکو ئاژەڵەکان و ڕووەکەکان، ئاو هۆکاری ژیانی هەموو زیندەوەرێکە ئەی ئیتر بۆ ئیمان ناهێنن بە خوای گەورە.

جارێ هەر لەباسی گەردووندابن، گەورەترین تەقینەوە ڕوویداوە، دوای تەقینەوەکە قۆناغێکی تر دەستی پێکرد کە پێیدەوترێت دووکەڵ لە قورئان دا، لە زانست دا پێی دەوترێت (سدیم) کە لەهەموو زانستە نوێیەکاندا بە (بیگ بان)[١٢] ناسراوە.

قۆناغی ڕەقی بۆ قۆناغی دووکەڵ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ﴾ فصلت

---

[١٢] گەردووناسان ئەڵێن: بەر لە (١٤،٥) ملیار ساڵ دروست بووە بە تەقینەوەیەک ( بیگ بانگ) کە تیرەی ئەو گەردیلە سەرەتایە یان کوانتۆم بەشێک بووە لە ( ١٠٠) ملیۆن ملیار ملیار ی سانتیمەترێک.

ئالان گوس دەڵێ: لە ماوەی کەمتر لە تریلۆنی چرکەیەک گەردوون دەستی کردووە بەکشان و ملیار ملیار هێندەی خۆی کشاوە، بە زەمان و مەکان و وزە و ماددەوە.

بڕوانە ( موجز تأريخ الكوت/ هاني رزق/ل ٢٥٠)

ئێستا سنووری گەردوونی بینراو (٢٢ ملیار ساڵی تیشکییە. یەک ساڵی تیشکی نزیکە (١٠) تریلۆن کیلۆمەترە، ( السماء/ د. زغلول النجار/ ل: ٣٦٢.

ئۆپارین دەڵێ: ( ژیانی سەرەتایی لە ئاودا دروست بوو)، علم الفلك /ل ٤٢٣

لە گەردوونی بینراودا زیاتر لە (٢٠٠) بلیۆن مەجەڕە و (٧٠) بلیۆن ئەستێرە هەیە.

(السماء/د. زغلول النجار/ ل: ٣١٢

واتە: پاشان خوای گەورە ویستی ئاسمانەکانی بوو، یەکسەر حەوت ئاسمانی دروست کردو ڕێکیخست، ئەو کاتە ئاسمان دووکەڵ بوو یان هەڵمی ئاوی سەر زەوی بوو[١٣] خوای گەورە بە ئاسمان و زەوی فەرموو یان بە گوێڕایەڵی خۆتان یان بە پێناخۆشبوونی خۆتان فەرمانی من جێبەجێ بکەن، ئەی ئاسمان خۆرو مانگ و ئەستێرەکان دەربکە، ئەی زەوی ڕووبارو دەریاو کانیاو و بەرهەم و ڕووەکت دەربکە، وتیان: ئەی پەروەردگار هەردووکمان ملکەچ و گوێڕایەڵین بۆ فەرمانی تۆ.

ئایەتەکە ڕێک باسی ڕێکخستنی گەردوون دەکات دوای تەقینەوە گەورەکە، سەرەتاش باسمان کرد وشەی (السماء والأرض) بەواتای گەردوون دێت، هەموو بە خۆشی بێت یان بە ناخۆشی لەژێر فەرمان و ڕکێفی خوای پەروەردگاردایە[١٤].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣] قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ...﴾ فصلت. واتە: کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات دوکەڵێ بوو. ( الراغب) دەڵێ: ( اي كالدخان) مفردات الراغب. واتە: وەک دووکەڵێ بوو.

( د. دوگلاس بیرس) شارەزا لە ئاژانسی ناساوە دوکەڵ و سەدیمی گەردوونی دەڵێ: ( تۆزو خۆڵی گەردوونی ( سەدیم) لە تۆزو خۆڵی ناو ماڵ و خانووەکان ناچێ، ئەو لە تەنۆلکەی ورد وەکو کاربۆن و سلیکۆن پێک دێ لە نێوان ئەستێرەکاندا مەلە دەکات، قەبارەیان زۆر لە دوکەلی جگەرە دەچێت* ( الكون بين القرآن والعلم/م. محمد عصام قصاب/ ل: ٢٨٥.

گریسی موریسون دەڵێ: ( سەرەتای دروست بوونی زەوی زۆربەی ئوقیانووسەکان وەکوو هەور لە ئاسمان بوون، ڕووناکی نەیدەتوانی بگاتە زەوی. کاتێ هەور نەماو زەوی سارد بۆوە سوڕی زەوی بووە هۆی دروست بوونی شەو و ڕۆژ.

لە ناو ئاودا کیشوەرەکان دروست بوون، بەرگە هەوا دروست بوو، بەر لە گیانداران ڕووەک پەیدا بوون. وە ژیانی گیاندارانی زەوی سەرەتا لە ناو ئاودا دروست بوو). العلم يدعو للايمان/كريسي موريسون/ل: ٢٩٩-٢٠٠ سەیر بکە.

هەموو ئەو بەڵگە زانستی یانەی لە قورئاندا باسکراون، وەکو لەو نموونە ئایەتانەی سەرەوەدا دەیانخوێنیەوە.

[١٤] گەردوونناسان دەڵێن: بەر لە ( ١٤.٥) ملیار سال دروست بووە بە تەقینەوەیەک ( بیگ بانگ) کە تیرەی ئەو گەردیلە سەرەتایە یان کوانتۆم بەشێک بووە لە (١٠٠) ملیۆن ملیار ملیار ملیاری سانتیمەترێک.

ئالان گوس دەڵێ: لە ماوەی کەمتر لە تریلۆنی چرکەیە گەردوون دەستی کردووە بەکشان و ملیار ملیار هێندەی خۆی کشاوە، بە زەمەکان و مەکان و وزەو ماددەوە. بڕوانە ( موجز تأريخ الكون/ هاني رزق/ل: ٢٥).

ئێستا سنووری گەردوونی بینراو ( ٢٢ ملیار ساڵی تیشکی یە، یەک ساڵی تیشکی نزیکە (١٠) تریلۆن کیلۆمەترە. (السماء/د. زغلول النجار/ل: ٣١٢)

نۆپارین دەڵێ: ( ژیانی سەرەتایی لە ئاودا دروست بوو) علم الفلك / : ٤٢٣.

لە گەردوونی بینراودا زیاتر لە (٢٠٠) بلیۆن مەجەڕە و(٧٠) بلیۆن تریلون ئەستێرە هەیە.

(السماء/ د. زغلول النجار/ ل: ٣١٢.

پاشان باسی دامەزراندن و بەدیهێنانی یاساکانی سروشتمان بۆ دەکات لەچەند ئایەتێکیدا وەکو نموونەی سورەتەکانی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ﴿٣٢﴾﴾ إبراهيم

واتە: الله ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، لە ئاسمانیشەوە بارانی دابەزاندووە، جۆرەها ڕزق و ڕۆزی لە بەرووبووم بۆ ئێوە دەرکردووە لە ناخی زەوی کەشتییەکانیشی ژێربار کردووە لە بەرژەوهیندی ئێوەدا لەناو دەریادا بڕۆن بە فەرمانی خوای گەورە، ڕووبارەکانیشی ژێربار کردووە کە ئێوە ئەتوانن لەناویدا بڕۆن و سوودی لێ ببینن.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴿٦٥﴾﴾ الحج

واتە: ئایا نابینی هەرچی لەسەر زەوی هەیە لە ئاژەڵ و دارو ڕووبارو گیاندارو بێگیان خوای گەورە هەمووی بۆ ئێوە ژێربار کردووەو خستوویەتییە ژێر دەستانەوە تا سوودی لێ ببینن ئەو کەشتییانەش لەناو دەریادا بە فەرمانی خوای گەورە ئەڕۆن، ئاسمانی ڕاگرتووە نایەڵێت بەربێتەوەو بکەوێ بەسەر زەویدا، ئیلا مەگەر بە ئیزنی خوای گەورە، بە دڵنیایی خوای گەورە سەبارەت بە خەڵکی زۆر بەڕەحم و سۆزو بەزەیی و میهرەبانە کە ئەم شتانەی بۆ دروستکردوون و ژێرباری کردووەو خستویەتییە ژێر دەستیان.

﴿۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴿١٢﴾﴾ الجاثية

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئەو دەریایانەی بۆ ئێوە ژێربار کردووە تا کەشتی تیادا بێت و بڕوات بە فەرمان و ئیزنی خوای گەورە تا ئێوەش بەدوای فەزڵی خوای گەورەدا بگەڕێن لە بازرگانی و کاسبی، بەڵکو شوکرانە بژێری ئەم نیعمەتانەی خوای گەورە بکەن.

وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ الجاثية

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویەکاندا هەیە خوای گەورە هەمووی بۆ ئێوە ژێربار کردووەو لەخزمەتی ئێوەدایە وەکو خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و باو باران و شاخ و دەریاو دانەوێڵەو ڕووەك، هەمووی تەنها لەلایەن خوای گەورەوەیەو شەریکی نیە، بە دڵنیایی هەموو

ئەم شتانە بەڵگەو نیشانەن لەسەر تواناو دەسەڵات و تاك و تەنهایی خوای گەورە بۆ كەسانێك كە بیر بكەنەوە.

ئەگەر جوان ورد بینەوە لەم ئایەتانەی ئاماژەن بۆ یاساكانی سروشت و گەردوون بەگشتی، بەدڵنیاییەوە هەڵقولاوی ئەمرۆ فەرمانی یەزدانی مەزنن، پاشان خوای گەورە باسی كات دەهێنێتە ئاراوە لە دروستبوونی گەردوون دا، لەگەڵ بەدیهاتن و یاسا بۆدانان كە لە زاراوەی قورئان دا بەواتای (الخلق والأمر) دێت، دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف

واتە: بە دڵنیایی پەروەردگاری ئێوە ئەو الله یە كە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە لە ماوەی شەش ڕۆژدا، هەر چەندە خوای گەورە توانای هەبوو بە (كُنْ فَيَكون) دروستی بكات، بەڵام هەموو شتێك لای خوای گەورە كاتی دیاریكراوی خۆی هەیە، پاشان بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی خۆی، بەرزبوونەوەیەك كە شایەن و گونجاو و لایەقە بە گەورەیی خوای گەورەو لە بەرزبوونەوە هیچ لە دروستكراوەكان ناچێت، چۆنێتیەكەیشی خوای گەورە خۆی نەبێ كەس نایزانێ خوای گەورە بە تاریكی شەو ڕووناكی ڕۆژ دائەپۆشێ و بە پێچەوانەوە بەخێرایی شەو بەدوای ڕۆژدا دێت و لێك جیا نابنەوە، خۆرو مانگ و ئەستێرەكان هەمووی خوای گەورە دروستی كردوون و ژێرباری كردوون و لە ژێر فەرمان و توانای خوای گەورەدایەو بەفەرمانی خوای گەورە هەڵسوكەوت دەكەن، ئایا دروست كردن و فەرمان دەركردن هەر بۆ خوای گەورە نییە، واتە: چۆن لە دروست كردندا كەس شەریكی خوا نییە، لە فەرمان دەركردن و ئەحكامی شەریعەو یاسادانانیشدا نابێت كەس شەریكی خوای گەورە بێ، الله كە پەروەردگاری هەموو جیهانە خێرو بەرەكەتی یەكجار زۆرو فراوانە.

كەواتە مادام خەلقی كردووە ئەمری بە یاساش كردووە بۆی، سەرەتای ٦ ڕۆژی گەردوون وەكو پێشتر ئاماژەمان پێداوە، مەگەر خوا خۆی بیزانێت چەند ساڵ دەكات، چونكە تەمەنی گەردوون خۆی ئەدات لە ١٣.٧ بلیۆن ساڵ.

هاتن و دەركەوتنی زەوی خۆی ئەدات لە ٤.٥٤٣ بلیۆن ساڵ ئەو ژمارانە لە دەزگا زانستییەكانەوە وەرگیراوە، كەواتە ٦ ڕۆژی خوای گەورە بۆ گەردوون ئەستەمە مرۆڤ پەی پێبەرێت بەو كات و ژماردنەوەی خوای موتەعال.

ئینجا لەدوای ساردبوونەوەی زەوی بەنزیکەی ۱ بلیۆن ساڵ لەدواییدا ژیان دەستی پێ کرد لە کەناری ئاودا بە ۲.۷ بلیۆن ساڵ[۱٥].

هەر لەڕێگای ئاوەوە خوای گەورە هەموو زیندەوەرانی دروست کردووە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾﴾ النور

واتە: خوای گەورە هەموو ئاژەڵێکی دروست کردووە لە ئاو، جا هەیانە لەسەر سکی ئەڕوات وەکو مارو کرم و نەهەنگ، هەیشە لەسەر دوو پێ ئەڕوات وەکو مرۆڤ و باڵندە، هەیشیانە لەسەر چوار پێ ئەڕوات وەکو ئاژەڵەکان، خوای گەورە ویستی لە هەر شتێك بێ دروستی ئەکات بە دڵنیایی خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئینجا ژیان بە گوێرەی دیزاینی زیرەکی خۆی دەستی پێکرد و بەو شێوەیەی کە خوای موتەعال دەیەوێت و دەفەرموێت: ﴿أَمَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٖ مَّا كَانَ لَكُمۡ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ يَعۡدِلُونَ ﴿٦٠﴾﴾ النمل

واتە: ئایا بۆ خوایەك ناپەرستن بە تاك و تەنها كە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە ئەوەندە بەتوانایە لە ئاسمانیشەوە بارانی بۆ دابەزاندوون، بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها باخ و باخاتی زۆر جوانمان بۆ ڕواندوون كە هەر كەسێك سەیری بكات سەرسام ئەبێ لە جوانیدا كە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[۱٥]بە پێی تیوری بیگ بانگ بەر لە (۱۳) ملیار ساڵ گەردوون لە بارستایی وزەیەک یان ( کوانتۆ) دروست بووە بە زەمان و مەکانەوە، کە تیرەی کەمتر بوو لە بەشێک لە ( ملیۆن ملیار ملیار ملیار سەنتی مەترێک، دوایی ئەوە ملیار ملیار جاران دەکێشێت، بە ڕوودانی تەقینەوە گەورەکە گەردوون بەکات و شوێنەوە لە دایک بوو).

موجز تأريخ الكون/ هاني رزق/ ل: ۲۸ سەیر بکە.

وە بە پێی قسەکان ( ڕۆز) و ( ئەنشتاین) لێرەدا لە ئاسمان کونە ڕەشەکان و کونە سپییەکان هەن لە شێوەی کە ڕەنا (الناقور) یان ( البوق) دا کاتێ ماددە دەڕواتە ناو کونی ڕەش (الثقوب السوداء) ماددەکە لە ناو دەچێ و لە کونە کرمەکاندا تێ دەپەڕێ، کە وەکو تونێلەکانن، لە کونی سپییەوە ( الثقوب البيضاء) دەردەچێ و ماددەی گەردوونی نوێ پەیدا دەبێت.

الكون بين القران والعلم/م. محمد عصام قصاب/ ل: ۳٥۱. ( ستیفن هورگینگ) لە کتێبی ( الكون في قشرة جوز) دا بڕوای وایە: گەردوون بەهۆی کونێکی ڕەش لە ناو دەچی و جارێکی تر دروست دەبێتەوە. وەك کەڕەنایە. خوای گەورە دەفەرموێت :(فاذا نقر في الناقور .فذلك يومئذ يوم عسير)المدثر۹/۸.

ئەگەر خوای گەورە نەیڕواندایە ئێوە بۆتان نەبوو نەتان ئەتوانی بەبێ ویستی خوای گەورە بیڕوێنن، چوونکە ئێوە بێ دەسەڵاتن ئایا لەگەڵ ئەم اللەیە کە ئەم هەموو شتانە ئەکات خوایەکی تر هەیە شایەنی پەرستن بێ کە ئێوە بیپەرستن و بیکەنە شەریك بۆ خوا؟، بێگومان نەخێر بەڵکو ئەمانە کەسانێکن لە حەق لائەدەن بۆ باتڵ، یاخود ئەو خوا پوچەڵانە یەکسان ئەکەن بە خوای گەورە.

کەواتە هەموو مەخلوقات لە باران و هەموو دارو دروخت و باخوباخات پێکەوە بە دیزاینێکی ناوازەی خوا، ئەم سەرزەوییەیان ڕازاندەوە، خۆ خوای موتەعال دەیتوانی لە (کن فیکون) دا هەمووی بەرهەم بهێنێت، یان بێ باران سەوزایی دروست بکات، بەڵام خوای گەورە جوانی ئەم گەردوونە لە پەرەسەندنی ئاراستەکراوی خۆیدا ڕازاندۆتەوە، ئامانجی هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد لە سورەتی آل عمران دا خوای گەورە بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت:
﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ١٩١﴾ آل عمران

واتە: ئەو کەسانەی زیکری خوای گەورە ئەکەن بەپێوە و بە دانیشتنەوە وە بەڕاکشانەوە لەسەر لایەکان، یان بیر ئەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دەڵێن ئەی پەروەردگار تۆ ئەم زەوی و ئاسمان و دروستکراوانەت بەبێ هوودەو بۆ یاری و گاڵتە دروست نەکردووە بە پووچەڵی، پاك و مونەززەهی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار کە ئیشی تۆ گاڵتەو بێ هوودەیی تیادا نییە خوایە بمانپارێزە لە ئاگری دۆزەخ.

یاخود دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ٥٣﴾ فصلت

واتە: ئێمە نیشانەی تاك و تەنهایی و گەورەیی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەو ڕاستگۆیی قورئانیان نیشان ئەدەین لە لوتکەو ئاسماندا لە خۆرو مانگ و ئەستێرەکاندا، لە شەو و ڕۆژدا لە نەفسی خۆیاندا کە خوای گەورە چۆن دروستی کردوون و لاشەی چۆن پێکهێناون، تا بۆتان دەرکەوێ ئەم قورئانە پیرۆزە حەقەو لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە ئایا خوای گەورە بەس نییە کە شایەتە لەسەر هەموو شتێك، لەسەر کردەوەکانتان، لەسەر ئەوەی کە قورئان لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیوەو حەقە.

خوای گەورە دەفەرموێت: بە پلەی زانستی بەرز دەبێتەوە ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾ فاطر

واتە: لەناو خەڵکی و گیانلەبەرو ئاژەڵاندا ڕەنگیان لێك جیاوازەو هەر یەكێك و ڕەنگێکی هەیە کە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر دروستکارەکەیان کە خوای گەورەیە، تەنها بەندە زاناکان ئەوان بە زانیارییەوە لە خوای گەورە ئەترسێن بەڕاستی خوای گەورە زۆر بەعیززەت و لێخۆشبووە[١٦].

## پاشکۆی باسی ڕابردوو

ئەوەی لە ڕابردووو باسکرا لەسەر دروستبوونی (السماء والأرض) کە زاراوەی قورئانییە بۆ گەردوون بەکاردێت بەگشتی، قورئان دەقە موبارەکەکانی زۆر ڕوون و ئاشکرایە، زانایانی سەردەم باش پەییان بردووە بە ڕێکخستنی ئایەتەکان، هەرچەندە ماوەی ٥ سەدەیە لەدوای زانایانی سەردەمی مەمالیک لە عزی کوڕی عەبدولسەلام، ئیبنو تەیمییە، ئیبن قەیم، ئیبن کەثیا، جەلالەئابینی ئەلسیوطی، ئیبن حەجەر و ئیمامی نەوەوی...هتد، ئەم زانا بەڕێزانە لە سالەکانی ٦٠٠-٧٠٠ی هیجری ژیاون و هەموو تەمەنیان و کاتیان نزیک بووە لەیەک، لەدوای ئەم زانا بەڕێزانەوە تا ڕادەیەک نوێکردنەوە لە ئیسلامدا وەستاوە تا سەردەمی ڕابوونی ئیسلامی کە ناسراوە بە (الصحوة الإسلامية) ئەویش لەدوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی لە ئاستانەدا، بزوتنەوەیەکی زانستی سەری هەڵدا لەسەر دەستی (جەمالەئابینی ئەفغانی و ئیقباڵ و حەسەن بەنا و محەمەد عەبدە و ئیبنو عاشور، خێزانی ئەرنائوطیەکان لە ئەلبانیا و ناوچەی بەڵقان)، بەڵام لەدوای سەرهەڵدانی بلۆکی شەرقی و غەربی و دەوڵەتی شۆرەویی و ئەمەریکا، موسڵمانان لە جێگای خۆیاندا چەقیون تا ساڵەکانی ١٩٩١ز. و ڕووخانی سۆڤیەت و هاتنی تەوژمی جیهانگیری (عەولەمە) موسڵمانان سەرلەنوێ لێرەولەوێ دەرکەوتنەوە بۆ نوێکردنەوەی ڕابوونی ئیسلامی، هەرچەندە لەڕووی زانستییەوە زۆر لاواز بوون، زیاتر لەبواری جیهادو هونەری سەربازی پێشکەوتن، لەکۆتاییدا لەبەر دەرکەوتنی هێز و لێهاتووی بواری جەنگ، ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات دیسان دەستیان تێکەڵ کردەوە بۆ سەرکوتکردنی موسڵمانان لە هەموو جیهاندا لەتاو ناسۆر و زوڵمی عەلمانیەت موسڵمانان زۆر نەپەرژانەوە سەر زانستی ئیسلامی و نوێکردنەوەی تا لەساڵی ٢٠٠٠ز. سەرلەنوێ بزوتنەوەیەکی زانستی لە بڵاوکراوەکانی ئیسلامی لە خوێندنەوە و

---

[١٦] ئەمە بەکورتی باسی دروستبوونی گەردوون بوو، ئەگەر مرۆڤی زانستخواز بیەوێت زیاتر لەم بوارە شارەزا بێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبە نایابەکەی دوکتۆر عەمر شەریف بەناوی (کیف بدء الخلق) کە کراوە بە کوردی (بوونەوەر چۆن بەدیهات).

بینراو و بیستراو، سوپاس بۆ خوا سەری هەڵدا، هەرچەندە بە پلانی زۆری ڕۆژئاوا دەیانەوێت ئەو بزوتنەوە زانستییە لەبار بەرن، لەڕێگای نەوەکانی خودی موسڵمانان بەناوی سەلەفیەت کە حاشا سەلەفیەت مەنهەجی پاک و پوختی هاوەڵان و دوای هاوەڵانە، بەڵام بەناوی کۆمەڵ و حیزبی تا ڕادەیەک دەیانەوێت تەنها بە (زاهیر) لەدەقەکان بڕوانین، کە ئەمەش هۆکاری دواکەوتوویی و هەژاری زانستی ئیسلامییەکانە، کە لە چەند بوارێک زیاتر دەرناچێت. ئەویش ڕێزمانی عەرەبی و فەرمودە بە زاهیری دەق و تەفسیری قورئان و فیقهی ئیسلامی، ئەم بزوتنەوە خومارە و خەولێکەوتووە ڕێگری لە دیدفراوانی و بوارەکانی نوێکردنەوە لە دەق داو ئاراستەیەکی تر، جۆرێکە لە کۆکردنەوەی موسڵمانان و بەکارهێنانیان لەبواری سیاسی و سەربازی بۆ بەکارهێنانی مەرامی ڕۆژئاوا و عەلمانیەت بە گشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دا.

ئاراستەی کۆتایی بریتییە لە دەستەمۆکردنی موسڵمانان لەبەرانبەر حاکمی زاڵم و دیکتاتۆر بەناوی وەلی ئەمر و گوێڕایەڵی کردنیان، بە مەڕ کردنی کۆمەڵگە تا حاکم بەئارەزووی خۆی شوانییان بکات، سەگی شوانەکەش ئەملاولایان لێبگرێت کە بەداخەوە هەمو ئەمانە لە بزوتنەوەی سەلەفی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامی دا دەردەچێت، خوای گەورە چاکسازی لە حاڵ و گوزەرانماندا بکات، ئەم وتەیەم لە ڕق و داخ نییە بەرانبەر ئەم بزوتنەوەیە من خۆم وەکو بیروباوەڕ بە دڵنیاییەوە خۆم بە سەلەفی دەزانم و جێگای شانازی و سەربەرزیمە، بەڵام لای من ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە توانای گۆڕانکارییان نییە.

هەمیشە لەمپەر و کۆسپ لەسەر ڕێگای زانستخوازانی ئەم ئیسلامە دادەنێت، بەناوی بیروباوەڕ و هەنجەتی دوور لەڕاستی و بیانوی زۆر بێ بەڵگە، کە بەداخەوە خەڵکی و لاوەکان بە تایبەتی تووشی تەمەڵی بیرکردنەوە و ئەقڵ دەکەن، تەنانەت هەندێکیان لەم سەردەمی زانست و پێشکەوتنەدا دەڵێن زەوی تەختە وەک پیتزا!

دەبێت ئەوەش بڵێم کە هەندێک لەو بەڕێزانەی لەناو ئەو بزوتنەوەدا کار دەکەن، زۆر دید فراوان و مێشک کراوە خاوەن ئەقڵ و بیرکردنەوەی قوڵن، بەڵام بەداخەوە ڕێگاش لەوان دەگیرێت بۆ کارکردن تەنانەت دەرکەوتنیشیان.

بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە ناو باسەکە، پێویستە ئەوە بزانین کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووین بە لێکۆڵینەوە و گەڕان بەدوای دروستکراوەکانیدا و هانی داوین لە بوارە جیاجاکانی ژیان و لە دروستکراوەکان وردببینەوە،

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾﴾ الغاشية

واتە: (ئینجا خوای دروستکار لە ڕوانگەی هەندێ دروستکراوەکانیەوە دەیەوێت (صدفە) چییەکان داچڵەکێنێت، بۆیە دەفەرموێت: ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە (قەبارەی، ملی درێژی، قاچە درێژەکانی کە بە سمێکی ئیسفنجی کۆتایی هاتووە، ئینجا خۆگرتنی لەسەر برسێتی و تینوێتی بۆ ماوەی چەندەها ڕۆژ، وە گەلێ شتی تر)﴿١٧﴾ واتە: ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرز کراوەتەوە (ئەو هەموو ئەستێرەو کاهکەشان و هەسارە بێشومارە دەورەی زەوی داوە لە بڵندییەوە ڕاگیراون)﴿١٨﴾ واتە: ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن، چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون[17] (ڕەگیان چووە بە ناخی زەویدا)﴿١٩﴾ واتە: ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەختکراوە (لەبار هێنراوە بۆ کشتوکاڵ و ڕێگەوبان و ژیان)﴿٢٠﴾

هانی تەواوەتی داوین بۆ لێکۆڵینەوە و پشکنین بۆ دروستکراوەکانی، جا لەبواری زیندەوەران و گیانداران و گەردوون و بوارەکانی ئەستێرە و فەلەک، زەوی ناسی و بواری جیۆلۆجی و پاشان کشتوکاڵ و کانزاکان بەگشتی

هەروەها هانی تەواوەتی داوین بۆ لێکۆڵینەوەی گشتی لە هەموو دروستکراوەکانی ﴿قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ العنكبوت

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: با بگەرێن بە زەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە) لەوهوودواش هەر خوا سەر لەنوێ بەرپایان

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[17] لێرەدا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ١٩ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ٢٠﴾ الغاشية.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە جوگرافیای بەرزو نزمی زەوی دەکات: ( بەرزاییەکان و دەشتاییەکان و بیابانەکان و نزماییەکان) نەک ئاماژە بکات زەوی گۆیی نییە بەڵکو تەختە. قورئان دەفەرموێ: ﴿... يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ ...٥﴾ الزمر واتە: شەووڕۆژ بە گۆیی بە سەر یەکتردا دێنێت.

کەواتە: زەوی گۆییە یان نیمچە گۆییە.

( ابن تيمية) دەڵێ: زانایان کۆکن زەوی گۆییە، وە زانایان وەکو: (الرازی) و (ابن حزم) و(المقدسی) و (ابن حوقل) و ( ابن خلدون) ... دەڵێن: زەوی گۆییە.

( مع ايات الله فى السماء والارض/ ا.د. حسن ابو العينين/ ل: ٣٣١-٣٣٢.

وە قورئان ئاماژە دەکات زەوی دەسووڕێتەوە: (فَإذا هِيَ تَمور) الملك ٦. (ابن قتيبة) لە ( تفسير غريب القران/ ل: ٤٠٧) دا دەنووسێ: ( تمور اي تدور).

زەوی سوڕی تەوەرەیی هەیە بە (٢٤) کاتژمێری تەواو دەکات، سوڕی خولگەیی هەیە بە دەوری خۆردا بە (٣٦٥) ڕۆژ کە ساڵێکە تەواوی دەکات.

دەکاتەوە (بە شێوەو شێوازێکی تر ئاسمانەکان و زەوی و ئێمەش دەهێنێتەوە کایە) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

بە ڕاشکاوانە هانی داوین، بێجگە ئەو هەموو ئایەتەی کە هانی جوڵانی بیر و فیکر و زیهن و ئەقڵمان ئەدات،

تێبکۆشین تێبفکرین.

ئەوەی کە گرنگە ئاماژەی پێبدەین لەبواری ئایەتە گەردوونییەکاندا، کە بەدڵنیاییەوە هیچ ئایەتێکی قورئانی دژی تیۆرە ڕاست و دروستەکانی زانست نەبۆتەوە، بگرە زانست بۆ پشتگیری خۆی هەمیشە پشتی بە ئایەتە گەردوونییەکان بەستووە، دەیان زانا و خەڵکی بەتوانا لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە لێرەو لەوێ فەرموودەی لاواز کە عیللەتی لە سەنەد و هەروەها دەق (متن)دا هەیە، زۆربەی جار ڕێکاری زانایان بووە، ئەوانەی کە تایبەتمەندنەبوون لەبواری زانستی، هەمیشە بەو فەرموودە لاوازانە، بوونەتە هۆکاری لەمپەڕ، ئەوەش مانای وانییە، خەڵکی دەهۆڵی ئەوە بژەنێت کە گوایە فەرموودە ڕەت دەکەینەوە، ڕێک بە پێچەوانەوە، فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ میحوەری سەرەکییە وەکو قورئان بۆ هەموو باسەکان، پێویستە نەک بەهەند وەربگیرێت، بەڵکو واجبە لەسەرمان کە هەموو باسەکانی لەسەر دابمەزرێنین، بەڵام ئەو فەرموودانەی کە ڕاست و دروستن و لەلایەن زانایانی فەرموودەوانی بۆمان ڕاستکراونەتەوە و خاوەنی سەنەد و ڕێچکەی ڕاست و دروستن لەلایەن ڕاوییەکانی واتە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە، ئەوانەی کە شارەزان لە بواری فەرموودەدا، دەزانن هەموو فەرموودەیەکی(مرفوع) واتە بەرزکراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لاوازە، بەو مەرجەی باسی پاداشت و سزا نەبێت یاخود (مقطوع) واتە ڕاوییەک لە گێڕەرەوەکان دیارنییە، یان (معلق ) یاخود (غریب) یان (شاذ) ئەمانە هەموو بە فەرموودەی لاواز دادەنرێن.

کەواتە فەرموودەی لاواز دەکرێت کاری پێ بکرێت، بەڵام حوججەی لەسەر دانامەزرێ، حەڵاڵ و حەرامی پێ جیاناکرێتەوە..

بۆ نموونە ئەو فەرموودەیەی کە لە کتێبی (صحیح البخاري)دا هاتووە بەناوی (معازف) کە مۆسیقا حەرام دەکات،

خودی فەرموودەکە (موعەلەقە) بوخاری لە کتێبەکەیدا بە موعەلەقی هێناویەتی، ئەم باسە بووە بە حەتمی لای هەندێک لە بانگخوازان و قوتابیانی زانستی شەرعی، بەڵام لە بەرانبەریدا (مسلم) فەرموودەیەکی ڕاستی هێناوە، کە باس لە مۆسیقا و شمشاڵ دەکات، گومانیشی تێدانیە

پێغەمبەری خوا ﷺ قیاسی چاکە بە حەرام ناکات هەرگیز، فەرموودەکە دەفەرموێت: لە ئەبی مووسای ئەشعەرییەوە دەڵێت: شەوێک دانیشتم قورئانم دەخوێند لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ (دیارە دەنگی ئەبی مووسا خۆش بووە) دەڵێت پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا و فەرمووی (گوێم لە دەنگێک بوو کاتێک قورئانت دەخوێند، خوای گەورە پێی بەخشیویت دەنگی شمشاڵی، کە لە دەنگی شمشاڵی خانەوادەی داودە[١٨].

کەواتە ئەگەر شتێک حەرام بێت چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیچوێنێت بە یەکێک لە بەندایەتییە گەورەکان کە قورئان خوێندنە!

بەهەرحاڵ لێرەدا ئەم پێوەرەم بۆ فەرموودەیەکی تر هێنایەوە کە زۆر نزیکە لە تەفسیری یەهوودی بۆ تەورات و سفری تەکوین (صحاح) کە فەرموودەکە مەرفوعە و لە (کەعبی ئەحبار) هاتۆتەوە و هەندێک لە زانایان دەڵێن ئەبو هورەیرە و کەعبی ئەحبار بەیەکەوەبوون کە گوێیان لە فەرموودەکە بووە، لەکاتێک دا ئیبن و عەباس دەفەرموێت سێ جار کەعب درۆی کرد، هەڵبەت واتای درۆکردنەکە ئەگەر بە (أخطاء ) وەربگرین واتا هەڵەی کرد، فەرموودە لە کەسی درۆزن و ئەوەی کە هەڵە دەکات لە گێڕانەوەی وەرناگرێت، لە کاتێکدا کەعب لە سەردەمی عومەری کوری خەطاب موسڵمان بووە وەکو طەبەری لە مێژووەکەیدا باسی دەکات، بەهەرحاڵ خۆ ئەگەر ئیسرائیلیاتە، وەکو ئەوەی پێغەبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، کێشە نییە لە تەورات وەربگیرێت بەمەرجێ ناکۆکی لەگەڵ دەقی قورئان و فەرموودەدا نەبێت، بەڵام کەواتە بواری دژی چەمکەکان و شێواندنی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێگای قوبوڵ نییە، با زانابێ کەسەکە.

سەردەمی سەرەتاکانی ئیسلام وەکو حوججەیەک یان بەڵگە بەکارهاتبێت، دەشێت لە ئێستادا وەکو فەرموودەی لاواز تەماشا بکرێت، چونکە بنەڕەتی فەرموودەکە لاواز و مەرفوعە، فەرموودەکە دەفەرموێت: زەوی و ئاسمان لەماوەی ٧ ڕۆژدا دروست بووە، تەنانەت خودی ئیبنو کەثیا زۆر بە سەیر و غەریب ناوی دەبات چونکە قورئان دەفەرموێت بە٦ ڕۆژ دروست بووە! ئەمەش هەر دژی قورئانە، بەهەرحاڵ پاشان هەموو ڕۆژەکانی هەفتەی تێدا دەست نیشانکراوە کە مەخلوقاتی تێدا دروست بووە، هەرچەندە بۆ خودی پرۆژەکەی بەندە زۆر گونجاوەو دڵنیایی ئەوە ئەداتە کتێبەکە کە هەموو دروست کراوەکان بە پەرەسەندن دروست بووە بەشێوەیەک لە شێوەکان، بەڵام فەرموودەکان لەگەڵ ئەوەی بە ٧ و ٦ ڕۆژ هاتووە هەندێکیان بە ٦ ڕۆژ باسی کردووە بەڵام لە ناوەخندا هەر ٧ ڕۆژەکە دەست نیشان کراوە، چۆن

---

[١٨] وعن أبي بُرْدَةَ عن أبي مُوسَى قال: قال رسول الله ﷺ لأبي مُوسَى: لَوْ رَأَيْتَني وأنا أَسْتَمِعُ لقِرَاءَتِك البَارِحةَ! لَقَد أُوتيتَ مِزْمَاراً من مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ/اخرجه مسلم.

لە سفری تەکوینی تەورات هاتووە، زۆر هاوشێوەیە، بەڵام ئەوەی کە بەڕاستەوخۆیی باس ناکرێت، ناڵێت لە ڕۆژی کۆتایی هەفتە پەنا بەخوا، خوا پشوی دا! وەکو یەهوود ئەم بوهتان و کوفرە گەورەیە دەکەن.

جاء في صحيح مسلم تحت باب " ابتداء الخلق" عن أبي هريرة رضي الله عنه أنه قال: أخذ رسول الله ﷺ بيدي فقال: (خلق الله عز وجل التربة يوم السبت، وخلق فيها الجبال يوم الأحد، وخلق الشجر يوم الاثنين، وخلق المكروه يوم الثلاثاء، وخلق النور يوم الأربعاء، وبث فيها الدواب يوم الخميس، وخلق آدم عليه السلام بعد العصر من يوم الجمعة في آخر الخلق، في آخر ساعة من ساعات الجمعة، فيما بين العصر إلى الليل).

پاشان بوخاری و عەلی کوڕی مەدەنی قسەیان لەسەر ئەم فەرموودەیە کردووە کە ئەبو هوریرە لە کەعبی ئەحباری بیستووە، بوخاری و بەیهەقی و عەلی مەدنی بە مەرفووعی دەزانن و بە لاواز دایانناوە[١٩].

ئەگەر فەرموودە پەیوەندی هەبێت بە بەندایەتی و ئیمانەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە متەواترە و گێڕەڕەوەی زۆرە لە ڕاوی، چونکە پێداویستییە بۆ ئیمانداران، یان ئەگەر پەیوەندی هەیە، بە فیقهی ئیسلامیەوە بەهەمان شێوە بەکاردێتەوە لە فیقهی ئیسلامی و شەریعەت و یاسا و ڕێسا ئیسلامیەکاندا، ئەم جۆرانەی تر لە فەرموودە کە دەچێتە خانەی بە بەرز ڕاگرتنی خواو تەعظیمی ئیلهامی سبحان و تعالی.

زۆر جار زیادەی دەخرێتە ناو بە زیادەڕۆییەکی زۆرەوە، دەبێتە هۆکاری لەناوچوونی ڕۆحی دەقەکان، چونکە دەقی ئیسلامی ڕەهایە و ڕاستە ١٠٠٪ هەر بۆیە زانایانی فەرموودە پشکنینی بۆ دەکەن و پۆلێنی فەرموودەکان دەکەن و ڕاست و لاواز و درۆ و بوختان جیا دەکەنەوە.

لەهەمانکاتدا دەشێت فەرموودەکە ڕاست و دروست بێت، بەڵام ڕاڤەی زیاتر هەڵبگرێت و ڕاڤە سەرەتاییەکان هەڵە بن، بۆیە مرۆڤی ئیماندار دەبێت هەمیشە لە لێکۆڵینەوە و گەڕاندا بێت، بۆ بەدەستهێنانی زانست، ئەگەر کار بۆ زانای ئیسلامی گەورە کە لە موعتەزیلەکانە هەڵبکەوتایە وەکو نموونەی (جاحظ) کە لە کتێبەکەیدا بەناوی (الحیوان ) زۆر بەهێزتر دەبوو لە (داروین) کە گەشتی هەموو جیهانی کرد، لەجیاتی ئەوەی زانایانی تر ڕێگا دابڕێژن و باسی زانست بکەن، دەبوو زانایانی ئیسلام بەکاری خۆیان هەڵبسانایە، بەڵام بەداخەوە نەک هاوکاری

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٩] قصص الأنبياء وأخبار الماضين، هەرچەندە قاضي الشيخ محمد بن احمد كنعان ئایەتی ١٦٤ البقرەی بە بەڵگە بۆ هێناوەتەوە، لەو سەرچاوەی ئاماژەمان پێ کردووە کە پێناچێت پەیوەندی بەیەکەوە بێت، چونکە ئەو ئایەتە زیاتر باس لە یاساکانی سروشتە.

ناکرێت، بەڵکو دژیایەتی دەکرێت و زانایانی تری دوور لە باوەڕی ئیسلامی جێگای گرتۆتەوە، کە ئەمەش، بە تاوان و هەڵەی زۆر گەورە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی هەژمار دەکرێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوە و پاشان نەوەکانی داهاتوومان، ئەگەر تەماشای سێ بۆ چوار پشتمان بکەین، لە باو و باپیرانمان لە کورد و عەرەب و عەجەم بەگشتی و بەتایبەت کورد خاوەنی هیچ داهێنانێک نەبوون، هەر خەریکی خواردن و خەوتن بوون، هیچیان بۆ نەوەکانی داهاتوو تۆمار نەکردووە، هەڵبەت زۆر کەم نەبێت، مرۆڤ نازانێت لەم سەردەمەدا شانازی بەچی باو و باپیرانی بکات، لەکاتێکدا باو و باپیرانی تر بۆ وەچەکانیان دنیایەک چالاکی پڕ لە زانست و هونەر و پێشکەوتنیان تۆمارکرد، بەهەرحاڵ لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە کە لە هەوڵدا بین نەوەکانی داهاتوومان بەچاوی کەم و سووک تەماشامان نەکەن، بزانن لە هەوڵدا بووین و لەسەروو هەموویەوە ئەو فەرزی کیفایەیەش لەسەر موسوڵمانان لابەرین و خوای گەورە لەخۆمان ڕازی بکەین.

پوختەی باسمان ئەوەیە لە بەندایەتی و خواپەرستی و عەقیدەماندا دەگەڕێنەوە لای سەرچاوەی سەلەفمان و لەوان ڕاست و دروست دەست ناکەوێت بۆ زانین لە بەندایەتی، بەڵام بۆ وەرگرتنی زانستی کۆمەڵناسی ئیبن و خەلدوون لە پێشترە لە حەسەنی بەصری - ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت- بۆ وەرگرتنی زانستی بایۆلۆجی و کۆسمۆلۆجی (گەردوونناسی) د. عەمر شەریف لە پێشترە تا ئیبن کەثیا، هەروەها ئەمەش مانای لێکەمکردنەوە نییە، بەڵکو واتای تایبەتمەندییەتە لە زانست دا.

## ناوازەیی و جوانی هەسارەی زەوی

خوای پەروەردگار هەسارەی زەوی زۆر تایبەت بەدیهێناوە جیاوازترە لە هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر، سەرا و سەنتەری سەرەکی لەم گەردوونەدا پێدەچێت تەنها زەوی بێت، پارێزراوە بە هەسارەی تر و هەموو پێداویستییەکی تێدا فەراهەم هاتووە، هەروەکو خوای پەروەردگار نمونەیەک لە بەهەشتی خۆیمان نیشان بدات، پڕیەتی لە نهێنی، پڕیەتی لە جوانی و شۆخ و شەنگی، پڕیەتی لە سیستەم و دیزاینی ڕێک و پێک و ناوازە، خوای پەروەردگار تایبەت دروستی کردووە(٢٠).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٢٠) بەڵام زانایانی ئیعجاز دەڵێن:

لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتگەلێکی زۆر هەیە، ئاماژە دەکەن لە گەردوونی بینراودا جگە لە زەوی، ملیۆنان هەسارە هەیە ژیانیان تێدا دروست بووە، یان بە کەلکی ژیان دێن.

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۚ ...﴿٢٩﴾﴾ الشورى .

<===

ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەم لە وتەی زانایانی بایۆلۆجی و فەلەکناسی و زەوی ناسییەوە دێت، کە هەموو دروستکراو و یاسا و توخمی فیزیایی و کیمیایی تێیدا بە ئەندازەییە و بێ زیاد و کەمی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ القمر

واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر دروست کردووەو هەموو شتێك بڕاوەتەوەو بڕیارمان لەسەر داوە.

یاخود لەزۆر جێگای تردا خوای موتەعال دەفەرموێت: يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ ۖ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُم مَّشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ البقرة

واتە: نزیکە ئەو هەورە بروسکەیە چاویان دەربکات، هەر ئەوەندە کاتێك کە ئەو هەورە بروسکەیە کە ڕووناکییەك ئەکات کەمێك بەر پێیان ڕووناك ئەبێ ئەوان بەو ڕووناکییە ئەڕۆن کاتێك کە تاریك ئەبێتەوە ڕائەوەستن توانای ڕۆیشتنیان نابێت، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت هەستەوەری بیستن و بینینیان لێئەسەنێتەوە، بەدڵنیایی خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

لەبیرکردنەوەی ئێمە گەورەترە، لە ئێستای زانستی پێشکەوتووە ئەم دیزاین و نازدارییەی زەوی دروست کردووە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

واتە: یەکێ لە بەڵگەکانی خوا دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و بڵاوکردنەوەی گیاندارانە لەناویاندا.

. د طالب ناهي الخفاجي دەنووسێ:

زانایانی گەردووناسی ئامارێکی وردیان کردووە و گەیشتوونە ئەو ئەنجامەی لێرەدا هەر لە مەجەڕەی ئێمەدا (١٠) بلیۆن هەسارە هەیە بە کەلکی ژیان دێن. لەوانە (٥٠٠) ملیۆن هەسارە هەیە ژیان تێدا پەیدا بووە.

( نظرتنا المعاصرة الى الكون/ل: ١٠٨.

لە گەردووندا زیاتر (٢٠٠) ملیار مەجەرە هەیە، هەر مەجەڕەی خۆمان ( تریلۆن)ێک ئەستێرەی تێدایە، زۆربەی ئەستێرەکان وەکو خۆری خۆمان هەسارەی هەیە، لە ( ٩) هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر تەنیا زەوی ژیانی لەسەرە.

هەندێ زانا بە (١٢) هەسارەی دادەنێن، بڕوانە ( گەردووناسی/م. محمد سەرگەرینێڵی)

بەهونەری مومکین و جوانی بێوێنە کە ڕۆژ بەڕۆژ و ساڵ بەساڵ بگرە زیاتر نهێنی زیاتر و جوانتر و کارایی دیزاینی خوایی دەردەکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ فصلت

واتە: ئێمە نیشانەی تاك و تەنهایی و گەورەیی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەو ڕاستگۆیی قورئانیان نیشان ئەدەین لە لوتکەو ئاسماندا لە خۆرو مانگ و ئەستێرەکاندا، لە شەو و ڕۆژدا، لە نەفسی خۆیاندا کە خوای گەورە چۆن دروستی کردوون و لاشەی چۆن پێکهێناون، تا بۆتان دەرکەوێ ئەم قورئانە پیرۆزە حەقەو لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە، ئایا خوای گەورە بەس نییە کە شایەتە لەسەر هەموو شتێك، وە لەسەر کردەوەکانتان، وە لەسەر ئەوەی کە قورئان لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیوەو حەقە؟

تەنانەت زانست ئەوەی جێگیر کردووە کە هەسارەی زەوی لەجێگایەکی گەردووندایە کە پارێزراوە و لەناو گەلە ئەستێرەیەکی نمونەیی و ناوازەدایە، پاشان خۆر بۆ دەرکەوتنی ژیان و ژیانی ڕووەکی زۆر گونجاو لەبارەی خودی هەموو زیندەوەرانەوە، هەسارەی خۆر دراوسێیەکی زۆر باشەو هاوکارمانە، تەنانەت بەشێکی تر لەو هەسارانە کەدراوسێمانن ڕۆڵی پارێزگاری کردن لە ئێمە دەبینن، بگرە وەکو پاسەوان پاسەوانیمان دەکەن، بۆیە ئەگەر شتێکی نەخوازراو ڕووەو هەسارەی زەوی بێت زۆر ئاسانە کە هەموو ژیان لەناو ببات، بەڵام هەسارە پاسەوانەکانمان بەلای خۆیاندا ڕای دەکێشن، ئەمەش بەس دیزاینی زیرەک و ئاراستەکراو دەتوانێت هەڵبسێت بەم دروست کردنە، ئەویش خوای تاک و تەنهاو پەروەردگارمانە.

سەرباری ئەم هەموو پاسەوان و پارێزکاری کردنە لە هەسارە ناوازەکەمان نزیکتر لە پاسەوانەکان پاسەوانێکی زۆر وریای و بگرە زۆر زۆر پارێزەرە بۆ ژیانمان و جێگیری خودی زەوی ئەویش (مانگە)، کە لاری زەوی جێگیرکردووە بۆ سەقامگیری ژیان، پاشان لە ڕووی بێخی ژیان یاخود بنەڕەتی ژیان کە ئاوە لەسەر ڕووەکەی بەهەرسێ دۆخەکەی گونجاوە کە بریتییە لە (شلی و ڕەقی و گازی).

لەهەمانکاتدا زانایان و بیرمەندانی بوارە زانستییەکان کە پرسیار بکەن و بڵێن، ئەم هەموو هەمئاهەنگییە و ناوازەیی هەسارەی زەوی و جوانی و سیستەمی ڕێک و مومکین، بەڕێکەوت و هەڕەمەکییە؟

بۆیە یاساکانی سروشت، ژیانی زیندەوەر و گونجانی کەش و هەواو یاخود هەموو پێکهاتەکانی ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە بەرجەستە بووە، ئەم سیستەمە ڕێکو جوانە بە

مەبەستە، بۆیە من بڕوام بە پەرەسەندنی ئاراستەکراو لەڕێگای ئەو زانا بەڕێزانەوە کە ئاشکرای ئەم ڕێکی سیستەمەیان کردووە کە د. عەمر شەریف لە کتێبەکەیدا ئاماژەی کردووە کە گوایە یەکێک لە زانایان وتویەتی: گەردوون کالآیەکە کراوە بەبەری مرۆڤدا، یاخود وەکو کراسێکە گوێرە و پێوەری مرۆڤ بڕاوە یان چنراوە، پاشان دەڵێت زانایەکی تر دەڵێت (گەردوون بەهاتنی ئێمەی مرۆڤی زانیوە بۆیە وا خۆی ڕێکخستووە).

پوختەی باس: زەوی ئامادەبوو بۆ ژیان بە پارسەنگییەکی ناوازە لەنێوان کلۆرۆفیل و هیمۆگلۆبین، ڕووەک ژیانی بۆ دروست بوو بە وەرگرتنی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن، زیندەوەرانی تری خوێندار بە هەڵمژینی ئۆکسجین هەریەکەیان پێچەوانەی کردارەکەی دەکردەوە ژیان دروست بوو، ئەو دروستبوونە یان لە قوڵایی زەریاکانەوە هاتووە یاخود لەکەناری زەریاکانەوە کەماوەی دەگەڕێتەوە بۆ ٣.٧ بلیۆن ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ پەرەسەندنی ئاراستەکراوی خوای پەروەردگار ژیان دەستی پێکرد لە ڕووەک و زیندەوەرانەوە، زۆر گرنگە جیاوازی لەنێوانی ژیان و ڕۆح دابکەین، کە ڕۆح هیچ پەیوەندی بەژیانەوە نییە.

## جیاوازی نێوان ژیان و ڕۆح و ئەقڵ

ژیان وەکو لە باسی ڕابردوودا ئاماژەمان پێدا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٣.٧ ملیۆن ساڵ وەکو زانایان دەست نیشانیان کردووە، ژیان لە هەموو زیندەوەرانی ماددی و نامادد‌ی هەیە، کە بریتییە لە پرۆتین و سایتۆپلازما و پرۆتۆپلازما و ناوک...هتد دەشێت مادده نازیندووەکانیش هەر بە زیندەوەر وەربگرین، چونکە پێک هاتووە لە ئەلیکترۆن و نیوترۆن، جۆرێک بێت لە ژیان.

دار و درەخت و گژوگیا جۆرێک لە ژیانیان تێدایە، بەڵام خاڵین لە ڕۆح، زیندەوەران خاوەنی ژیانن، بەڵام خاڵین لە ڕۆح.

مرۆڤ کە پێک هاتووە لە سپێرم، یاخود لەو سەرەمێکوتانەی کەلەناو مەنی دایە، بەلای کەمەوە ٢٠ ملیۆن سپێرم دەڕژێت بۆ ناو ڕەحمی ئافرەت، هەموو زیندەوەرن و زیندوون تا یەکێک لەو ٢٠ میلۆنە بە ئازایی و لێوەشاوەیی خۆی، خۆی دەگەیەنێتە جێگای مەبەست، هەموو ئەم زیندەوەرانە بێ ڕۆحن، بەڵام خاوەنی ژیانن.

هەرچەندە خودی ژیان ئەو نهێنییە گەورەیەیە کە نەک زانست پەی پێ نەبردووە، بەڵکو دەستەوەسانە لە ئاست سەرچاوەکەیدا، بەڵام بۆ ئێمەی ئیماندار دەزانین کە خوای کردگاری بوونی بەدی هێناوە و ژیانیش مەخلوقی خوایە، بەڵام ڕۆح چەندە لە ژیان ئاڵۆزترە، هەموو

زیندەوەران خاوەنی نین، بێجگە مرۆڤی دوای ئادەم و جنۆکە و فریشتە، هەرسێکیان تەکلیفی بەندایەتییان لەسەرە، فریشتە خاوەن ڕۆحە بەو مانایەی کە هەمیشە لە بەندایەتی دایە و بێ فەرمانی خوای گەورە ناکات، بەڵام جنۆکە سەردەم و چۆنێتی ڕۆحی نازانین، لەبەر ئەوەی تەکلیفی بەندایەتی لەسەرە، ئەویش خاوەن ڕۆحە، هەروەها نەوەکانی ئادەمیش، بۆیە ناڵێم مرۆڤ چونکە مرۆڤ پێش ئادەم هەبوون و زیندوو بوون بەڵام خاوەنی ڕۆح نەبوون، خاوەنی نهێنێنییەکی تربوون کە ناوی ئەقڵە، کە مرۆڤی ئاقڵ دوای نیاندەرتاڵ هەژمار دەکرێت بە ٢٠٠ هەزار ساڵ کە ئەقڵێکی سەرەتایی هەبووە، هەڵبەت نیاندەرتاڵ ٥٠٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر ژیاوە، بەڵام خودی مرۆڤ لە ٢ ملیۆن ساڵ بەر لە ئێستا لە وڵاتی ئەثیوبیا سەری هەڵداوە، هەروەها تەمەنی ئادەم بۆ ٨٥٠٠ ساڵ تێپەڕناکات، یەکەم ڕۆح لە ئادەمەوە دەست پێدەکات، چونکە تەکلیفی بەندایەتی کەوتە سەر شان، دێمەوە ناوباس کە ژیانە، جیاوازی زۆرە لەگەڵ ڕۆحدا. رۆح پێچەوانەو دژی نییە، بەڵام ژیان دژەکەی مردنە خوای پەروەردگار باسی ژیان و مردنمان بۆ دەکات لە قورئاندا لەزۆر جێگادا وەکو نموونەی ﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾﴾ الروم

واتە: خوای گەورە ئەوەندە باڵادەستە لە مردوو زیندوو دەردێنێ و دروست ئەکات: وەکو لە دڵۆپێك ئاو مرۆڤ دروست دەکات، لە هێلکە باڵندە دروست دەکات، لە کافر موسڵمان دروست دەکات، بە پێچەوانەیشەوە لە زیندوو مردوو دەردێنێ و دروست دەکات، مرۆڤ کە زیندووە مەنی و دڵۆپە ئاوی لێ دەردێنێ، باڵندە کە زیندووە هێلکەی لێ دەردێنێ، موسڵمان کە زیندووە جاری وا هەیە لە نەوەی ئەو کافر دەبێت، لە پاش ئەوەی کە زەوی مردووە خوای گەورە بەهۆی بارانەوە زیندووی ئەکاتەوەو ئەیژیێنێتەوە، چۆن ئەو زەوییە مردووەمان زیندوو کردەوە ئێوەش بەو شێوازە لەناو قەبرەکانتان دەرئەکرێن و زیندوو دەکرێنەوە.

ئەگەر ژیان و ڕۆح زۆر نادیاربن، ئەوا ئەقڵ هیچی کەمتر نییە لەوان کە زانست ناتوانێت جێگای ئەقڵ دەستنیشان بکات، مرۆڤ لە زیندەوەرانی تر بە ڕۆح و ئەقڵ جیادەکرێتەوە، دەشێت هەر ئەو نهێنییە بێت کە خوای گەورە بەخشیویەتیە مرۆڤ و کردوویەتیە سەرداری سەرزەوی، لەناو ئاژەڵدا ئەقڵی غەریزەیی هەیە وەکو منداڵ کە خوای گەورە ئەقڵی غەریزەیی پێ بەخشیوە، کە برسی دەبێت دەگری، بۆ ئاژەڵیش ئەقڵی غەریزەیی پێدراوە واتا بە مەلەکە وەریگرتووە نەک خۆی بیدۆزێتەوە، مرۆڤ ئازادی پێبەخشراوە بەهۆکاری ئەقڵی، توانای جیاکاری هەیە، توانای بڕیاردانی هەیەو توانای داهێنان و بەرهەم هێنانی هەیە، کە لەهیچ زیندەوەرانێکی تردا نییە.

## دروستبوونی مرۆڤ

سەرهەڵدانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ٢ ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا، مرۆڤ بە سەربەخۆیی دروست نەبووە، وەکو

ئەوەی لە تەورات و ئینجیلدا باس کراوە، بەڵام قورئان زۆر ڕاشکاوانە باسمان بۆ دەکات کە بەئاراستەی زیندەوەر واتا پەرەسەندنی ئاراستەکراو بووە بە مرۆڤ، بەڵام بەم شێوە سەربەخۆ بووە نە لە مەیمون یان مشک هیچیانەوە نەهاتووە[٣١]، بەڵام لە زیندەخانەوە هاتووە بە ئاراستەی خوای موتەعال، خوای گەورە زۆر بەڕوونی بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾﴾ الأنعام

واتە: پەروەردگارت دەوڵەمەندو بێ پێویستە لە دروستکراوەکانی وە زۆر بەڕەحم و بەزەییە، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت ئەی ستەمکاران ئێوە لەناو ئەبات و ڕیشەکێشتان دەکات، لە دوای ئێوە کەسانێکی تر ئەهێنێ کە خۆی ویستی لێ بێت و گوێڕایەڵی و عیبادەتی بکەن، هەروەکو چۆن ئێوەی دروست کرد لەنەوەی کەسانێکی تر.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

([٣١]) پرۆفیسۆر دوان.ت.کیش دەڵێ:

زانایانی پەرەسەندن بڕوایان وایە ژیان پەیتا پەیتا لە خانەوە دروست بووە، ئەو خانەیەش لە ماددەی نا زیندەوەر و نا ئەندامی دروست بووە.

بەڵام زانایانی تیوری دروست بوون ( نظرية الخلق) بڕوایان وایە: ئێمە بە هەموو شێوەکانی ژیانەوە لە ڕێگای فەرمانی کردگارەوە دروست بووین.

د. نوسێ: ( د. جون مۆر) لە بەستنی کۆڕی سالآنەی پێشکەوتنی زانستی لە ئەمەریکا وتی: دروست بوونی مرۆڤ لە ئەمیبا و قوڕولیتەی دەریاکان بڕوایەکی جێگای پەسەند کردن نییە، بگرە فڕی بە زانستەوە نییە.

هل تعرضت لغسيل الدماغ/د: أورخان محمد علی/ل: (٢٤) و (١٤٣) سەیر بکە.

فرانک ئالن بایۆلۆجی ئەمەریکی دەنووسێ: ( لە تەواوی خانەی زیندوودا پرۆتینەکان لە پێنج توخم پێک دێن: کاربۆن، هایدرۆجین، نایترۆچین، گۆگرد، هەر گەردیلەیەک لە (٤٠) هەزار گەردیلە پێک دێت.

دەنووسێ: پرۆتینەکان کەرەستەی کیمیایی بێ ژیانن، تا ئەو ڕازەی هیچی لێ نازانین ( روح)نەڕواتە ناوی ژیانی ناڕواتە ناو ، تەنیا خوای خاوەن هۆش و زانستی بێ سنوور توانی بە زانستی تەواوی ئەو گەردیلە پرۆتینی یە پەی پێ ببات و بزانێ بە کەلکی ژیان دێ. بۆیە کردییە ئارامگای ژیان و بنیاتی ناو ڕازی ژیانی پێدا، ( الله يتجلى في عصر العلم/ جون.کلوفرمونسا/ل:٩-١٠

لەم ئایەتەدا جوان دەردەکەوێت کە باسی وشەی (أَنْشَأَكُمْ) بەکارهاتووە کە مەبەست جۆری مرۆڤ نییە، جیاوازترە لە مرۆڤ هەروەکو لە ئایەتی، ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ الأنعام **دا** دەفەرموێت:

واتە: هیچ ئاژەڵێك نییە لەسەر ڕووی زەوی ئەوەی بەسەر ڕووی زەویدا بڕوات، هیچ باڵندەیەك نییە کە بە هەردوو باڵەکەی بفڕێت ئیلا هەموویان وەکو ئێوە نەتەوەن و زیکری خوای گەورە ئەکەن، لەم کتابەدا کە قورئانی پیرۆزە هەموو شتێکمان تیادا باسکردووەو کەمتەرخەمیمان لە هیچ شتێکدا نەکردووە کە باسی نەکەین و هەموو ڕووداوەکانی تیادا باس کراوە، یاخود کەسمان لە بیر نەکردووە لە ڕزق و ڕۆزیدان و بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردن، پاشان هەموو ئەم نەتەوانە بە مرۆڤ و باڵندەو گیانەوەران هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو لای خوای گەورە حەشر ئەکرێن.

لێرەدا دەردەکەوێت کە هەر ئوممەتە یەک سەرچاوەی هەیە، بەڵام سەربەخۆ و ئاراستە کراو بووە لە خانەی زیندەوەرەکە هاتووە، ئەوەندەش بەسە لەدوای دۆزینەوەی زانستی جینۆم ئەوە یەکلا بووەوە کە مرۆڤ لە RNA پاشان بەدروستکردنیDNA ملیۆن زانیاری لە DNA٤٠٠ شریتی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە، گومانمان لە لێکچوون هەیە لەگەڵ هەموو زیندەوەراندا، چونکە بڕوامان وایە یەک خاوەنمان هەیە و جێ دەستی یەک زاتی پەروەردگاری پێوە دیارە، نمونە مشک زۆر نزیک ترە لە مرۆڤ لەڕووی جەستەییەوە تا شامپانزی، بەڵام ئەمە مانای وانییە مرۆڤ بنەڕەتی مشکە.

بەهەرحاڵ لەزانستی بایۆلۆجی پەرەسەندنی ئاراستەکراو ئەوە بە تەواوی یەکلابۆتەوە و داروین و داروینیزمەکانی وەلاناوە، خاوەنی ئارگۆمێنت و بەڵگەی زانستی بەهێز.

لەدوای ٢٠٠ هەزار ساڵ مرۆڤی هۆشیار و خاوەن قامەت دەرکەوتووە، خوای پەروەردگاریش منەتی خۆی بەسەر مرۆڤدا دەکات و لەباسی پەرەسەندنی ئاراستەکراودا بەمرۆڤ دەفەرموێت: ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴿٨﴾﴾ الانفطار

واتە: لە هەر شێوەو وێنەیەك خوای گەورە ویستی لێ بێت وێنەی کێشاویت و شێوەی دروست کردوویت.

هەرچوار قۆناغی سەرەکی تێدا دەست نیشان کراوە لە دروستبوون و ڕێک کردنەوە، قامەت بەرزی و پاشان لەڕێگای ڕەحمی دایکەوە مرۆڤ وەکو هەموو زیندەوەرێکی تر بەقۆناغی پەرەسەندندا تێپەڕ بووە بە ئاراستەی خوای گەورە، بەڵام قۆناغی دواى مرۆڤ بوون، بوون بە (بەشەر)ە، (کە زۆر جیاوازترە لە مرۆڤی پێش بەشەربوون) ئەمەش لەباسی ژیانی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

## دروستبوونی جنۆکە یاخود پەری

جنۆکە جۆرێکە لە دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار و لەگڕی ئاگر دروستبوون، سەردەمی دروستبوونیان دیار نییە و مێژووی نییە[٣٢]، لەبەرئەوەی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا نییە، لەشێوەی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و کەرەستە و شتومەکدا.

جنۆکە لە وزە دروست بووە، لەزمانی عەرەبیدا بە (جن) ناوبراوە واتا شاراوە، کەس ناتوانێت بیانبینێت لەسەر شێوەی و هەیکەلی تایبەتی خۆیان لەبەر ئەوەی وزەن خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾ الرحمن

واتە: جێنیشینی دروست کردووە لە گڕو بڵێسەی ئاگر، یاخود لە ئاگرەکە خۆی جنی دروست کردووە.

ئەمانەش جۆریان هەیە کە هێزو تواناکانیان لەیەکتر جیاوازە لە قورئاندا بە (جان، جن، مارد، عفریت، قرین) باس کراون، پلەوپایەی شەیتان بەخشراوە پێیان، وەکو مرۆڤ ڕاسپێردراون بۆ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٣٢) ( د. شتاینەر) دەڵێ: جنۆکەکان چوار جۆریان هەیە: (گیانی زەمینی (ئەلنەوم) و گیانە ئاوییەکان (ئەندین) و گیانە هەواییەکان (سەلەف) گیانە ئاگرییەکان٠سەمەندل).

(دبلیو ئی، ئنفنز وینتز) لە کتێبی ( الایمان بالجن) دەنووسێ: دەتوانین لە ڕێگای زانستی یەوە بوونی زیندەوەرە شاراوەکان بسەلمێنین وەکو: جنۆکە و دێوو عیفریتەکان و هەموو جۆرەکانی ئەجینەکان و ۆحی مردوان، ئەمەش دواى لێکۆڵینەوەی زۆر کۆکردنەوەی سەدان حاڵەت. ( ما بعد الحياة/ کولن ولسن/ل: ٦٣.

(دشتاینر دەڵێ: ( ئێمە لە کاتی نوستندا لە خەوندا سەرەتا کە دەچینە قۆناغی یەکەمی خەوەوە دواى بێداربوونەوە چاوپێکەوتن لەگەڵ مردوان و زیندەوەرە ڕوحییەکان دەکەین لە جیهانی باڵادا). هەمان سەرچاوە/ل: ١٦٦

لە کتێبی ( الروح/ ابن قیم) و ( شرح الصدور/ السیوطي) زۆر بە وردی بە دەقی قورئان و سونەت باسی پەیوەندی جیهانی ئەرواح کراوە، (ابن عباس) لە تەفسیری ئایەتی ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ...﴾ الزمر.

دەڵێ: ئەو ئایەتە مەبەستی ئەوەیە: ( الارواح تلاقی في المنام) روحەکان لە کاتی نوستندا دیداری یەکتری دەکەن. ( القرطبي) لە تفسیر القرطبي/١٥/٢٦٠) دا هەمان قسەی کردووە.

بەندایەتی، توانای تایبەتییان زۆرە، شەیتانەکانیان هەموو دژی مرۆڤن، بەڵام توانایان زۆرکەمە بەسەریاندا، خوای گەورە لەململانێ ئەم جۆرە مەخلوقە ئاگاداری کردووینەتەوە، ئیبلیس کە یەکێکە لە دوورخراوەکانی ڕەحمەتی خوای پەروەردگار ڕۆڵی ئەو دژایەتییە دەگێڕێت، خودی ئیبلیس کە لەجنۆکەیە خوای گەورە لەقورئاندا بۆمان باس دەکات: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ بَدَلًا﴿٥٠﴾﴾ الكهف

واتە: کاتێك ئێمە بە فریشتەکانمان وت کڕنووشی ڕێزو ئیحترام و بەگەورەزانین بۆ ئادەم بەرن هەموویان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە، ئیبلیس مەلائیکەت نەبووە، بەڵکو لە جنی بوو لە گوێڕایەڵی و فەرمانی خوای گەورە دەرچوو، ئایا ئێوە ئیبلیس و نەوەکانی ئەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان جگە لە من، لە دوای ئەوەی کە بێ فەرمانی خوای گەورەی کرد لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن؟ خراپترین شتە کە ستەمکاران خۆشەویستی و پشتیوانی خوای گەورە ئەگۆڕنەوە بە شەیتان.

ئاشکرای کردووە کە دوژمنمانە خۆی و نەوەکانی، هۆکاری دژایەتییەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەیویست لەسەر زەوی خۆی و نەوەکانی ببنە جێنشین، بەڵام ویستی خوای وابوو کە دەبێت مرۆڤ ببێتە جێنشین، ڕق و داخ لە دڵەکەی یاخود بوغزەکەی، چونکە نازانێت دڵی هەیە یان نا، ئەو جۆرە مەخلوقە لە مرۆڤ ناچن، لەو کاتەوەی مرۆڤ بۆتە جێنشین لەسەر زەوی، ئەو شەیتانە دەیەوێت سەرزەوی لەمرۆڤایەتی تێک بدات.

شەیتان پەیوەندی هەبووە بە خواوە، وەکو ئەوەی زانراوە خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵ کردووە،

جنۆکە و فریشتە دەبینێت بە بەڵگەی قورئانی لە جەنگی بەدردا، خودی شەیتان بەشداربوو کەچووە بەرەوە و کەتیبەی فریشتەکانی بینی ڕای کرد و هەڵات، خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە ئەو ڕووداوە: ﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴿٤٨﴾﴾ الأنفال

واتە: کاتێك کە شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندنەوە بۆ ئەوەی کە بڕۆن کوشتاری موسڵمانان بکەن لەسەر شێوەی (سوراقەی کوڕی مالیك) هاتە ناویان، وتی: ئەمڕۆ هیچ کەسێك نییە

بتوانێت زاڵ بێت بەسەر ئێوەدا، من دراوسێی ئێوەم، واتە: پەناتان ئەدەم و بەرگریتان لێ ئەکەم و ئەتانپارێزم لە دوژمنەکەتان، کاتێك کە هەردوو کۆمەڵەکە موسڵمانان و موشریکان بۆ یەك دەرکەوتن، شەیتان پاشگەز بووەوەو پشتاو پشت گەڕایەوە، وتی: من بەریم لە ئێوە، بەرائەتی لە کافران کردو وتی: ئەوەی کە من ئەیبینم ئێوە نایبینن، کاتێك نیشانەکانی سەرکەوتنی بینی بۆ موسڵمانان، کاتێك کە جبریلی بینی لەگەڵ مەلائیکەتدا، وتی: من لە خوای گەورە ئەترسێم نەوەکو لەلایەن مەلائیکەتەوە تووشی شتێکم بکات، سزای خوای گەورە زۆر سەختە.

ئەوەندەی لێرەدا گرنگە کە ئاماژە بەبوونی مەخلوقێک بکەم کە جنۆکەیە هەڵبەت لە ٤ بەرگی کتێبدا ژیان و چۆنیەتی کار و پیشەو دژایەتیان باس کراوە بەناوی (مەملەکەتی شەیتان)، بۆیە لێرەدا بۆ پڕکردنەوەی باسەکە ئاماژەیەکی کورتی پێ دەکەین، تا ئەو خوێنەرانەی نەگەیشتوون بە کتێبی مەملەکەتی شەیتان، لێرەو هەندێک زانیاری سەرەتایی دەست بخەن.

کاری شەیاتن لەسەر زەویدا دوو جۆرە جۆرێک لەڕێگای جادووبازی هەڵخەڵەتاندنی خەڵکییەوەیە، جۆرێکی تر لەڕێگای وەسوەسەو دوورخستنەوەی خەڵکییە لەیەکتاپەرستی بۆ هاوبەش دانان بۆ خوای تاک و تەنها وپەروەردگار کە لە بەشەکانی داهاتوودا زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەم باسە، بەتایبەت لە ژیانی ئادەم دا عَلَيْهِٱلسَّلَامُ.

# مەملەکەتی سێیەم:
# هاتنی ئادەم یەکەم پێغەمبەر و باوکی هەموو نەوەکانی (بەشەر) نەک مرۆڤ (الانسان)

## ئایا ئادەم یەکەم مرۆڤ بووە؟

خوای پەروەردگار ٢ ملیۆن ساڵ بەر لەئێستا مرۆڤی دروست کردووە[٢٣]، ئەگەر مێژووی ئایینەکان وەربگرین بەگشتی تەمەنی ئادەم تا ئەمڕۆ نزیکە لە ٨٥٠٠ ساڵ، ئەمەش بە چەند هەواڵێک لە پێغەمبەرەوە هاتووە لە مێژووی طەبەری-یدا هاتووە[٢٤]، لەلای من وەک نووسەر ئەو مێژووە ڕاستە و بەڕاستی دەزانم، ئەگەرچی پلەی فەرموودەکە لە ئاستی (صحیح)دا نییە، بەڵام لەڕووی واقعی و مێژوویەوە پاڵپشتییەتی، کەواتە ئادەم یەکەم مرۆڤ نەبووە، پێش ئادەم بە سەدەها هەزار مرۆڤ ژیاوە و مردووە کە خۆی ئەدات لە ملیۆنەها!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٣] ( ابن عباس) لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ( ان خلق مأتي الف ادم) اليواقيت والجواهر للشعراني) / ١- ٤٩ واتە خوا بەر لە ئادەمی تری دووسەد هەزار ئادەمی دروست کردووە.

هەندێ زانایان پێیان وایە خوا بە ئادەم دەڵێت: ( الخليفة) بەو پێیە ئادەم جێگرەوەی تری ئادەمی ترە، کاتێ فریشتەکان دەڵێن: ﴿... أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ ...﴾ البقر: لێرەدا دەردەکەوێت مرۆڤی بەر لە ئادەم دڕەندە و خوێنڕێژبوون، بۆیە خوا ئادەمێکی ژیر دروست دەکات، جیا لە ئادەمی تر ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ...﴾ البقر . بریجیت سونیت کۆنترین مرۆڤی بۆ (٦-٧) ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە لە سالی(٢٠٠٠ز) دۆزییەوە لە کینا.

بەڵام مرۆڤی ژیر تەمەنی بۆ (١٥٠-١٣٠) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. قراءة في تأريخ الوجود/ د. احمد محمد كنعان/ل: ١٢٧.

(د. رالف سونسکی) پارچە ئێسقانێکی مرۆڤی ژیری لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزییەوە بۆ (١٠٠) هەزار ساڵ دەگەڕایەوە. ( الإنسان من الميلاد الى البعث/ د. زغلول النجار/ ل: ٢٠٠)

( د. ئان جوجر٠ د.جلاس ئەکس، کیسی لسکین/ لە کتێبی ( العلم وأصل الانسان/ ل: ١٤٣- ١٤٤)دا (ت: د. مؤمن حسن و د. موسى اديس) دەیسەلمێنن: ئادەم و حەوا باوک و دایکی مرۆڤی ژیرن و ئەندازەی جینی مرۆیی ئەوەیان سەلماندووە، کەواتە: مرۆڤە دڕەندەکان، یان هاوشێوە مرۆکان لە ناوچوون.

[٢٤] لەداهاتوودا زیاتر باسی دەکەین و شیکاری بۆ دەکەین.

## کەواتە ئادەم کێیە ؟

ئادەم ئەو پێغەمبەرەیە خوای گەورە هەڵیبژاردووە لەناو خەڵکی سەردەمی خۆیدا وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر

خاوەنی دایک و باوک بووە، مرۆڤێکی ئاقڵی سەردەمی خۆی بووە، خوای گەورە بەهۆکاری تەکلیف کردنی بەندایەتی و واجب بوونی بەندایەتی لەسەری، ڕۆحی پێبەخشییوە و لەناو مرۆڤایەتی ئەو سەردەمە هەڵبژاردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ آل عمران

واتە: لە نەسەب و ڕەچەڵەکدا ئەمانە کۆمەڵێکن هەندێکیان لە هەندێکی تریانن تەنانەت لە نیەت و کردەوەو ئیخلاص و تەوحیدیشدا پێغەمبەران هەموویان یەك بوون، خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە.

ئیتر ئەوکات ڕێک کردنەوەی لاشەی مرۆڤ تەواو بوو لاری نەما، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ التين

واتە: بەدڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە لە جوانترین شکڵ و شێوازدا کە بە ڕێکی دروستمان کردووەو ئەندامەکانی لەشیمان بەجوانترین شێواز دروست کردووە، هەر سەرەتا خوای گەورە ئادەمی دروست کردووەو مرۆڤی دروست کردووە بەو شێوازە بووە.

تەفسیری ئەم ئایەتە بەواتای (پێشتر خوار و لار بووە خوای گەورە ڕێکی کردۆتەوە) لە تەفسیری طەبەری و جەلالەدین دا بەواتای باشترین ڕێککردنەوە لەسەر باشترین شێوە لێکداوەتەوە، لە طەبەریشدا بەواتای باشترین ڕێککردنەوە هاتووە.

وشەکە بە ئاشکرا دیارە کە (تقويم)، لەوانەیە هەندێک بڵێن خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ غافر

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە زەوی بۆ ئێوە جێگیر کردووەو ڕاخستووە کە لەسەری جێگیرو نیشتەجێن، ئاسمانیشی وەکو سەقفێکی پارێزراو داناوە، وێنەی کێشاون و دروستی کردوون بە جوانترین شێواز لە هەموو خواردنە بەتام و چێژەکان ڕزق و ڕۆزی داون، ئا ئەم

(الله)یە پەروەردگاری ئێوەیە (الله)یە کە پەروەردگاری هەموو جیهانەو خێرو بەرەکەتی یەکجار زۆرەو هەموو کەس و شتێکی گرتۆتەوە.

ئەمە بۆ پاڵپشتی ئەوە بێتەوە کە گوایە مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە بەجوانترین شێوە بووە، لەڕاستی دا ئەو ئایەتە

قۆناغی کۆتایی مرۆڤە لەپەرەسەندی ئاراستەکراودا، خوای گەورە بە هەمان شێوە دروستکراوەکانی تری بەباشترین شێوە خەلق کردووە، دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِیٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَیۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِینٖ﴾ السجدة

واتە: کە هەموو شتێکی بە جوانترین و تەواوترین شێواز دروست کردووە سەرەتا مرۆڤی لە قوڕ دروست کردووە. هەموو مەخلوقاتی بەباشترین شێوە خەلق کردووە.

خوای پەروەردگار ڕێزی لە ئێمە گرتووە و هەڵیبژاردووین لەناو دروستکراوەکانی تردا بەهۆکاری جوانی لەش و لارمان نییە، بەڵکو بەهۆکاری ڕۆح و پەیام و خەلیفە بوونمانە، دەنا پڵنگ و شێر و ئەسپ و زۆرێکی تر لە گیانداران لەمرۆڤ جوانتر و بەهێزتر و ئازاترن، بەڵام خاوەنی ئەو چوار نهێنییە نین کە ئێمەی مرۆڤ هەمانە ئەویش (ئەقڵ، پەیام، ڕۆح، جێشینبوون ) ڕێزی ئێمە بەو هۆکارانەیە بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِیٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِی ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّیِّبَٰتِ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ كَثِیرٖ مِّمَّنۡ خَلَقۡنَا تَفۡضِیلٗا﴾ الإسراء

واتە: بەدڵنیایی ئێمە ڕێزمان لە مرۆڤ ناوە لە شێوەی دروست کردن و پێدانی عەقڵ و ناردنی پێغەمبەران بۆیان لە وشکانی و دەریادا هەڵمان گرتوون، لە وشکانی لەسەر ئاژەڵ و هەڵگرەکانی تر، لە دەریایشدا لەناو کەشتیدا جۆرەها خواردنی بەتام و چێژو باشمان پێ بەخشیوون، فەزڵمان داون بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکان کە دروستمان کردوون.

هەندێکی تر ئایەتێک دەهێننەوە، بۆ بەڵگەی ئەوەی کە گوایە ئادەم و حەوا دوو مرۆڤی سەرەتایی بوون، کە ئەم ئایەتە تەنها تەفسیری زۆرێک لە ڕاڤەکارانی قورئانە دەنا هیچ پەیوەندی بەئادەم و حەواوە نییە، ئایەتەکە بۆ کۆمەڵگەی قوڕەیش هاتووە کە ئافرەتیان بە چاوێکی زۆر کەم و سووک تەماشا دەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿یَٰٓأَیُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِی خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِیرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِی تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَیۡكُمۡ رَقِیبٗا﴾ النساء

واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆتان بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە کەسێك دروست کردووە، لەو کەسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناوە، لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری هێناوەتە کایەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە سوێندی پی دەخۆن، پەیوهیندی خزمایەتیش بپارێزن چوونکە بە ڕاستی خوا چاودێرە بەسەرتانەوە.

لەم ئایەتەدا باسی ئادەم و حەوا نییە، بەڵکو وەکو شێخ متەوەلی شەعراوی دەڵێت، مەبەست لەوەیە کە پیاو و ژن هەردووکیان یەک جۆر ڕەگەزی مرۆیین و لە نێر و مێ پێک هاتوون، گوایە تەفسیرکردنی بەوەی پیاوەکە ئادەمە و ئافرەتەکە حەوایە، هیچ بنەمایەکی نییە کە گوایە لە پەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، ئەمەش هیچ بنەمایەکی نییە.

ئایەتەکە لە سورەتی النساء دا هاتووە یەکەم ئایەتە و باسی مرۆڤ بوونی ئافرەت دەکات وەکو پیاو، کە عەرەبی جاهیلی و یەهوودی زۆر بەچاوی کەم و بوونەوەرێکی تری بێجگە مرۆڤ تەماشایان دەکردن.

، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا باسی ئافرەت دەکات کە هاوشێوەی پەراسووی مرۆڤە ئەوە مانای ئامۆژگارییە وچاکە کردنە لەگەڵ، ئافرەتان چونکە سەرەتای فەرموودەکە بە قوڕەیش و موسڵمانان بەگشتی دەفەرموێت لەگەڵ ئافرەتان باش بن، بەشێوەی وەسیەتنامە، ئامۆژگاریمان دەکات، پاشان عیللەتی باش بوونی ئێمە لەگەڵ ئەوان دەست نیشان دەکات.

ئافرەتان توانایان وەکو توانای پیاو نییە، سۆز و هەستیان بەهێزترە، بۆیە لە شێوەی پەراسوو کە خوارە هێناویەتیەوە تابزانین ناتوانین ڕاستی بکەینەوە و زیاتریش بیچەمێنینەوە دەشکێت، کەواتە دەبێت وەکو خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و دووجار وەسیەتی کردووە کە لەگەڵ ئافرەتان باش بین و ئەم فەرموودەیە لەکۆتایی تەمەنی خۆشەویستماندا فەرموویەتی هیچ پەیوەندی بەباسی جەنابی حەزرەتی ئادەم و خاتوو حەواوی خێزانیەوە نییە[٢٥].

خۆ ئەگەر کۆمەڵێک ئەوە دەکەن بە بەڵگە کە گوایە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ...﴾ النساء یاخود لە سورەتی ڕۆم ئایەتی ٢١ دەفەرموێت: ﴿... خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا ...﴾ الروم یان لە سورەتی الشوری ئایەتی ١١ دەفەرموێت: ﴿... جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا ...﴾ الشورى هەمووی دەکەنە بەڵگە کە ئادەم و حەوا لەیەک جەستە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٥] عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال: رسول الله ﷺ استوصوا بالنساء، فإن المرأة خلقت من ضلع، وإن أعوج شيء في الضلع أعلاه، فإن ذهبت تقيمه كسرته، وإن تركته لم يزل أعوج، فاستوصوا بالنساء. متفق عليه، وفي لفظ مسلم: استوصوا بالنساء خيرا.

دروستبوون ئەویش جەستەی ئادەم، کە لەڕاستییدا پەیوەندی بەو باسەوە نییە، ئەگەر ئەوە بکرێتە بەڵگە دەبێت بڵێین هەر مرۆڤەو پێغەمبەرێکی لێ جیابۆتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴿١٢٨﴾﴾ التوبة

واتە: بەدڵنیایی ئەی گرۆی عەرەب پێغەمبەرێك لە نەفسی خۆتان هاتووە کە عەرەبە وەکو خۆتان، ڕەچەڵەكو سیفەتو ئەمانەتو دەستپاکی دەناسن، یاخود ئەی مرۆڤایەتی پێغەمبەرێك هاتووە وەکو خۆتان مرۆڤە هەر شتێك ئێوە تووشی مەشەقەو ناڕەحەتی بکات پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆشە، یان ئەوەی ئێوە تووشی سزا بکات لە قیامەتدا پێی ناخۆشە، زۆر سوورە لەسەر هیدایەتو باوەڕهێنانو سوودی دونیاو قیامەتتان بەرامبەر بە باوەڕداران زۆر بەڕەحمو سۆزو بەزەیی و میهرەبانە.

، بەڵام ڕاستی ئایەتەکە ئەوەیەکە پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە لە جنسی بەشەری ڕەگەزی مرۆڤە.

هەرچەندە ڕاڤەکاران ئەوەندە سادەنیین لە ڕووکەشی ئایەتەکە ئەو واتایە دەربهێنن، بەڵام لەسەر بنەمای گریمان ڕاڤەیان کردووە، دیسان پرسیارێکی تر زیندوو دەبێتەوە دەڵێن: باشە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴿٥٩﴾﴾ آل عمران

واتە: نموونەی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لەلای خوای گەورە وەکو نموونەی ئادەم وایە کاتێك کە خوای گەورە ئادەمی لە خۆڵ دروست کرد بەبێ دایك و باوك، عیسایشی بەبێ باوك دروست کرد، ئیتر بۆچی باوەڕ بە عیسا ناهێنن خۆ ئەوەتا باوەڕتان بە ئادەم هەیە کە بەبێ دایك و باوك دروست بووە، پاشان پێی فەرموو ببە یەکسەر دروست بوو، بوو بە مرۆڤ.

ئەوانەی ڕەخنە لە بیروبۆچوونی پەرەسەندنی ئاراستەکراو دەگرن دەڵێن ئەوەنیە خوای گەورە نموونەی ئادەمی لە قوڕ دروست کردووە و وتویەتی ببە، بووە، بەڵام لێرەدا عیسا کوڕی مەریم ئەگەر بەو پێوەرە بێت، ئادەم و عیسا زۆر لەیەک دوورن هەر لەیەک ناچن، عیسا لەسکی دایکیدا بە مانگ دروست بووە لە ڕەحمی ئافرەتەوە هاتووە، جیاوازییەکە زۆرە ئەگەر بەو واتایە لێکی بدەینەوە، خۆ ئەگەر نموونەی بێ دایک و باوکی بخەینە ئاراوە، عیسا خاوەنی دایک بووە، لێرەدا ئەو لێکچوونەی کە پێشتر باس کراون دوورن لەیەکەوە، بەڵام زۆر نزیکە کە ئادەم و عیسا سەلامی خوایان لێبێت هەردووکیان لە توخمەکانی خاکن و مرۆڤن، چونکە مرۆڤ بوونی عیسا

لێرەدا مەبەستە نەک خودی ئادەم، بەڵکو هەردووکیان لە توخمی خاکن وەکو چۆن هەردوو هاوڕێکەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾﴾ الكهف

واتە: هاوڕێ باوەڕدارەکەی گفتوگۆی لەگەڵدا کردو پێی وت: ئایا تۆ کوفرت کرد بەو خوایەی کە تۆی لە خۆڵ دروست کردووە واتە: ئادەمی باوکت پاشان خۆتی لە دڵۆپە ئاوێك لە مەنی دروست کردووە، پاشان کردویتی بەم مرۆڤە ڕێکە، هەموو ئەندامەکانی بە ڕێکی دروست کردووە. لێرەدا بنەڕەتی خۆی بیردەخاتەوە کە لەخۆڵ دروست بووە پاشان لەمەنی، لێرەدا گەڕانەوەیە بۆ سەرچاوەکە، بنەڕەتی مرۆڤ خاکە، کەواتە لێکچوونی ئادەم و عیسا مرۆڤ بوونیان و بنەڕەتیان لە خاک و خۆڵە، ئەوانەشی کە دەڵێن ئادەم لەخۆڵ بە (کن فیکون ) دروست بوو، واتە بە ببە بووە، بەڵگەی قورئانمان هەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾﴾ الإنسان

واتە: بە دڵنیایی ماوەیەك لەسەردەم و کات بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە کە هیچ شتێك نەبووە تا باس بکرێ و وجوودو بوونی نەبووە، ئادەم سەرەتا پێش ئەوەی دروست بکرێ بوونی نەبوو و باس نەکراوە، یاخود مەبەست پێی مرۆڤە پێش ئەوەی کە دروست بێ وجوودو بوونی نیە.

فەرموودەشمان هەیە کە دەڵێت ووشکبوونەوەی ئادەم، کەلێرەدا مەبەست لە خودی ئادەم نییە بەڵکو خودی مرۆڤە، زیاتر ڕوون دەبێتەوە لەئایەتەکانی داهاتوودا.

سەرەتای کتێبەکەش شیکاری کراوە لەسەر وشەی (کن فیکون)، پاشان باس و شیکاری بۆ (ثم) (ف)

دەکەین لە ڕێزمانی عەرەبیدا کە بۆ مەوداو ماوەی دوور و درێژە.

هەندێکی تر لەو کەسانەی کە بڕوایان بەم ڕاستییە نییە، دەڵێن گوایە خوای موتەعال مرۆڤی تایبەت بەدەستی خۆی دروست کردووە، ئەمەش تایبەتمەندی مرۆڤ دەردەخات کە ڕاستەوخۆ دروست بووە، ﴿قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾﴾ ص

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی ڕێگری لێکردیت کە سوجدە نەبەی بۆ ئەو ئادەمەی کە بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کرد، ئەی ئیبلیس ئایا خۆت بەگەورە زانی و لوتبەرز بووی یان خۆت بە بەرزو بڵند زانی.

خوای گەورە لە بەرانبەر ئیبلیسدا دەفەرموێت: بۆ سوجدەت نەبرد، لێرەدا دەیگەڕێنینەوە بۆ ئەوەی ڕێزی مرۆڤ لە دروستکردنی مرۆڤە بەدەستی خوای موتەعال، بەڵام خوای گەورە، هەموو گیاندارانی بەدەستی موبارەكی دروست کردووە، نەک مرۆڤ بەتەنها، دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَـٰمًا فَهُمْ لَهَا مَـٰلِكُونَ﴿٧١﴾﴾ یس

واتە: ئایا نابینن ئێمە بەدەستی خۆمان ئەو ئاژەڵانەمان بۆ دروست کردوون، ئێستا ئەوان خاوەنین.

بێجگە ئەوەش خوای گەورە ئاسمانی بەدەستی موبارەکی خۆی دروست کردووە و دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَـٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴿٤٧﴾﴾ الذاريات

واتە: ئاسمانیشمان دروست کردووە بەهێزو توانا.

کەواتە ئادەم سەلامی خوای لێ بێت یەکەم مرۆڤ نەبووە، پێش ئەویش مرۆڤ هەبووە ئەمەش وتەی سەدان زانای ئەم ئیسلامەیە لە کۆن و نوێدا، هەر لە ئیمامی غەزالی و زوهری و زانایانی نوێ بەگشتی لە شێخی شەعراوی، یوسف قەرزاوی، محەمەد عەبدە...هتد.

لێرەدا پێویستە شیکاری بۆ توخمی خاک و خۆڵ، ئاو و قوڕ و وشکبوونەوە بکەین لەنێوانی مرۆڤ و بەشەردا بەتایبەت ئادەم.




## ئایا ئادەم خاوەنی دایک و باوک بووە یان لە قوڕ دروست بووە؟!

پێش ئەوەی باسی دروستبوونی مرۆڤ بکەین لە خاک و ئاو تا دەبێتە قوڕ، پێویستە جیاوازی لەنێوانی (الانسان و البشر) دا بکەین.

## جیاوازی بەشەر لەگەڵ ئینسان؟!

ئینسان سەرەتای هاتنی لە خاک و ئاو تا دەبێت بەقوڕ بەناوی ئینسان هاتووە، کە تەواو کامڵ دەبێت خوای گەورە ڕێکو پێکی دەکات و ئامادەی دەکات بۆ پەیام هەڵگرتن، ناوی ناوە بەشەر.

بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە ناوی پێغەمبەرانی بە بەشەر ناوبردووە وەکو حەزرەتی محەمەد ﷺ

خوای گەورە بە بەشەر ناوزەدی کردووە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف

واتە: پێیان بڵێ: من تەنها وەك ئێوە بەشەرێکم فریشتە نیم یان خوا نیم، جیاوازییەکەم ئەوەیە کە لەلایەن خوای گەورەوە وەحیم بۆ دێت و کراوم بە پێغەمبەر، پەیامی منیش ئەوەیە کە پەرستراو و خوای ئێوە تەنها یەك خوایە و شەریکی نیەو تاك و تەنهایە، جا هەر کەسێك بە ئومێدی گەیشتنە بە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت بە سەری بەرزو بە ڕووی سپی کە باوەڕدارانن، با لە دونیادا کردەوەی چاك بکەن، لە کاتی عیبادەت کردن بۆ پەروەردگاری هیچ کەسێك نەکاتە شەریك بۆ خوای گەورە.

هەروەها لە بارەی حەزرەتی نووحەوە دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾﴾ المؤمنون

واتە: دەسەڵاتدارە کافرەکان لە قەومەکەی وتیان: ئەمیش هیچ نیە تەنها بەشەرێکە وەکو ئێوە ئەیەوێ فەزڵی خۆی بدا بەسەر ئێوەداو ئێوە شوێنی بکەون، ئەیانوت: ئەگەر خوا ویستی لێ بوایە مەلائیکەتێکی ئەکرد بە پێغەمبەرو ئەینارد نەك ئەم پیاوە بنێرێ، لە باوك و باپیرانی پێشترماندا شتی وامان نەبیستووە کە لەناو بەشەردا کەسێك بکرێ بە پێغەمبەر.

سەبارەت بە حەزرەتی مووسا و هاروونی برای سەلامی خوایان لێبێت هەر بە بەشەر ناوی بردوون و دەفەرموێت: ﴿فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾﴾ المؤمنون

واتە: وتیان: ئایا ئێمە ئیمان بە دوو بەشەری وەکو خۆمان بێنین لە کاتێکدا کە قەومەکەشیان ملکەچی ئێمەن و عیبادەت بۆ ئێمە ئەکەن.

بۆ حەزرەتی یوسفیش هەر بە بەشەر ناوی هاتووە، ﴿فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ یوسف

واتە: کاتێك ئەمیش قسەی ئافرەتانی شاری بیست ناردی بە شوێنیاندا، کە وتراوە: ئەوانیش مەبەستیان ئەوە بووە بەهۆی ئەم قسەیەوە بگەنە کۆشك و یوسف ببینن، جێگاو خواردنی بۆ ئامادە کردن میوەی بۆ دانان و هەر یەکێك لەوانیش چەقۆیەکی دایە دەستیانەوە ئەو کاتە وتی: ئەی یوسف وەرە دەرەوە بۆ لایان کاتێك ئافرەتان یوسفیان بینی زۆر بەلایانەوە گەورەو جوان بوو سەریان سوڕما و ئاگایان لە خۆیان نەماو دەستی خۆیان بڕی وتیان: پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە، یان پەنا بەخوای گەورە بەڕاستی ئەمە بەشەر نیەو جوانییەکەی بێ وێنەیە، ئەمە هیچ شتێك نیە تەنها فریشتەیەکی زۆر جوان و بەڕێز نەبێت.

هەروەها خوای پەروەردگار حەزرەتی ئادەمیشی هەر بە بەشەر ناو بردووە، کەواتە، جیاوازی لەنێوان ئینسان و بەشەردا کراوە لەقورئاندا[٣٦].

ئیمامی غەزالی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان دڵ و ڕۆح و نەفس و عەقڵ دەڵێت: ڕاستی مرۆڤ ڕەگەز و نەژادێکی نابەرجەستەیە کە لە هەموو خەلقەکانی تری پێ جیادەکرێتەوە بۆیە بەهۆکاری ئاگابوونمان و ڕۆحمان و عەقڵ و نەفسمان بووینەتە بەشەر و ناوی بەشەرمان هەڵگرتووە، زۆر بە شیکاری تر لە کتێبی (إحیاء علوم الدین )دا باسی کردووە، ناوی ڕۆح و عەقڵ زۆری ناوەوە پۆلێنکاری بۆکردووە.

نەژادی مرۆڤ بنەڕەتی خاکە لەزەوی، بۆیە خوای پەروەردگار ماددەی جەستەمان دەخاتە پەنای زەوی و خاکەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ...۝٦١﴾ هود.

واتە:...هەر ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی دروست کردووەوای لێکردوون کە سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە...

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ۝٥٥﴾ طه

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٦] (دوو زانای ئەم ئیسلامە لەڕووی زمانەوانی و ڕاڤەی قورئان شێخ محمد متەوەلی شەعراوی و د.حەسەن حامید عەطیە، جیاکاریان کردووە لەقورئاندا بۆ ئەم باسە).

واتە: لەو زەوییە لەو خۆڵە دروستمان کردوون، واتە: ئادەم بنچینەو ئەسڵی لە خۆڵ بووە پاشانیش ئەتانگەڕێنینەوە بۆ ناو زەوی کاتێك کە ئەمرن، لە ڕۆژی قیامەتیش جارێکی تر لە زەوی دەرتان ئەکەینەوەو زیندوتان ئەکەینەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ المؤمنون

واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە لە (سولالە) کە بریتییە لە دەرکردنی شتێك لە شتێکی تر.

پاشان خوای گەورە لە ئایەتی دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا﴾ نوح

واتە: خوای گەورە ئێوەی واتە: ئادەمی لە زەوی دروست کردووە، واتە: لە خۆڵ ئادەمی دروست کردووە.

هەموو ئەمانە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن، کە مرۆڤ لەسەرزەوی دروست بووە و بۆ سەر زەویش دروست بووە، فەرمانیشی پێکراوە کە زەوی ئاوەدان بکاتەوە، پاشان خوای گەورە وەکو گیانداری زیندوو مرۆڤی بەستۆتەوە بەهەموو گیاندارانی ترەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێکهاتەی ڕەگەزی نێر و مێیە و وەکو هەموو گیاندار و زیندەوەرانی تر، بەگیانلەبەرانی سەر زەوییەوە هاوبەشن و لەڕووی ژیانەوە، پاشان ڕاگری ژینگەن لەهەمان کاتدا پێداویستی مرۆڤن، دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الأنعام

واتە: ئەڵێن: باشە بۆچی ئایەت و نیشانەیەك لەلایەن خوای گەورەوە دانابەزێ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئەوەی کە مەلائیکەت بەچاوی خۆمان ببینن؟ پێیان بفەرموو: خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی هەیە کە ئایەت و نیشانەو موعجیزەیەك بۆ ئەوان دابەزێنێ و بەچاوی خۆتان ببینن، بەڵام ئەگەر دایبەزێنێت و ئیمان نەهێنن ئەو کاتە مۆڵەتتان نادات و یەکسەر سزاتان ئەدات وەکو ئوممەتانی تر، بەڵام زۆربەی زۆریان زانیارییان نیەو نازانن.

کەواتە پەیوەندی مرۆڤ بە زەوییەوە پەیوەندیەکی بنەڕەتیە و هەروەها پەیوەندی تەواوی هاوبەش هەیە لەنێوان گیانلەبەران و باڵندە و خشۆکەکاندا، هەمووشمان بنەڕەتی دروستکردنمان دەگەڕێتەوە بۆ ئاو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ ۖ فَمِنْهُم

مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍۚ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴿٤٥﴾ النور

واتە: خوای گەورە هەموو گیانلەبەرێکی دروست کردووە لە ئاو، یاخود لەو دڵۆپە ئاوە کە مەنییە، جا هەیانە لەسەر سکی ئەڕوات وەکو مارو کرم و نەهەنگ، هەیشە لەسەر دوو پێ ئەڕوات وەکو مرۆڤ و باڵندە، هەیشانە لەسەر چوار پێ ئەڕوات وەکو ئاژەڵەکان، خوای گەورە ویستی لە هەر شتێك بێ دروستی ئەکات بە دڵنیایی خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

پاشان خوای پەروەردگار مرۆڤی لەقوڕ دروست کردووە، دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ﴿٧﴾﴾ السجدة

واتە: هەموو شتێکی بە جوانترین و تەواوترین شێواز دروست کردووە، سەرەتا مرۆڤی لە قوڕ دروست کردووە.

قۆناغی دروستبوونی مرۆڤ زۆر جیاوازە لەگەڵ ئادەمدا بە قوڕ، ئەو قۆناغانەی باس دەکرێت هیچ پەیوەندی نییە بە ئادەمەوە، چونکە ئادەم بەشەرە، خوای پەروەردگار بە بەشەر ناوی بردووە، هەموو بەشەرێکیش کامڵە وەک بەشەر بوونی.

## ئەی قۆناغی دروستبوونی مرۆڤ چۆن باسکراوە لە قورئاندا؟

د. عەمر شەریف دەڵێت: (خانە پاشان هێلکە، پاشان کۆرپەلە لە منداڵداندا پاشان بەدیهێنراوێکی تر).

لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتی (١٢ـ ١٤) لە سورەتی (المؤمنون): ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴿١٢﴾ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ﴿١٣﴾ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴿١٤﴾﴾ المؤمنون

واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە لە (سولالە) کە بریتییە لە دەرکردنی شتێك لە شتێکی تر﴿١٢﴾ پاشان لە دڵۆپە ئاوێك [٢٧] دروستمان کردووەو لە شوێنێکی جێگیردا دامانناوە کە ڕەحمی ئافرەتە﴿١٣﴾ پاشان ئەو دڵۆپە ئاوە ئەبێ بە خوێنێکی مەیوو، پاشان ئەو خوێنە مەیووە ئەبێتە پارچە گۆشتێکی ڕێکنەخراو دواتریش ڕێك ئەخرێت، پاشان ئەو پارچە گۆشتە ئەکەین بە ئێسقان و ئێسقانی لێ دروست ئەکەین بۆ ئەوەی لاشەی ڕابگرێت، پاشان ئەو ئێسقانەیش بە گۆشت دائەپۆشین، پاشان ڕوح ئەکەینە بەری و ئەیکەن بە مرۆڤێکی تر ئەو الله یەی کە باشترین دروستکارە خێرو بەرەکەتی یەکجار زۆرە، شایەنی ئەوەیە کە بە گەورە بزانرێ﴿١٤﴾

لێرەدا خوای پەروەردگار ئاماژە بۆ ئامرازی پەیوەندی (ثم) دەکات، کاتێکی درەنگکەوتوو بەکاردەهێنرێت، پەیوەندی تایبەتە کە بەجۆری زیندەوەرە و بۆ قۆناغێکی تری گۆڕانکاری، هەروەها دەڵێت: ئەمە کاتی زۆر پێویستە دەشێت ملیۆنەها ساڵی خایاندبێت.

لەهەمانکاتدا پیتی (ف)ی پەیوەندی هاتووە کە تایبەتە بە ڕێزمانی عەرەبی ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، کە دروستکردنی مرۆڤ بە پەرەسەندنێکی ئاراستەکراوی خوای پەروەردگارە لە خانەوە تا مرۆڤ بوون.

قۆناغی مرۆڤ بوون ڕاستکردنەوە و ڕێک بوونە، پاشان قۆناغی ڕۆح تێچوون، جیاوازترە لە زیندوویەتی، کرانەوەی ئەقڵ، یان بەدەست هێنانی ئەقڵ کە ئامرازەکانی بیستن و بینین و هەستپێکردنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِیٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَیۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٧] گریسی مورسون دەڵێت: ( هەموو ژیانەکی زیندوو لە ئاودا دەستی پێ کرد) ( العلم یدعو للإیمان/ل: ٢٠٠

بەپێی قسەکانی ستیڤن ڕوبت ئیروین ( ١٩٦٢-٢٠٠٦ ز) زیندەوەرزانی ئوستراڵی، ژمارەی جۆری زیندەوەران لەسەر زەوی دەگاتە (٣٠) ملیۆن جۆر،( تأریخ الوجود/د. احمد محمد کنعان/ل: ١٢٥.

بە پێی ( تیوری دروست بوون) کە ( ٤٥٠) پسپۆری ئەمەریکی بەشداربوون لە دانانی دا، لەوان ( د. دوان.ت. کیش) دەڵێ: بە پێی تیۆری دروست بوون ژیان کت و پڕ دەرکەوتووە، بێ پەرەسەندن و پەیتا پەیتا کە تیۆری پەرەسەندنی داروینی بڕوای پێیەتی، گوایە لێرەدا زنجیر بەندی و پەرەسەندن هەیە لە جۆرە نزمەکانەوە بۆ جۆرە ئاڵۆز و پەرەسەندووەکان.

ژیان لە ڕێگای گردکارەوە بە دیهاتووە لە تۆماری بەردینەکاندا هیچ شێوەیەک ژیانی سەرەتایی زیندەوەران لە شێوەی سەرەتایی بۆ شێوەی پەرەسەند و نابینرێت/ هل تعرضت لغسیل الدماغ/ د. دوان. ت. کیش/ل: ٢٦٤-٢٦٥/سەیر بکە/ت: اورخان محمد علی.

کەواتە: بوونەوەرو ژیان بە ( کن فیکون) دەرکەوتوون بێ پەرەسەندن.

طِينٍ۝ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ۝ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ۝﴾ السجدة

واتە: هەموو شتێکی بە جوانترین و تەواوترین شێواز دروست کردووە، سەرەتا مرۆڤی لە قوڕ دروست کردووە۝ پاشان وەچەی ئادەمیشی دروست کردووە لە ئاوێکی بێرێز کە مەنی ژن و پیاوە۝ دوای ئەوەی کە ئادەمی دروست کردووە ڕێکیخستووە و ڕۆحی خستۆتە بەری، خوای گەورە هەستەوەرەکانی بیستن و بینین و دڵی بە پێ بەخشیوون، بەڵام کەمێکتان هەیە کە شوکرانە بژێری ئەو نیعمەتانەی خوای گەورە بکەن۝

لێرەدا زۆر بەڕوونی و جوانی هەست بە قۆناغەکانی پەرەسەندن دەکەین بە ئاراستە کراوی لە لایەن پەروەردگارەوە(٢٨).

وردکردنەوەیەکی زیاتر لە د. عەمر شەریفەوە

خۆڵ (التراب ) چییە؟ قوڕ (الطین ) چییە؟ قوڕی ترشاو بۆگەناو (الصلصال) چییە؟

خوای پەروەردگار لەبارەی مرۆڤ دەفەرموێت: بێجگە ئاو لەچەند ماددەیەکی تر پێکهاتووە

یەکەم: خۆڵ: خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ۝﴾ الروم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٢٨) فرانک ئالن بایۆلۆجی ئەمەریکی دەنووسێ:

( پرۆتینەکان پێکهاتەی سەرەکی تەواوی خانە زیندەوەرەکانی زیندەوەرانن، کە لە پێنج توخمی سەرەکی پێک دێن: کاربۆن، ئۆکسجین، نایترجین، هایدرۆجین، گۆگرد، هەر گەردێک لە (٤٠٠٠٠) گەردیلە پێک دێت)

( پرۆتینەکان کەرەستەی کیمایی بێگیانن، تەنیا ئەوکاتە گیانیان بە بەردا دەکرێ، کە ئەو ڕازە دەڕواتە ناویان، کە هیچ لە نهێنی یەکانی تێ ناگەین، تەنیا عەقڵی بێ سنورە، خوای تەنیا توانیویەتی بە دانایی بێ سنوری پەی بەو گەردە پرۆتینی یە ببات و کە بە کەلکی ئەوەی دێ ببێ بە ئارامگای ژیان، بۆیە بنیاتی ناو کلیشەی بۆ کێشاو نهێنی ژیانی بە بەردا کرد). الله يتجلى في عصر العلم/ جون کلوڤر مونسا/ل: ٩-١ سەیر بکە.

﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ۝﴾الحجر

واتە: یەکێك لە نیشانەکانی تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە لەسەر زیندووبوونەوە ئەوەیە کە ئێوەی لە خۆڵ دروست کرد، پاشان خوای گەورە ئێوەی نەوەی ئادەمی لەسەر زەویدا بڵاو کردۆتەوەو زۆر بوونە.

دووەم: قوڕ: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ۝٧﴾ السجدة

واتە: کە هەموو شتێکی بە جوانترین و تەواوترین شێواز دروست کردووە، سەرەتا مرۆڤی لە قوڕ دروست کردووە.

سێیەم: قوڕی لینج و ترشاو: پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ۝١١﴾ الصافات

واتە: ئەی محەمەد ﷺ پرسیار لە کافران بکە ئایا دروستکردنی ئەوان گەورەترو بەهێزترە، یاخود ئەو زەوی و ئاسمان و فریشتەو دروستکراوە گەورانەی کە دروستمان کردووە، کە دان بەم شتەدا دەنێن ئیتر بۆ باوەڕتان بە زیندووبوونەوە نیە؟ ئێمە ئادەممان دروست کردووە لە قوڕێکی لینج کە ئەنووسێ بە دەستەوە، واتە: مرۆڤ دروستکراوێکی لاوازە بۆ باوەڕیان بە زیندووبوونەوەو تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە نییە.

چوارەم: قوڕێکی ترشاوی بۆگەنی ڕەش: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ۝٢٦﴾ الحجر

واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە لە قوڕێکی وشکی لووس، مەبەست پێی ئادەمە (حَمَإٍ) واتە: قوڕێکی ڕەش (مَسْنُون) واتە: گۆڕاو، یەکەمجار قوڕە دواتر کە بۆگەن ئەکات و ڕەنگ و بۆنی ئەگۆڕێت پێی ئەوترێ(حَمَإٍ مَسْنُونٍ) کاتێك کە وشك ئەبێتەوەو لووس دەبێت ئەو کاتە پێی ئەوترێ: (صَلْصَالٍ).

پێنجەم: قوڕێکی ترشاوی وشک بووەوە وەکو فەخفوری، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ۝١٤﴾ الرحمن

واتە: خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە واتە ئادەم لە قوڕی سوورەوەکراو کە قوڕێك بە ئاگر سوور ئەکرێتەوە وەکو چۆن ئەوانەی کە کوپەڵەو گۆزەو شتیان لێ دروست ئەکرێ.

ئەم پێنج قۆناغە کە هەموو باسی دروستبوونی بنەڕەتی مرۆڤە و هیچ لەدوور و نزیک پەیوەندی بەئادەمەوە نییە، بەڵکو خۆڵ و قوڕ ...هتد، هەموو ئاماژەن بۆ پەرەسەندنی زیندەوەران بەگشتی.

هەموو ئەمانەی ئاماژەمان پێکرد، ئەو خوێندنەوە سادە نیە، کە خەڵکانێک وا دەزانن مرۆڤ لە کورەیەکی سیرامیکیەوە دروست بووە و خێر کەوتۆتە ڕێی، ئەم بیرکردنەوە زۆر سەرەتاییە بۆ خەڵکێکە کەتوانای بیرکردنەوەی نەبووە لە کۆندا ئاستی زانست بەشێوەی ئێستا پێشکەوتوو نەبووە، ئاسایی بووە بۆ سەدەکانی ڕابردووو، بەڵام لەئێستادا بەو بیرکردنەوە بیر لە قورئانی خوا بکەینەوە بەڕاستی جێگای شەرمە، کە دەبێت بەلای کەمەوە بزانین ئەو قۆناغانە بریتیین لە:

ماددەی نازیندوو پاشان بۆ ماددەی ئەندامی و پاشان بۆ پێکهاتنی پێکهاتەکانی ژیان بۆیان گەردە زیندووەکان و پاشان بۆ خانەی زیندوو، چونکە خوای گەورە بیرمان دەخاتەوە کە ڕۆژانێک بوو هەر ناویشی نەبراوە لەباسکردندا نەبووە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا۝١﴾ الإنسان

واتە: بە دڵنیایی ماوەیەك لەسەردەم و کات بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە کە هیچ شتێك نەبووە تا باس بکرێ و بوونی نەبووە، ئادەم سەرەتا پێش ئەوەی دروست بکرێ بوونی نەبوو و باس نەکراوە، یاخود مەبەست پێی مرۆڤە پێش ئەوەی کە دروست بێ وجوودو بوونی نییە.

## پوختەی باس:

ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکەم مرۆڤ نەبووە، بەڵکو یەکەم پێغەبەر بووە کە نازناوی بەشەری هەڵگرتووە، خوای گەورە کە باسی دروستبوونی مرۆڤ دەکات دوای قۆناغی ئینسان بوون، داوای کرد لە فریشتە ڕێز بنوێنن بۆ بەشەر، ئەو بەشەرەیش ئادەم بوو یەکەم پێغەمبەر بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ۝٢٦ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ۝٢٧ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ۝٢٨ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ۝٢٩﴾ الحجر

واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان دروست کردووە لە قوڕێکی وشکی لووس، مەبەست پێی ئادەمە (حَمَإٍ) واتە: قوڕێکی ڕەش (مَسْنُونٍ) واتە: گۆڕاو، یەکەمجار قوڕە دواتر کە بۆگەن ئەکات و ڕەنگ و بۆنی ئەگۆڕێت پێی ئەوترێ(حَمَإٍ مَسْنُونٍ) کاتێك کە وشك ئەبێتەوەو لووس دەبێت ئەو کاتە پێی ئەوترێ: (صَلْصَالٍ)﴿٢٦﴾ جنیشمان دروست کردووە لە پێش ئادەمدا لە ئاگرێك کە گڕو بڵێسەی هەیە، مەبەست پێی ئیبلیسە، بۆیە پێی ئەوترێ: (الْجَانَّ) یان جنی لەبەر ئەوەی لەبەر چاو دیار نییە﴿٢٧﴾ کاتێك پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو: من مرۆڤێك دروست ئەکەم لە قوڕێکی وشکی ڕەشی گۆڕاوی لووس﴿٢٨﴾ کاتێك کە شێوەکەیم ڕێکخست و ڕوحم کردە بەری ئێوە هەموتان کڕنووشی بۆ بەرن کڕنووشی ڕێزو سڵاو کردن نەك عیبادەت﴿٢٩﴾

جا هەڵەی زۆرێک لە ڕاڤەکەران تێکەڵکردنی (الانسان و البشر )ە ئینسان و بەشەر جیاوازن!

کەواتە مەبەستەکە لە ئادەمە لە بەشی بوون بە بەشەردا، بەڵام لە بەشی ئینسانەکەدا، دوورە لە ئادەم، نموونەی

قورئانیمان هێنایەوە کە وتمان پێغەمبەران بە بەشەر ناویان هاتووە لە قورئاندا.

کەواتە ئادەم مرۆڤێکی کامڵی ئاسایی بووە هەڵبژێراوی خوای گەورە بوو بۆ پێغەمبەرایەتی و خاوەنی دایک و باوک بووە لە کۆمەڵگایەکی زۆر سەرەتاییدا ژیاوە لەناوچەکانی نێوان سند و هیندستانی ئەمڕۆدا لەنێوان هەردوو ڕوباری (سەیحون و جەیحون).

## جیاوازی نێوان ئینسان و بەشەر

وشەی: ئینسان لەکرداری (انس: واتا ئاشنایەتی و ناسین و دڵنیایی پاشان بەمانای سۆزداری دێت و هەروەها دڵنیایی پێدان هاتووە یاخود وەرگیراوە، هەروەها پێچەوانەی دوورکەوتنەوەیە لە ژیان و بەتەنها ژیان، بۆیە ئینسان کائینێکی کۆمەڵایەتییە، حەزی بە پێکەوە ژیانە، ژیانی کۆمەڵایەتی دەیەوێت دەستەبەر بکات، تا پێداویستییەکانی پڕبکاتەوە، هاوسۆزی بۆ یەکتر دەربڕن.

وشەی: بەشەر، بەواتەی (بشرة ) واتا پێست دێت کە پێستی مرۆڤ کە چۆتە قۆناغی بەشەر بوون جوان و ڕێک و پێکەو و خاوەنی جوانی قامەتی تایبەتییە لە هەموو گیاندارەکانی تر، یاخود بەواتای دەرکەوتنی پێستی دەم و چاو دێت کە دەرکەوتوو و جوان و شۆخ و قەشەنگە.

بەداخەوە لەناو زمانی کوردیدا وشەی بەشەر ئەڵتەرناتیڤی نییە، وەکو ئینسان، مرۆڤ، بەنی ئادەم، ئادەمیزاد، بەڵام بەشەر، پێناچێت بەرانبەری لەزمانی کوردیدا هەبێت.

## ئاگاداری
## پێش ئەوەی بڕۆینە ناو ڕووداوەکان

بۆیە پێش چوونە ناو قوڵایی باسەکانی ژیانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) پێویستە ئاگادارییەک بدەین بە خوێنەرانی موحتەرەم، بەڕێزان لێرەدا من چیرۆک ناگێڕمەوە، یان ڕووداوێک کە کاتی بەسەردا تێپەڕیوە، باسکردنی خۆشە، یاخود شارەزا بوون نییە بەتەنها لەژیانی پێغەمبەران، مێژوو نییە بەتەنها وابزانیت من سەردی مێژووی باس دەکەم، یان باسی ڕووداو و باسەکانی بیر و باوەڕ و کاری پێغەمبەران چی بووە، باسی ئەوەنیە بەتەنها کە چۆن شارستانییەت و کاری دوای ناسینی خوای پەروەردگار چی تر بووە، لێرە لەهاوشانی پێغەمبەران نەیار و دوژمن و ململانێکانیان باس دەکرێت، واتا هەوڵ ئەدەین هەموو ئەوانەی باسمان کرد لەم کتێبەدا کۆبکەینەوە، لەسەر و ئەوانەشەوە، قسە دەکەین بۆتۆ، چونکە بۆتۆ نووسراوە، دەبێت لەگەڵی ئاوێتە بیت، کورت و پوخت پەروەردەت دەکات بەڵام بۆچی دەبێت لە مێشکی خۆتدا بپرسیت بۆچی پەروەردەت دەکات؟ پەروەردەرت دەکات کە چۆن بتوانیت گۆڕانکاری بکەیت، لات سەیر نەبێت، وادەڵێم ژیانی ٢٤ کەسی ناوازە کە خوای پەروەردگار هەڵیبژاردوون هەروا شتێکی سادە و سانا نییە، بۆ تۆیە و بۆ نەوەکانی دوای ئێوەشە تا ڕۆژی قیامەت، وا هەست نەکەیت تەنها سەرگوزەشتە دەخوێنییەوە.

هەرگیز نا؛ بەڵکو بزانە مەنهەجی ژیانت دەخوێنیتەوە کە ئەتگەیەنێتە ئاستی لوتکە و هێز و توانای زیهنی و عەقڵی تەنانەت ڕۆحیت بەهێز دەکات، کەواتە من بۆیە خۆم ماندووکردووە کە پاداشتەکەی لەخوا وەردەگرم، بەڵام دەمەوێت لە کەسی تر نەچم، پێشتر دەیان زانا و مامۆستا و نووسەر ژیانی پێغەمبەرانیان نووسیوە، زۆربەیان لەیەک دەچن، بەڵام من هەوڵم داوە لەکەس نەچم و لەخۆم بچم، ئەمەوێت شتێک بدەم بەتۆی خوێنەر کە پێشتر لات نەبووە، لانی کەم بەو شێوەیەی من کە باسم کردووە نەت بیستووە، ئەم ئامانجەش گرنگە، چونکە مرۆڤ بە سروشت حەزی بەشتی دووبارە نییە هەمیشە حەز بە نوێگەری دەکات.

کەواتە لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەی زۆرم بەکارهێناوە، بەڵام لەکەس ناچم تەنها ئێنەرجی (توانا)ی خۆم بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی تۆی خوێنەر تێبگەیت، خوای گەورە لێمان قوبوڵ بکات، لەم زیندانی طاغوتانەوە، کە چەندە ئازاری دەروونیم ئەدەن ماوەی دوو هەفتە، قەڵەم و وەرەقەم لێبڕا هەر بۆ ئازاردانی من، نەیاندەهێنا تا بیکڕم، ناچار لە هاوڕێیانی زیندان قەڵەمم

پەیدا کرد، بەڵام وەرەقەیان نەدەهێنا بۆم، منیش ناچار لەسەر کاغەزی دەستە سڕ وکلێنسی تەوالێت دەستم کرد بە نووسین، پاشان بە سەرۆکی بەشی زیندانەکەم وت، ئەگەر زوو وەرەقەم فریا نەخەن دیوارەکانیش ڕەش دەکەمەوە، تا دوای دوو هەفتە، هەموو شتێکم بۆ هاتەوە.

برای من، خوشکی خۆم، من منەت ناکەم بەسەر کەسدا، بەڵکو بۆ خۆم و بۆ پاداشتی قیامەتی خۆم دەنووسم، بەڵام بزانن ئەم کتێبە زۆر بە ماندووبوون لەدایک بووە ژانی زۆری هەبوو، خوای گەورە لەمنیش و ئێوەشی قوبوڵ بکات، زۆر جار قەڵەم و وەرەقەم واتا دەفتەرێکم بە ١٠ دۆلار کڕیوە، زانیویانە من پێویستمە قۆرخیان کردووە، لەو کاتەی من پێویستم پێبووە گرانیان کردووە لەسەرم، هەروەکو وتم منەت نییە، بەڵام دەمەوێت بزانیت کە

ماندووبوونی دەویست، نووسین لەم زیندانەدا بێجگە لەوەی کە چۆن چاویان لەسەرم بوو وایان دەزانی پیلان بۆ هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنێم، پاشان جاری وا هەبوو خۆشی ناو هاوڕێکانی زیندانم واز لێ دەهێناو دەگەڕامەوە سەر نووسین، سوێند بەخوا منەت نییە، بەڵام حەز دەکەم بزانیت زۆر بەدڵ بۆم نووسیویت، تۆش بەدڵ بخوێنەرەوە، جاری واهەبووە، حەزم لە چای یاخود قاوە، یان هەر شتێکی خۆش بووە ئەو پارەیەی کە بۆم هەبوو خەرجی بکەم دەمدا بە قەڵەم و کاغەز، ئەمەش مانای منەتبارکردنی تۆ نییە، بەخوای موتەعال، بەڵام دەمەوێت بزانیت بە ئازارەوە نووسیومە، تکا دەکەم تۆ بە ئیسراحەت بیخوێنەوە لەجیاتی من قاوە و چای لەگەڵدا بخۆرەوە، بڕۆین بۆناو باسی پێغەمبەران.

## ئادەم وحەوا کێن؟[٢٩]

ئادەم وەکو هەموو مرۆڤێک لەدایک و باوکیەوە هاتووە، بەڵام یەکەم ناسینی مرۆڤایەتی ئادەم بووە کە خوای موتەعال پێیناساندووین، خاتوو حەوای خێزانی ئەویش وەکو هەموو ئافرەتێکی تر لەدایک و باوکەوە هاتووە، دوو ناسراوترین کەسی یەکەمی جیهان، پێش ئەوان

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٩] زانایانی شوێنەوار و چاڵێن بڕوایان وایە: مرۆڤی سەردەم، کە ئێمە بەشێکین لەوان لە ڕابردوودا مرۆڤی تریان لە پێشدا هاتوو، بەلام بەرلەوەی مرۆڤی نوێ شوێنیان بگرێتەوە لەناو چوون.

مرۆڤی هەزارە ( انسان الفية) شاندی بریجیت سینوث ساڵی (٢٠٠٠) دۆزییانەوە، مێژووی بۆ ( ٦٠٧) ملیۆن ساڵ دەگەڕایەوە.

بەڵام مرۆڤی ژیر ( العاقل) مێژووی بۆ (١٥٠٠٠٠-١٣٠٠٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوە.

تاريخ الوجود/ د- احمد محمد كنعان/ ل: ١٢٦-١٢٧.

بێگومان لە ئەشکەوتی شانەدەر توانرا کەللەسەرێکی ئەو مرۆڤە ژیرە بدۆزرێتەوە، وەک ( د.زغلول النجار) لە کتێبی ( الإنسان) دا ئاماژەی پێ کردووە، هەروەها ( طه باقر ) لە کتێبی ( مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة) دا.

نە مرۆڤایەتی نە مێژوو نە زانستی تر، نەگەیشتۆتە ئەوەی کەناوی یەکەم بەشەر تۆمار بکات بێجگە ئایینی خوا. لەسەر شوێنەواری سۆمەری، خەتی بزماری باسی ئادەم و حەوا کراوە و وێنەیان کێشراوە، هەروەها لە شوێنەواری میسریەکاندا بەهەمان شێوە ناوی هەردووکیان هاتووە کە کۆنترین شارستانییەتی جیهانن.

ڕایەکی لاواز هەیە کە گوایە تۆمارکراوی شوێنەواری هیندستانە کە ئادەم پێش حەوا خێزانێکی تری هەبووە بەناوی (لیلیس یاخود لیلیث)، ئەمەش پێدەچێت ئەفسانە بێت، چونکە لە ئێستادا کۆمەڵەی زۆری بەو ناوەکراوەتەوە لە ڕۆژئاوا بەگشتی و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە گوایە (لیلیث) هەستی بەوەکردووە کە هیچی کەمتر نەبووە لەئادەم وەکو ژنێک بڕیاری سەربەخۆی داوە، هەندێک لەو ئەفسانە دەڵێت گوایە لەگەڵ ئیبلیس دەستی خیانەتی تێکەڵ کردووە و دژایەتی ئادەمی کردووە، هەرچەندە نووسینی زۆری لەسەر نووسراوە، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامی پشت ڕاستی نەکردووەتەوە.

خاتوو حەوای خێزانی پێغەمبەر ئادەم لە فەرموودەیەکدا (بوخاری) هێناویەتی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بردووە بەوەی کە خیانەتی کردووە لە حەزرەتی ئادەم، خیانەتەکەشی بریتیبووە لەوەی کە ئامۆژگاری سەرکەشی ئادەمی نەکردووە لەکاتی خواردنی دارە حەرام کراوەکەدا[٣٠].

ئادەم پیاوێکی جوانخاسی قامەت ڕێک بووە، لەفەرموودەدا هاتووە کە باڵای ٦٠ هەنگاو بووە، پانی ٧ هەنگاو بووە، بەهەرحاڵ دەبێت پێوەری هەنگاوەکە بزانرێت، چونکە مرۆڤ ناگاتە ئەو ئاستە لەڕووی زانستییەوە، بەڵام فەرموودەکە ڕاستەو لە (بوخاری و موسلیم و ئەحمەد) هاتووە، ئەو پێوەرە کە کراوە پێوەری سەردەمی ئادەمە وەکو چۆن پێوانەی پێکامان بۆ پێڵاو بە گەنم پێوراوە نەک پێوانەی ماتماتیکی وەکو (ملم و سانتیم و مەتر ) بەڵکو ئەگەر قاچێک قاڵبی ژمارەکەی ٤٢ یان ٤٣...هتد پێوەرەکەی گەنمە لە ئەمڕۆدا، پێدەچێت ئەو (ذراع)ە جۆرێک بێت لە پێوانە کە ئادەمیش هەر شێوەیەکی ئاسایی هەبووە، بەڵام ناوی پێوانەکە جیاوازە لەهەنگاوی ئاسایی (والله اعلم)[٣١].

---

[٣٠] عَنِ النبي ﷺ ... ولَوْلَا حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا/صحيح البخاري.

[٣١] حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا) وجاء في رواية الترمذي وجماعة بإسناد فيه بعض اللين، أما العرض فسبعة أذرع.

چونکە قامەتی وا بەرز لەگەڵ شێوەی پەیکەری مرۆڤدا ناگونجێت بە پێوەری هەنگاوی ئێمە، بۆیە دروستە بڵێین جۆرێکە لە پێوانە. (والله اعلم).

ئادەم لە وڵاتی هیندستان لەدایک بووە لەگەڵ خاتوو حەوادا هاوسەرگیری کردووە، ئەبو جەعفەری طەبەری لە

مێژووەکەیدا دەڵێت ٢٠ منداڵ یاخود ٢٠ سکی کردووە، واتا خاوەنی ٢٠ منداڵ بووە، هەروەها تەمەنی حەزرەتی ئادەم ١٠٠٠ ساڵ بووە، یاخود ٩٦٠ ساڵ بە گوێرەی ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو جەعفەری طەبەری ڕیوایەتی کردووە لە مێژووەکەیدا، ئەم ساڵانەش بە ڕۆژمێری سەردەمی خۆیان پێوراوە، کە دەشێت ١٠٠ ساڵ یان کەمتر بێت، ئەویش لە فەرموودەکەی طەبەری وەرگیراوە، چونکە سەرچاوەیەکی ئەوتۆ لەبەردەست نییە بۆ ڕۆژمێری سەردەمی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ.

جێگای ئاماژە پێکردنە ئەو فەرموودانەی کە هاتوون لەبارەی تەمەنی ئادەم، هیچی لە سەرچاوەی فەرمووده

ڕاستەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەژمار نەکراوە، یاخود بەندە بە خزمەتی نەگەیشتوم. لەو سەرچاوانەی لەبەردەستی بەندەدایە هیچی پشت ڕاست نەکراوەتەوە، تەحقیقی لێنەکراوە بگرە لەژیانی پێغەمبەرانی ئیبن کەثیردا کە لە لایەن (قاضی الشیخ محەمەد بن احمد کنعان) تەحقیق کراوە هیچ ئاماژەی پێنەدراوە.

یەکێک لەو فەرموودانە کە ئیبن ئەسیر هێناویەتی و لە مێژووەکەیدا ئەویش لە ئەبو جەعفەری طەبەری وەرگرتووە[٣٢].

هەروەها لە ٢٥ جێگادا لە قورئاندا باسکراوە یاخود ٢٥ ئایەت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٢] لَمَّا نزلت آيةُ الدَّيْنِ قال رسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إنَّ أولَ من جَحَدَ آدمُ عليهِ السلامُ أو أولُ من جحد آدمُ إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ لَمَّا خلقَ آدمَ مسح ظهرَهُ فأخرج منه ما هو من ذُراريْ إلى يومِ القيامةِ فجعل يَعرضُ ذريَّتَهُ عليهِ فرأى فيهم رجلًا يُزهرُ فقال : أيْ ربِّ مَن هذا قال : هذا ابنُكِ داودُ قال : أيْ ربِّ كَم عمرُه قال : ستونَ عاما قال : رب زِدْ في عمرِه قال : لا إلا أن أزيدَه من عمرِكَ وكان عُمْرَ آدمَ ألفَ عامٍ فزادهُ أربعين عاما فكتب اللهُ عزَّ وجلَّ عليهِ بذلك كتابًا وأشهدَ عليه الملائكةُ فلمَّا احتضرَ آدمُ وأتتهُ الملائكةُ لتقبضَهُ قال : إنه قد بَقِيَ من عُمُري أربعونَ عامًا فقيل : إنك قد وَهَبتَها لابنِك داودَ قال : ما فعلتُ وأبرزَ اللهُ عزَّ وجلَّ عليه الكتابَ وشَهِدتْ عليه الملائكةُ.

## بەهەشتەکەی ئادەم تێیدا نیشتەجێ بوو

خوای پەروەردگار ئادەمی لەسەر زەوی دروست کردووە و نیشتەجێی کردووە[٣٣]، بە بەڵگەی ئەوەی کردویەتییە جێنشین لەسەر زەوی، خوای گەورە پاک و بێگەردەو هەڵە ناکات وتەکانی دژی یەکتر نییە.

لە گفتوگۆ بەناوبانگەکەی نێوان خوای موتەعال و فریشتەکان، خوای پەروەردگار دەست نیشانی جێگای ئادەم دەکات کە لەسەر زەوی جێنشینێک دادەنێت.

ئبن کەثیرا دەفەرموێت: جێنشین بەواتای پیادەکردنی فەرمانی خوا لەسەر زەوی، ئادەمیش یەکەم پێغەمبەر و مرۆڤی تەکلیف کراوە کە بەندایەتی خوای گەورە بکات.

ئەم ڕاسپاردانە بۆ بەهەشت نابێت، چونکە بەهەشت جێگای پاراستنە، لەبەهەشتدا بەندایەتی خەلیفایەتی پیادەکردنی شەریعەت نییە، پاشان بەهەشت دوای مردن و ڕۆژی لێپرسینەوە، کۆتایی قیامەت دەرگاکانی واڵا دەکرێت بۆ خەڵکی بڕۆنە ناوی کە ناسراوە بە بەهەشتی هەتا هەتایی (جنة الخلد) یەکەم کەسێک لە دەرگاکەی دەدات پێغەمبەری خوا محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، دەشێت و زۆر ئاساییە پێغەمبەران بەهەشت ببینن و لەلایەن خوای موتەعالەوە نیشانیان بدرێت، بەڵام نیشتەجێ نابن تێیدا وەکو پێغەمبەری نازدار صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە چوونی بۆ میعراج بەهەشت و دۆزەخی نیشاندراوە، ئەمەش بۆ پێغەمبەران زۆر ئاساییە خوای گەورە ئەنجامی بدات چونکە نیشاندانەکە، خۆی لەخۆیدا موعجیزەیە و هێنانەوەی هەواڵی یەقینە بۆ ئوممەتەکانیان. پاشان خوای گەورە شەیتانی دوورخستۆتەوە لە ڕەحمی(بەزەیی) خۆی و بۆ ئەبەدی لەدۆزەخدا دەمێنێتەوە، چۆن شەیتان دەتوانێت بڕواتە بەهەشت، کە خوای

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٣] بەڵام بە پێی ( كتاب المقدس) بە هەشتی یان باخچەی ئادەم لە دۆڵی دووزێ ( میزۆ پۆتامیا) بووە، کە هەمان شوێنی لەنگەری کەشتی نوح بووە ﴿... وَٱسْتَوَتْ عَلَى ...﴾ هود

لە( سفری ( التكوين) دا هاتووە: بەهەشتی ئادەم لە ناو چوار ڕووباردا بووە: ( جیشون، جیحون، دیجلە، فورات) التكوين/٢/١١-١٥

( ویلکۆکس/ دوای ئەوەی هاتە عێراق و تاقیکردنەوەی لە میزۆپۆتامیا کرد، کاتێ هات لەسەر داوای عوسمانییەکان بەنداوی هیندیەی دروست کرد (١٩٠٨) ئەو گوتی: میزۆپۆتامیا بەهەشتی ئادەم بووە، دراسة في طبيعة مجتمع العراقي/ د. علي والوردي/ ل: ٤١-٤٢.

لە کوردستاندا لە چەرمۆ و ئەشکەوتی شانەدەر و هەزارمێرد و شمشارە شوێنەواری مرۆڤی کۆن و کۆنترین شارستانییان تێدا دۆزراوەتەوە، وەکو ( طە باقر) لە کتێبی ( مقدمة في تأريخ حضارات القديمة) و ( د. زغلول النجار) لە کتێبی ( الانسان - و - الأرض) دا باسی کردووە، لە ئەشکەوتی شانەدەریش مرۆڤێ دۆزرایەوە بۆ ( ٧٠-١٠٠) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە

گەورە لە ڕەحمی خۆی دووری خستۆتەوە واتا مەلعون و لەعنەت لێ کراوە بەهەشت جێگای خواناسان و چاکەکاران و پیاوچاکانە بەگشتی.

لەبەهەشتدا هیچ شتێک قەدەغەکراو نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ۝٣٣﴾ الواقعة

واتە: میوەکان نە ئەوەتا لە کاتێك لە کاتەکاندا ببڕێت و نەمێنێت، یاخود قەدەغە بکرێن لێی، بەڵکو لە هەموو کاتێکدا بۆیان هەیەو بەردەوام و هەمیشەییە.

کە هیچ تێدا قەدەغەکراو نەبێت، ئیتر چۆن خوای پەروەردگار قسەی خۆی دەشکێنێت و دەفەرموێت: لەو دارە و بەروبوومەکەی مەخۆن؟

هەموو ئەم بەڵگانە، ڕاستی ئەوە دەردەخەن کە بەهەشتی ئاسمان نەبووە و هیچ پەیوەندی بەو بەهەشتەوە نییە، بەهەشتیش لە ئاسماندا، خوای گەورە کە دروستی کردووە، بنەڕەتی وەکو باخ و باخاتی سەر زەوی نییە، وشەی بەهەشت کە لە قورئاندا بە (الجنة) هاتووە، بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکانە واتا باخ و باخات، بەڵام وەکو بۆمان باس کراوە لە وەحیدا، نە بە خەیاڵ و نە بە ئەقڵدا هاتووە و بەهیچ شێوەیەک وێنا ناکرێت لە جوانی و پاکی و خۆشییەکانی.

بەهەرحاڵ، ئەو بەهەشتە خوای گەورە باسی دەکات باخ و باخاتی سەر زەوییە لە هیندستان لە ناوچەکانی کشمیر، وشەی (الجنة) بەکارهاتووە لە قورئاندا بەواتای باخ و باخاتە وەکو دوو هاوڕێکەی کە لە سورەتی الکهف باس کراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: یەکێکیان خاوەنی بەهەشت بوو - لێرەدا مەبەست لە بەهەشت باخ و باخات و دارستانەکانی سەر زەوییە، کە لە باسی داهاتوو زیاتر ڕوون دەبێتەوە خوای گەورە لەباسی دوو هاوڕێ کەدا دەفەرموێت: ﴿۞وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا۝٣٢ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا۝٣٣﴾ الكهف

واتە: ئەی محەمەد ﷺ تۆ نموونەی دوو پیاویان بۆ بهێنەرەوە کە یەکێکیان موسڵمانەو ئەوی تریان کافرە، کە کافرەکە دوو باخی هەبووە باخێکیان لە ڕەزی ترێ و دەوریشمان دابوون بە دار خورما، لەناو ئەو دارانەشدا زەرعاتی تر هەبووە هەردوو باخەکە بەرهەمی پێگەیشت و بەرهەمی هێنا۝٣٢ هیچ بەرهەمەکەی کەمی نەکرد بەردەوام بەرهەمی باشی ئەهێنا لەناویشیانەوە ئاومان هەڵقوڵاندبوو کانی بەناو باخەکاندا ئەڕۆیشت۝٣٣

پاشان سزادانی ئادەم و خێزانەکەی لەو باخ و باخاتەدا، گەڕانە بەسەر زەویداو کارێ سەختە کە لە هیندستانەوە بەڕێ دەکەوێت بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی بە جیهاندا تا دەگاتە میسر، چونکە ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە گەڕانی هەمیشەییدا بووە، بۆ بڵاوکردنەوەی فەرمانی خوا و شەریعەتەکەی، لەسەروو هەموویەوە بونیادی کەعبە و قودسی کردووە، ئەمەش هەموو لەباسی داهاتوودا، زیاتر ڕوون دەبێتەوە، وشەی (هبوط) بەواتای گواستنەوە دێت لەناوچەیەکە و بۆ ناوچەیەکی تر.

بەبەڵگەی قورئانی خوای گەورە بە بەنو ئیسرائیل دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾ البقرة

واتە: پاش ئەوەی کە خوای گەورە لە ئاسمانەوە ئەو خواردنانەی بۆیان ناردو ئەو ئاوە سازگارەی لەو بەردەوە بۆیان هەڵقوڵاند ئەوان وتیان: ئەی مووسا ئێمە ئارام ناگرین لەسەر تەنها خواردنێك و ڕۆژانە هەر ئەم خواردنانە دووبارە بێتەوە گۆشتی باڵندەو گەزۆ و ئاو، ئەی مووسا تۆ دوعا بکە لە پەروەردگارت با لە زەوی بۆمان بڕوێنێ لە بەقل: ئەوەیە کە قەدی نیە وەکو سەوزەوات: نەعناو کەرەوزو کەوەرو هاوشێوەی ئەوانە، خەیارو سیر یاخود وتراوە: گەنم، نیسك و پیاز داوای ئەم شتانەیان کرد، مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئایا شتێك کە باشترە ئەیگۆڕنەوە بە کەمتر، خوای گەورە ئەو ڕزقە باش و پاکەی پێتان بەخشیوە ئەیگۆڕنەوە بە سیرو پیازو پاقلەمەنی و سەوزەوات، دەی فەرموو بڕۆنە ناو شارێك لە شارەکانەوە، یاخود بڕۆنە میصرەوە ئەوەی کە داوای ئەکەن لە میصردا هەیە، بەڵام لەوێ زەلیلی و سەرشۆڕییە یاخود هەر ناتوانن بڕۆن، خوای گەورە جزیەو سەرانەتان لەسەر دائەنێ، هەر ئەبێ زەلیل و ڕیسواو سەرشۆڕ بن، بەتووڕە بوونی خوای گەورەوە گەڕانەوەو شایەنی ئەوەبوون کە خوای گەورە لێیان تووڕە بێت، لەبەر ئەوەی ئەمانە کوفریان ئەکرد بە ئایەتەکانی خوای گەورە، پێغەمبەرانیشیان (علیهم الصلاة والسلام) بە ناحەق ئەکوشت وەکو: زەکەریاو یەحیا، و هەوڵی کوشتنی عیسا پێغەمبەریشیان دا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خوای گەورە بەرزی کردەوە، چەند جارێك هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوایشیان دا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خوای گەورە پاراستی، ئەمیش بەهۆی سەرپێچی خۆیان و بەردەوام دەستدرێژییان ئەکردو سنووریان ئەبەزاند.

یاخود حەزرەتی نووح خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٤٨﴾﴾ هود

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ لە کەشتییەکە دابەزە بۆ سەر زەوی بە سەلامەتی و پارێزراوی لە سزای ئێمە، سەلام و بەرەکەتی خۆم ئەڕژێنم بەسەر ئێوەو ئەو ئوممەتانەیشی کە لە نەوەی ئەو کەسانەن کە لە کەشتییەکە لەگەڵتان بوون، کەسانێکی تر لە نەوەی ئەمانە کە دواتر کافر ئەبن لە دونیادا تا کاتی دیاریکراوی خۆیان ئەیانژیەنین، بەڵام پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی بە ئێش و ئازار ئەیانگرێتەوە.

کورت و پوخت: ئادەم و خێزانەکەی لەسەر زەویدا بوون، لە بەهەشتدا نەبوون، کاری ئادەم زۆر سەخت بووە، یەکەم پێغەمبەر بووە کە خواناسی بڵاوکردۆتەوە، خەڵکی فێری یەکتاپەرستی کردووە، پاشان ڕاستکردنەوەی چەمکەکان و ناساندنی کاری کشتوکاڵ و دامەزراندنی ژیار و شارستانییەتی و پاشان هاوکاری کردنی یەکتری و هاوسۆز بوون و پێکەوە ژیان و ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی بونیادنانی خێزان و پەروەردەی منداڵ و ڕێکخستنی یاساکانی شەریعەت کە خوا دایەزاندووە بۆ مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە، (تێبینیەکی گرنگ)، زۆرجار نەیارانی ئەم بیر و بۆچوونانە بە وشەی (الجنة) کە گوایە لە هەموو جێگاکانی قورئاندا ئەو (ئەلف و لامە "ال") وەردەگرێت، بەڵام لەڕاستیدا وانییە، ئەمەش لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی نێوان من و مامۆستایەکی بەڕێز لە فەیسبوکدا، بەداخەوە ناوەکەیم بیرنەماوە، بەڵام جەنابیان وایان فەرموو کە نموونەی دوو هاوڕێکەم بۆ هێنایەوە ئایەتی ٣٢ لە سورەتی الكهف، بەڵام جەنابیان فەرموویان گوایە (الجنة) هەموو الف و لامی وەردەگرن، لەڕاستیدا خوای گەورە باسی بەهەشتی ئاسمانی کردووە لە ڕەسمی نووسینەوەی زمانی عەرەبییدا ئەلف و لامی وەرنەگرتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴿٤٦﴾﴾ الرحمن

واتە: ئەوانەیشی ترسی ڕاوەستانی ڕۆژی قیامەتیان هەیە لەبەر دەستی خوای گەورە ئەوانە دوو بەهەشتیان بۆ هەیە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴿٨٩﴾﴾ الواقعة

واتە: ئەمانە ڕوحیان بۆ هەیە لەگەڵ ڕێحاندا (رَوْحٌ) واتە: پشوو ئەدەن لە دونیا، یان دڵخۆش ئەبن، یان بەهەشتیان بۆ هەیە، یان ڕەحمەتیان بۆ هەیە.

جا هەستم کرد جەنابیان لە عەرەبەکانی وەرگرتبێت، ئەوەش وەڵامێکی شافی و کافی بۆ ئەوان، بەکۆ و تاک ئەلف و لامی وەرنەگرتووە، وشەی (جنة) یان (جنتان). کەواتە ئێستا بڕۆینە ناو قوڵایی باسی ئادەم و نەوەکانی و ململانێکەی

## ئادەم و ململانێی شەیتان

ڕاستی ڕووداوەکە لە ئادەمەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو لە مەخلوقێکی ترەوە دەست پێدەکات کە ناوی جنۆکەیە، ئادەم هیچی لەبارەی ئیبلیسەوە سەرەتا نەزانییوە، تا ئەو کاتەی خوای گەورە ئاگاداری کردەوە، ئەویش بە قسەکانی هەڵخەڵەتا و لەبیری چوو کە خوای پەروەردگار چی پێ فەرمووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴿١١٥﴾﴾ طه

واتە: دڵنیایی ئامۆژگاری و وەسیەتمان بۆ ئادەم کردبوو لە پێشتردا کە لەو دارە نەخوات، بەڵام ئەو لەبیری کردو شەیتان خەڵەتاندی، نەمان بینی کە عەزیمەتی هەبێ لەسەر ئەو شتە، ئێمە بە فریشتەکانمان وت: کڕنووشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن.

باسی لە بیرچوونەوەی ئادەم دەکات و زیاتر ڕوونی دەکاتەوە بەدوایدا نهێنی ململانێکە لە کردن بە جێنشینەوە واتا (خەلیفە)وە دەست پێدەکات. زەوی جێگایەکی جوان و نایابە لە گەردوونی خوای پەروەردگاردا، پێشتر هەردوو کۆمەڵی مەخلوقاتی تەکلیف لەسەردانراو فریشتە و جنۆکە، خۆیان ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی کامیان ببنە جێنشینی خوای پەروەردگار لەسەر زەویدا، فریشتە بە بەندایەتی و تەسبیحاتی، جنۆکە بە دڵسۆزی و پاککردنەوەی هەندێک مەخلوقی تر کە ناویان بە (البن) هاتووە کە پێش (الانس) و (الجن) بوونیان هەبووە،

جنۆکە توانیویەتی سەربکەون بەسەریانداو پاشان هەر جنۆکە بەشێکی زۆریان خراپە کاربوون کە بەشە باشەکەی جنۆکە ئەوانیشیان ڕاوناوە بۆ کەناری دەریاکان وەکو ئەو هەواڵەی کە لە (البداية والنهاية) ئیبن کەثیردا هاتووە کە گوایە لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەت کراوە.

پاشان لە ئیبن مەسعوودەوە دەڵێت: لە هەندێک هاوەڵی تریشەوە، کە لەسەرەتای باسی دروستکردنی جنۆکە و ڕووداوی شەیتان هێناویەتی، هەروەها ناوی ئیبلیس لە بنەڕەتدا (عەزازیل)ی ناو بووە.

بنەڕەتی ململانێکە دەگەڕێتەوە کام لەو سێ دروست کراوە دەبنە خەلیفە هەربۆیە کە فریشتەکان خوای گەورە هەواڵیان ئەداتێ کە مرۆڤ دەبێتە خەلیفە و پێشتر بینیویانە، مرۆڤ خوێنرێژ بووە دوور بووە لە بەندایەتی و خواناسی بۆیە لایان سەیر بوو، بەسەرسامییەوە وتیان، چۆن ئەوان دەکەیتە خەلیفە لە کاتێکدا ئێمە لە گوێڕایەڵی و فەرمانی زاتی بەرزت دەرناچین.

فریشتەکان وا پەییان برد، کە خەلیفە بوون لەسەر زەوی بە بەندایەتی زۆر و گوێڕایەڵی فەرمان نەبەزاندنە

چونکە ئەوان مەخلوقاتی دوور لە شەهوەت و نەفس و ئارەزوون، خۆی لە خۆیدا ئەمەش بەشێکە لە کەمی، چونکە گرنگە ئەو مەخلوقە حەزی هەبێت و ئارەزووی هەبێت، بەڵام لە پێناوی خوادا وازی لێ بهێنێت، خوای گەورە وا دروستی کردووە کە تەنها بەبەندایەتی و گوێڕایەڵی ژیانی خۆیان بکەین، ئەوان بەو جۆرە سیستەمە بەدی هاتوون، کەواتە چونکە بنەڕەتیان گوێڕایەڵییە، خێرا گوێیان گرت لە فەرمانە خواییەکە، شێوەی پرسیارەکەش وەکو سەرسامی بوو، نەک ڕەخنەگرتن سیستەمی ژیانی فریشتە، تەنها گوێڕایەڵی و پابەند بوونە بە فەرمانی خوای پەروەردگاریان، کەواتە مەخلوقی دووهەم دێتە ناو شانۆی ژیانەوە و ئەوان ململانێ دەکەن مرۆڤ پێشتر توانای ئاوەدانی نەبوو، چونکە سەرەتایی بوون هیچ ئاراستەی خوای و پەیام و پەیامبەریان نەبوو، بۆیە جنۆکە خۆی بە کاندیدی یەکەم دەزانی بۆ ئەو ئەرکە، لەپڕ ئاراستەکە گۆڕا بۆ مرۆڤ، ئادەم هاتە ناو شانۆی ژیان خوای گەورە هەڵیبژاردو بۆ ئەم کارە دروستی کرد.

فریشتەکانی ئاگادارکردەوە لەهەمان کاتدا جنۆکەشی لێ ئاگادار کردۆتەوە لە ڕێگای نوێنەرەکەیان کە (عەزازیلە)، بەڵام عەزازیل، ڕەخنەی هەیەو قیاس و پێوەری نەشیاو دەکات و دەکەوێتە بەرپەرچدانەوەی خوای کردگاری.

بەدیهێنەری هەموو بەدی هێنراوەکان، عەزازیل دەڵێت: من سوجدەی ڕێز و حورمەتی بۆ نابەم، چونکە من لەو باشترم، خوای گەورەش زوڵم لە هیچ مەخلوقاتی ناکات پێوەرەکانی عەزازیل لەناخیدا دەردەخات بۆ هەموو مەخلوقات و دەڵێت من باشترم، چونکە منت لە ئاگر دروست کردووە، ئەویش لەقوڕ، پێوەرەکەی ڕەگەز پەرستییە، پێیوایە ئەو باشتر لە خوا شارەزاترە (پەنا بەخوا).

خوای گەورە کە زانست فێری ئادەم دەکات و ئیسپاتی دەکات کە ئادەم باشترە، شەیتان ئەگەرچی هەڵەی کردووە، بەڵام ناگەڕێتەوە لە هەڵەکەی و بەردەوام دەبێت لەسەری، ئەمەش بووە هۆکاری دوورخستنەوەی لەو پلەو پایەی کە هەیبووە.

لوتبەرزی و خۆ بەزل زانی وای لێ دەکات، داوا دەکات لە خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی قسەی خۆی سەربخات

بەسەرخوادا (پەنا بەخوا)، تەمەنی بداتێ تا بۆ خوای گەورەی بسەلمێنێت ئەو لە مرۆڤ باشترەو ئەوەی لەگەڵیدایە زیاتر شیاوترن لەمرۆڤ، داواکەشی هەر فێڵە، کە داوای مانەوە دەکات تا ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوەی مردن نەبینێت، خوای پەروەردگار تەمەنی درێژی ئەداتێ، بەڵام تا ئەوکاتەی خوای موتەعال ویستی لەسەریەتی چونکە داوای مانەوە دەکات بۆ ڕۆژی زیندوو بوونەوە ﴿... فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ص

خوای گەورە دەفەرموێت: چاوەڕێ بە تا ئەوکاتەی بۆت دیاری دەکەم.

﴿قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ۞ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ﴾ الحجر

ئیتر لەوکاتەوە ململانێ لەنێوان شەیتان و مرۆڤ دەستی پێ کردووە، لە هەمووی خراپتر شەیتان تاوان ئەداتە پەنای خوا (پەنا بەخوا ) کە دەڵێت: تۆ منت گومڕاکردووە، منیش لە کەمیندا دەبم بۆیان لەسەر ڕێگای ڕاستی خواناسی زاتی الله، هەموویان گومڕا دەکەم.

دەقی هەموو ڕووداوەکە لە چەند جێگایەکدا لە قورئانی پیرۆز باس کراوە، ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ۞ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ۞ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّـٰغِرِينَ ۞ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۞ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ۞ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۞ ثُمَّ لَـَٔاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ ۞ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ الأعراف

واتە: ئەی ئادەمیزاد بە دڵنیایی ئێوەمان دروست کردووە پاشان وێنەمان کێشاون، پاشان بە فریشتەکانمان وت کە کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن، هەر هەموویان کڕنوشیان بردو فەرمانی خوای گەورەیان جێبەجێ کرد تەنها ئیبلیس نەبێت۞ خوای گەورە بۆ سەرزەنشتکردن و جێگیرکردنی بەڵگە بەسەریدا فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی ڕێگری لێ کردیت کە سوجدە بۆ ئادەم بەریت کاتێك کە من فەرمانم پێ کردیت؟ وتی: ئەی خوایە من لەو باشترم! منت لە ئاگر دروست

کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، ئاگریش لە قوڕ باشترە بەگومانی خۆی﴿١٢﴾ خوای گەورە فەرمووی: دەی لە ئاسمان یان بەهەشت یان ئەو پلەوپایەی پێتدرابوو دابەزە ئیتر تۆ نابێ لەناو مەلائیکەتاندا بیت بۆت نیە کە لە ئاسماندا یان لە بەهەشتدا خۆت بەگەورە بزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەی دەرچۆ لە بەهەشت، تۆ لەو کەسانەی کە ڕیسواو زەلیل و سەرشۆڕ ئەبیت﴿١٣﴾ ئیبلیس وتی: ئەی پەروەردگار بمهێڵەرەوە با نەمرم تا ڕۆژی زیندووبوونەوە، تا ڕۆژی قیامەت﴿١٤﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەوا مۆڵەتت ئەدەم و تۆ لەو کەسانەی کە ئەمێنیتەوە تا ڕۆژی قیامەت کە دونیا تێك ئەچێ بۆ ئەوەی کە خوای گەورە خەڵکی پێ تاقی بکاتەوە﴿١٥﴾ ئیبلیس وتی: خوایە بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕا کرد ئەبێ لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی تۆ دابنیشم و خەڵکی گومڕا بکەم﴿١٦﴾ پاشان ئەبێ بۆیان بێم لە پێشیانەوە هانیان ئەدەم بۆ دونیا، لە دوایانەوە گومانیان بۆ دروست دەکەم سەبارەت بە قیامەت، لەلای ڕاستیانەوە سستیان دەکەم لە چاکە کردن، لەلای چەپیانەوە خراپەو تاوانیان بۆ دەڕازێنمەوە، هەموو ڕێگاو هۆکارێك ئەگرمە بەر بۆ گومڕا کردنیان، ئەبێ ئەی پەروەردگار زۆربەی خەڵك نەبینی کە شوکرانە بژێری تۆ بکات، یان بەتاك و تەنها تۆ بپەرستن بەڵکو گومڕایان ئەکەم و لە ڕێگای ڕاست دەریان ئەکەم﴿١٧﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئیبلیس دەرچۆ لە ئاسمان یان لە بەهەشت بەزەمکراوی و بەدەرکراوی و ڕیسوایی، هەر کەسێك کە شوێن تۆ بکەوێ لە مرۆڤ و جنیەکان خوای گەورە سوێندی خوارد ئەبێ دۆزەخ پڕ بکەم لە ئێوە لە تۆ و شوێنکەوتوانت﴿١٨﴾

پاشان لە سورەتی (طه) و (البقرة)دا خوای گەورە باسی چالاکیە کوفرییەکانی شەیتان دەکات دژ بە ئادەم و خانەوادەکەی، چونکە جەنگی ئەو لەگەڵ مرۆڤی پابەندبوو دایە، ئەو دژی مرۆڤی خواناسە بەتایبەتی و پاشان هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی، بەڵام لە ڕابردووو و ئێستا و داهاتووشدا شەیتان ململانێکەی دۆڕاند، چونکە ئەوەی مرۆڤ توانی بیکات لەسەر زەوی هیچ مەخلوقێکی تر بۆی نەکراوە.

لێرەدا بۆچوونی خۆم دەخەمەڕوو، من وای دەبینم مادام شەیتان هاتە ناو گۆڕەپانی ڕووداوەکان، زەوی ئەو بەهەشتە بوو کە ئادەم تێدا نیشتەجێکرا، چونکە هەموو شتێکی تێدایە، مرۆڤ برسی نابێت و تینووی نابێت، دارەکەش حەرام کراوەکانە، کە ئادەم و خێزانی سنووریان بەزاند و حەرامەکەیان خوارد، ئیتر زەوی بووە جێگای ململانێ، ئەو بەهەشتە نەما کە پێشتر خوای گەورە بە ئارامی پێیبەخشین، مادام حەرامی تێدا هات مرۆڤ پێویستە لەهەوڵدا بێت بۆ کۆششکردن لەگەڵ شەیتان و بانگەوازی مرۆڤی تر بکات، تا لە بەهەشتی ئەم دنیادا بن و ڕێڕەوێک بێت بۆ بەهەشتی قیامەتی و ئەبەدی.

بەھەرحاڵ خوێندنەوەی بەندەیە بۆ ڕووداوەکان، بەڵام دێمەوە ناو خودی ڕووداوەکان، لە ئێستادا مرۆڤ کەوتە ململانێ لەگەڵ شەیتان و پاشان حەز و ئارەزووەکانی خۆی کە ناوی (نەفسە).

چۆن ژیان بە پەرەسەندن دەستی پێکرد خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ نوح

واتە: لە کاتێکدا خوای گەورە ئێوەی دروست کردووە لە چەند قۆناغێکی جیاوازدا: سەرەتا دڵۆپە ئاوێك بوونە، پاشان بوونە بە خوێنێکی مەیوو، پاشان بوونە بە پارچە گۆشتێك، پاشان تەواو دروستبوونە، پاشان لە دایك بوونە، ئینجا منداڵ بوونە، پاشان گەنج و پاشان پیری، ئەم هەموو قۆناغانە بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ ئێوە تا کەی ئیمان ناهێنن.

ئەمەش بەواتای لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر لە قۆناغێک بۆ قۆناغێکی تر کە پەرەسەندنە بە ئاراستەی خوای پەروەردگار، هەر بۆیە بە دواشیدا باسی گەردوون و دروست کراوەکان دەکات بەگشتی، بەهەمان شێوە مرۆڤ لە ڕووی نەفس و ڕۆح و ئەقڵەوە ئازادی پێ بەخشراوە، بۆ ئەوەی هەمووی دەستەمۆ بکات و وەکو فریشتەکان لە فەرمانی خودا بێت و گوێڕایەڵی بکات، پەیامی بۆ ناردووە، هەموو ئەمانە مرۆڤی گەیاندۆتە پلەی خەلیفایەتی، کە ڕێزی و پایەی بەرزکردۆتەوە کەواتە ڕێزی مرۆڤ یاخود سەرەتا ئادەم وەکو مرۆڤی ڕاسپێردراو بە خواناسی چەند توخمێکی پێبەخشراوە کە توخمەکان هەموو پەنهانین نەفس، ڕۆح و عەقڵ، پەیامی خوایی، ئازادی، ئەم توخمانە بەڕێزی کردووە کردویەتییە خەلیفە، هەموو ئەم توخمانە لەناو جنۆکەشدا هەیە بەڵام ماددەی مرۆڤ کە بنەڕەتی قوڕە زۆر بەهێزتر و باشترە لە جنۆکە کە پێکهاتەی لاشەی وزەیە، لە گڕی لوتکەی ئاگر دروست بووە کە پێی دەوترێت (لهب)، ئاگریش بە سرووشتی تێکدەرە و قوڕیش بە سرووشتی بونیادنەرە.

ئەمەش سەرەتای دوژمنایەتی و ململانێی شەیتان و نەوەکانی بوو لەگەڵ ئادەم و نەوەکانی کە دژایەتی ململانێکە ڕەگی قووڵی هەیە لە نێوانماندا.

## دەستپێکی مێژووی مرۆڤایەتی

هەرچەندە دەمانەوێت لە ڕووداوەکانی ژیانی ئادەم نزیک ببینەوە، بەڵام ناچار دەبین بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان بونیادێکی ئەکادیمی، زانستی و مێژوویی هەبێت، دەبێت خوێنەر بگەڕێنینەوە بۆ پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی لەسەر زەوی و ژیان چۆن گوزەراوە..

لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە کە خوای گەورە خەلقی کردووە لەسەر ئەم زەوییەدا، لە ناڕەحەتی و کاتی ناهەموار و ژیانی سەختدا ژیاوە، چونکە پێویستە ماندوو بێت، هەتاوەکو خواردن و خواردنەوە بەدەست بهێنێت، پێویستی بە هەوڵ و کۆششە تا بتوانیت جل و بەرگ و جێگای نیشتەجێ بوون بۆ خۆی دروست بکات و دەست بهێنێت، لە هەمانکاتدا پێویستی بە وریابوون و ئاگادار بوون بووە تا ئەمن و ئاسایش بەدەست بهێنێت. مرۆڤ لەسەرەتاوە زەحمەتکێش بووە، ئەمەش یاسای گەردوونی خوای موتەعالە لە ئاسمانەوە نە ئاڵتون دەبارێت نە زیو، بۆیە پێویست بووە لەسەر مرۆڤ هەمیشە لە هەوڵ و تێکۆشاندا بێت بۆ بژێوی ژیانی لە دنیا تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت، خوای پەروەردگار لە بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَـٰقِيهِ ۝٦﴾ الانشقاق

واتە: ئەی مرۆڤ ئێوە هەر هەموتان بە موسڵمان و کافرەوە لە دونیادا لە هەوڵ و تێکۆشاندان و بەرەو گەیشتن بە خوای گەورە ئەڕۆن وە هەر ئەبێ بگەن بە خوای گەورە، ئیتر ئەگەر کردەوەی باش بکەن یان خراپ ئەگەن بە خوای گەورە، خوای گەورە پاداشت یان سزاتان ئەداتەوە لەسەر کردەوەکانتان، واتە: ئێوە هەر هەوڵ ئەدەن با هەوڵ و تێکۆشان و ماندوو بوونتان لە چاکەو خێرو عیبادەت و گوێڕایەڵی خوای گەورەدا بێت.

هیچ کات مرۆڤێک بەتەنها نەژیاوە، بەڵکو هەمیشە لەگەڵ خێزاندا بووە، تەنانەت خوای گەورە کە باسی ئادەم دەکات لەگەڵیدا باسی خێزانی و منداڵەکانی دەکات، هەر ئەم خێزان و کۆمەڵە بچووکانە، هەر یەکە خاوەنی

بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بووە، بەدوای ئەوەدا گەڕاون کە چی باشە بۆ ژیانیان، واتا داواکاری و بەرژەوەندی پێکەوە گرێدراوە، زانیویەتی ئەوەی مرۆڤێک دەیەوێت مرۆڤی بەرانبەریش بە دوایەوە وێڵە، هەمان داواکاری هەیە بۆ نەفسی خۆی و خێزانەکەی، لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤی برایدا لە زۆر شت دا هاوبەشن لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی ڕای جیاواز لە نێوانیاندا هەیە، ئەم جیاوازی و ڕا جیاوازە تەنها لە ڕووی شێوەو شکڵەوە نا، بەڵکو لە

ڕووی داب و نەریت و زۆربەی بوارەکانی دیکەی ژیان، ئەمەش هەر سوننەتێکی خوای پەروەردگارە کە

لە قورئاندا بۆمان باس دەکات دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴿١١٨﴾﴾ هود

واتە: ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە هەموو ئوممەتی ئەکرد بە یەك و لەسەر حەق کۆی ئەکردنەوە، بەڵام خوای گەورە تاقیان ئەکاتەوە بەردەوام لە ئیختیلاف و جیاوازی و ناکۆکیدان.

لەڕاستیدا ئەو جیاوازیە لە هەموو ڕووەکانەوە چاکەو باشەی بۆ مرۆڤایەتی تێدایە، لە هەمانکاتیشدا لە ناوەخندا فیتنە و ئاشووبی زۆری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە زۆرێک لە مرۆڤەکان هەرگیز ڕازی نابێت بە کەسانی تر لەگەڵیدا ڕاو بۆچوونیان جیاواز بێت، ئیتر لەو کاتەوە ململانێ و پێداکێشان دروست دەبێت تەنها لەسەر ڕاو بۆچوونی جیاواز.

هەروەکو چۆن بەچاوی کەم ڕەش پیست و سپی پێست تەماشای یەکتر دەکەن، ئەگەر ڕەش پێستێک پارەی زیاتر بوو لە سپی پێستێک ئەوا دنیا دێتە سەر چنگ و جێگای قبووڵ نییە، لێرەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ململانێی پارە و دەسەڵات و حوکم.

ئەگەر سەرنج بدەین مرۆڤ تواناکانی سنووردارە هێز و توانای دەستەبەرکردنی بەهەمانشێوە کۆتایی دێت، بەڵێ

دەتوانێت هەندێک شت بکات بە شێوەیەکی زۆر چاک و نایاب، بەڵام زۆر شتی تر هەیە کە ئاستەنگ و سەختە

لەسەری، یاخود هەندێک شتی تر هەیە ناتوانێت بیکات، ئیتر لێرەوە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت لاوازەو تەواو نییە، پێویستی بە هاوکاری و زۆربوونی هێز و بەکارهێنانی توانای یەکتر، مرۆڤەکان پێویستیان بەوەیە لەیەکتر نزیک بنەوە و ناسین لە نێوانیاندا ڕوو بدات.

مرۆڤ ئەگەرچی خاوەن هێز و تواناو دەسەڵاتی زۆر بێت، لە کۆتاییدا پێویستی بەهاوکاری خەڵکانی دەوروبەری هەیە، لەسەر ئاستی تاکە کەس پاشان خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت.

جا هەندێک لە مرۆڤ ڕێگای نەرم و نیانی و خۆشەویستی و دەستی هاوکاری درێژکردن دەگرێتەبەر، هەندێکی دیکەش، جەنگ و جنێو و گاڵتە پێکردن و ...هتد، لەکۆتاییدا هیچکەس ناتوانێت بەتەنها بژی.

ئەگەر سەرنج بدەین خوای موتەعال تەنانەت سەروەتی ناو زەوی دابەش کردووە بەهەموو جێگاکاندا، لەو جێگایەی نەوت و غازی لێیە دارستان و سەوزایی نییە، ئەو جێگایەی خاوەنی جوانی و دیمەنی دڵڕفێنە، دوو ئەوەندەی دەرهێنانی کانزا خەڵکی بۆ گەشتوگوزار ڕووی تێدەکات، واتا سەروەتی کانزایی و کشتوکاڵی و مەڕوماڵات و ...هتد خوای گەورە بە جیاواز دابەشی کردووە بەسەر زەویدا بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکان پێداویستی یەکتر پڕ بکەنەوە، لە ئەوروپادا خورما نییە، پڕکردنەوەی لە جێگای ترەوەیە، لە هەموو پێداویستیەکانی مرۆڤ بەم جۆرە، جا گەنمە، مۆزە، هەنگوینە، ئاسنە، مەڕوماڵاتە ...هتد، مرۆڤ پێداویستی برای مرۆڤی پڕدەکاتەوە.

لەکۆتایی ئەم باسە کۆمەڵناسییە، مرۆڤایەتی بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگە و ژیار و شارستانییەتی دوو ڕێگای لەبەردەمدایە، ڕێگای یەکەم بریتییە لە مەنهەجی یەکترناسین بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ کە لەڕاستی بەشێک لەکاری پێغەمبەران بۆ ئەم ئامانجەیە.

ڕێگای دووەم پێداکێشان و جەنگ بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤی برایدا، ئەمەش ڕێگای شەیتان و چاوچنۆک و ورگ زل و خۆویستەکانە.

ڕێبازی یەکەم و دووەم دیارە، نموونەی زۆر لە بەردەستدایە لە هەردوو ئەزمونەکەدا دەگەڕێینەوە بۆ ناو قوڵایی مێژوو، بەڵام پێش باسی نوێ ئەم بەشە بە وتەیەکی جەنابی (ئیبنو خەلدوون) کۆتایی پێ دەهێنین کە دەڵێت:

"کۆبوونەوەی مرۆڤ، پێداویستی جۆرییە کە مرۆڤ بەیەکەوە بژین و ئولفەت بگرن بەیەکەوە، خۆ ئەگەر

وانەکەن ناتوانن بوونی خۆیان بپارێزن، هەروەها ئەگەر وا نەبوونایە خوای گەورە ئیرادەی لەسەر نەدەبوو کە ئاوەدانی زەوی و خیلافەتیان پێ ببەخشێت"[٣٤].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٤] الاجتماع ضروري للنوع الإنساني و إلا لم يكمل و وجودهم و ما أراد الله من اعتمار العالم استخلافه إياهم/المقدمة، ابن خلدون.

## بانگەوازی ئادەم بۆ مرۆڤایەتی

ئەگەر بە دیوێکی تردا تەماشای ڕووداوەکە بکەیت خوای پەروەردگار مرۆڤ دەکاتە خەلیفەو پێی دەفەرموێت برۆ باخ و باخاتێک و بخۆ بە ئارەزووی خۆت و دەبێت فریشتەش ڕێزت لێ بگرێت، بەڵام لە پێناوی چیدا؟!

داواکە زۆر گەورەیە، بە خەلیفە بوونە لەسەر زەوی، شێت و هاربوونی شەیتان لەپێناوی ئەو خیلافەتەیا بوو

وەرینەگرت، ئەم خیلافەتە چییە خۆ دار گۆچانی دەستی مووسا نییە بە موعجیزە هەموو شتێک ئەنجام بدات،

بەڵکو خوای گەورە پایەی بەرزکردووە بە هۆکاری زانست، کەواتە هیچ پێغەمبەرێک توانای بانگەوازی نییە، ئەگەر خاوەنی زانست نەبێت پلەو پایەی ئادەم بە تەنها لە خیلافەتەکەدا نییە، بەڵکو لە زانستەکەیدایە چونکە ئەگەر زانست نەبێت، ئەستەمە خیلافەت بێتەدی، چونکە خەلیفە بوون واتا پیادەکردنی فەرمانی خوا، ئەوەش بە زانست دەبێت، کەواتە بانگەوازی ئادەم بانگەوازی زانستی بووە، لەڕووی بوارەکانی ژیان و دین بەگشتی، ناسینی خوا و یەکتاپەرستی بە زانست، دامەزراندنی کۆمەڵگە و کۆکردنەوەی خەڵکی بەزانست، فێرکردنیان لە پیشەو مەڕوماڵات و کشتوکاڵ هەر بەزانست، ئەگەر کەسانێک بڵێن ئەزموون مرۆڤ فێری زۆر شت دەکات، هیچ کات پێغەمبەران دژی ئەوە نەبوون، ئەوەی مرۆڤایەتی بە ئەزموون پێ گەیشتووە زیادەی خستۆتە سەر، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (فهذا الحديث رواه الترمذي في سننه عن أنس بن مالك أنه قال: أتى النبي ﷺ رجل يستحمله فلم يجد عنده ما يتحمله فدله على آخر فحمله فأتى النبي صلى الله عليه وسلم فأخبره، فقال إن الدال على الخير كفاعله).

هەروەها، لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: خەڵکی چاک و باش ئەو کەسانەن کە سوودیان بۆ خەڵکانی تر هەیە[٣٥].

کەواتە دەگەڕێینەوە بۆ زانست لە سەردەمی حەزرەتی ئادەم دا، خوای موتەعال کە بە فریشتەکانی فەرموو مرۆڤ دەکاتە جێنشین لەسەر زەوی بە مەرجی وەرگرتنی زانست بوو، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا

---

[٣٥] عن جابر بن عبد الله رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ المؤمن يألف ويؤلف ولا خير فيمن لا يألف ولا يؤلف وخير الناس أنفعهم للناس. رواه الطبراني في الأوسط.

مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴿٣٠﴾وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴿٣١﴾قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴿٣٢﴾قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴿٣٣﴾﴾ البقرة

واتە: پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو من ئەمەوێ لەسەر ڕووی زەویدا کەسانێك دانێم کە ببن بە جێنشینی یەکتری، فریشتەکان وتیان: ئەی پەروەردگار ئایا تۆ کەسانێکی تیا دائەنێی کە ئاشووب بگێڕن لەسەر زەوی و خوێن بڕێژن و تاوان بکەن لە کاتێکدا ئێمە تۆ بەگەورەو بە پاك ڕائەگرین لە هەموو کەموکوڕییەك لە هەموو شتێك کە شایەنی تۆ نەبێ، لەوەی کە خەڵکی ئەیداتە پاڵ تۆ لە شەریك دانان بۆ خوای گەورە پەروەردگار فەرمووی: ئەوەی کە من ئەیزانم ئێوە نایزانن، کە لەناو ئەو کەسانەی کە من دروستیان ئەکەم پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و زانایان و خواپەرستان و پیاوچاکانیشیان تیادا ئەبێت﴿٣٠﴾ خوای گەورە ئادەمی دروست کرد و ناوی هەموو شتەکانی فێرکرد، پاشان خوای گەورە **پرسیاری لە** مەلائیکەت کرد دەربارەی ئەو ناوانە و فەرمووی: ئەگەر ڕاست ئەکەن ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن﴿٣١﴾ وتیان: ئەی پەروەردگار پاك و مونەززەهی بۆ تۆ ئێمە هیچ زانست و زانیارییەکمان نیە تەنها ئەوە نەبێ کە خۆت فێرمانت کردووە ئێمە غەیب نازانین هەر تۆ زۆر زاناو کاربەجێی﴿٣٢﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەم هەموو ئەو ناوانەیان پێ بڵێ کاتێك کە ئادەم ناوی هەموو شتەکانی پێ وتن، خوای گەورە فەرمووی: ئایا من پێتانم نەوت کە من نهێنی ئاسمانەکان و زەوی ئەزانم، ئەوەی کە ئاشکرای دەکەن و دەری ئەبڕن ئەویش هەر ئەزانم کە وتتان ئەمەی کە تۆ دروستی ئەکەیت ئاشوب ئەگێڕێ لەسەر زەوی و خوێن ئەڕێژێ، ئەوەیشی کە شاردوتانەوە ئەویش ئەزانم لەوەی کە ئیبلیس لە نەفسی خۆیدا تەکەبورو لوتبەرزی شاردبۆوە﴿٣٣﴾

خۆ زانستەکە بریتی نییە لەوەی ناوی دار و شاخ و گژوگیای فێرکردبێت، نا! بەو سادەییە نەبووە، بەڵکو زانستی کشتوکاڵ، ماڵداری، بانگەواز و پێداویستی مرۆیی، جا لە نووسین و خوێندنەوە لە دروستکردنی هێما بۆ کەرەستەو شتومەکەکان، کۆکردنەوەی خەڵک لەسەر یەک زمان و بڵاوکردنەوەی یەک جۆر زمان بۆ یەکترناسینی مرۆڤەکان.

مێژوونوسان: دەڵێن سۆمەری یەکەم زمان و خاوەن نووسین بوون بەڵام، پێش ئەوان دەیان کۆمەڵگەی تر نوسینیان هەبووە، خەت و نوسینیان لە سۆمەرەوە نزیک بووە، بۆ نمونە (١٩٦١)

ز. لە ناوچەی (تارتاریا) لە وڵاتی ڕۆمانیا، لەوحێکی بەرئاییینیان دۆزییەوە کە شێوەی زمانەکەی لە سۆمەری دەچێت، وا زانرا کە لەوان وەرگیراوە، بەڵام لە دوای پشکنین بە(ڕادیۆی کاربۆنی)، دۆزرایەوە کە زۆر لە سۆمەرییەکان کۆنترە، هەروەها لە نزیک (ڕووباری دانوب) هاوشێوەی ئەو نووسینانە دۆزراوەتەوە لە سۆمەرییەکانیش بە چەند هەزار ساڵێک کۆنترە.

کەواتە گەڕانی لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تری سەر زەوی لەنێوان هیندستان و میسردا گەڕاوە بانگەوازی کردووە، کارەکەی لە دوو جەمسەرەوە بووە جەمسەری یەکەم خواناسی و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار، کاری دووەم ئاوەدانی، چونکە دەردەکەوێت زۆرترین کۆمەڵەی مرۆیی کە کۆبوونەتەوە لە نزیک دەریای جەیحون و سەیحون و دیجلەو فورات و نیلدایە، چونکە شوێنی بەفەڕ و باش بوون بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، هەروەها بڵاوکردنەوەی نەوەکانی و بەتایبەت دوو کوڕەکەی شیث و ئیدریس لە ناوچەکاندا، شیث لە میزۆپۆتامیا بوو، ئیدریس لە میسر، خۆشی بەردەوام لەگەڕاندا بوو، هەر جەنابی ئادەم ماڵی خوای دروست کردووە لە مەککە، پاشان قودس کە ناسراوە بە مزگەوتی (ئەقصا ) هەر جەنابیان دروستیان کردووە.

کاری پێغەمبەر ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام نزیک کردنەوەی هۆز و قەبیلەکان بووە لە یەکتری کە ژن هێنان و شووکردن لە ناویاندا هەبێت، چونکە زۆرینەی مرۆڤەکانی ڕابوردوو بەهۆکاری هاوسەرگیری ناوخۆ یان مەحرەم لەناوچوون. وەکو لەناوچوونی مرۆڤی نیاندەرتاڵ هۆکارەکەی دەرنەچوون بووە لە ناوچەی نیاندەرتاڵی ئەڵمانیای ئێستا، بۆیە کاری پێغەمبەران گەیاندنی خەڵکی و ناسینی خەڵکی بووە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانیان پڕ بکەنەوە.

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ الحجرات

واتە: ئەی خەڵکی ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە نێرو مێ، ئێوەمان کردووە بە چەند گەل و هۆزێکەوە تا یەکتری بناسن، بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەس بەتەقواتر بێت ئەوە لای خوای گەورە لە هەموو کەس بەڕێزترە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە و زانیارییەکی زۆر وردی هەیە.

کەواتە مەنهەجی کارکردنی ئادەم ئەم ئایینە بووە کە جوان ڕوونی دەکاتەوە کە یەکەم کاری پێغەمبەران بونیادی ژیانیان لەسەرناوە بەم جۆرە بووە پاشان زانست تا ببنە خەلیفە و فەرمانی پەروەردگار بڵاوبکەنەوە، ئایینی خوای گەورە بڵاوبکەنەوە.

## ئایینی ئادەم ئیسلام بووە

خوای پەروەدگار یەک ئایینی هەیە و ئەویش ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بۆ هەموو پێغەمبەران ئیسلام هاتووە، بەڵام جۆری پەیامەکەو شەریعەتەکە جیاواز بووە بۆ سەردەمەکان بووە، خوای گەورە لە قورئاندا جێگری دەکات کە تاکە دینێک هەبوو بێت و ئایینی خوا بێت تەنها ئیسلامە، ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴿١٩﴾﴾ آل عمران

واتە: بە دڵنیایی تەنها دینێك کە خوای گەورە پێی ڕازی بێ و قبووڵی بکات ئیسلامە، ئەوانەی کە ئەهلی کتاب بوون و کتابی ئاسمانیان بۆ هاتبوو لە جوولەکەو گاورەکان ئیختیلاف و جیاوازی نەکەوتە نێوانیان ئیلا لە پاش ئەوە نەبێ کە عیلم و زانیارییان بۆ هات لە کتێبە ئاسمانییەکانی خۆیاندا، کاتێکیش کە ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنا هەر لە حەسوودیدا بوو، یاخود لەنێوان یەکتریدا حەسوودیان بەیەکتر برد، هەر کەسێکیش کوفر بکات بە ئایەتەکانی خوای گەورە و ئیمانی پێ نەهێنێ ئەوا بە ڕاستی حیساب و لێپرسینەوەی خوای گەورە زۆر خێرایە.

لەڕاستیدا وشەی دین و ئیسلام بە موبتەدا و خەبەر دێت، دین کە خوای گەورە پێی ڕازییە بریتییە لە یەکتاپەرستی لە پەروەدگاری و لە بەندایەتی و لە یاسادانانیش یەکتاپەرستی پەروەدگاری کە هەموو گەردوون و ژیان و مردن و سیفەتی خوای پەروەدگار دەگرێتەوە و پاشان هەموو بەندایەتیەکیش بۆ زاتی خوای موتەعالە، کە مادام کردوینیەتە خەلیفەو مەنهەج و شەریعەتی ناردووە، یاسا و ڕێساکان لەناو شەریعەتەکەیدا بۆئەوەی پیادەی بکەین و شوێن طاغوت نەکەوین.

(هەموو پەرستراوێک و شوێنکەوتوویەک پێیدەوترێت طاغوت)

خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ ...﴿٨٥﴾﴾ آل عمران، ئیبراهیم باوکی پێغەمبەران ئایینی ئیسلامی حەنیفی هەبووە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيّٗا وَلَا نَصۡرَانِيّٗا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفٗا مُّسۡلِمٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٦٧﴾﴾ آل عمران

واتە: ئیبراهیم نە جوولەکە بووەو نە گاور بووە، بەڵکو حەنیف بووە لە هەموو ئایینەکان لایداوە بۆ تەوحیدو یەکخواپەرستی خوای گەورە و موسڵمان بووەو تاعەت و گوێڕایەڵی خوای

گەورەی کردووەو ئاینەکەی ئیسلام بووە، ئەو لە موشرکین نەبووەو هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەداوە وەکو ئێوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴿٨٣﴾﴾ آل عمران

واتە: ئایا داوای جگە لە ئایینی خوای گەورە ئەکەن، لە کاتێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەمووی تەسلیمی خوای گەورە بوونە، بەخۆشی خۆیان بێت یان بە پێ ناخۆش بوون بێت تەنانەت ئاژەڵان و دارو بەردیش، تەنانەت کافریش بە ئەمرە کەونییەکانی خوای گەورە تەسلیم بوونە، هەر هەمووشیان بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە.

کەواتە دین یەکتاپەرستییە و ئیسلامیش ڕازی بوون و گوێڕایەڵییە.

زۆری تر لە ئایەتەکانی قورئان هاتووە کە باس لە هەموو پێغەمبەران دەکات کە تەنها ئایینی ئیسلامیان هەبووە ئادەمیش خوای پەروەردگار ئایینی ئیسلامی حەنیفی بۆ ناردووە، تا بڵاوی بکاتەوە بەسەر خەڵکیدا، کاری پێغەمبەرانیش دوور بووە لەخۆناساندن، بۆیە لەدوای خۆیان بێجگە دروستکردنی ماڵی خوا یان مزگەوت، هیچی

تریان بەجێ نەهێشتووە، نە سەروەت و سامان، نەماڵ و قەڵا و باڵەخانەی گەورە و کۆشک و تەلار.

## کەمینی شەیتان بەردەوامە

شەیتان کە ناسراوە بە ئیبلیس، لە مێژووی ئیبن کەثیردا بە عەزازیل ناوی براوە، هەمیشە لە کەمیندایە بۆ هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤ، وشەی شەیتان پلەو پایەیە، عەرەب پێش نەوەی ئایینی ئیسلام بێت، وشەی شەیتانی بەکارهێناوە، بەڵام بۆ شتی ترسناک و زۆر جوان و لەخشتە بەر، بۆ نمونە بە ئافرەتی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ وتراوە شەیتان، چونکە هەستی پیاوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، زیاتر مەبەست ئافرەتی لاشە دەرکەوتوو بووە کە جل و بەرگی شەفافی یان بە پارچە قوماشێک خۆی داپۆشیوە، یان بە سەگی ڕەش و گورگ و ئاژەڵە دڕندەکان وتراوە شەیتان، بە واتایەکی تر هەرچی مرۆڤ لە سرووشتی ئاسایی خۆی دەربکات و بیخاتە دۆخێکی نائاسایی، عەرەب پێی وتوە (الشیطان) واتا دەرچوون لە بنەڕەتی خۆی.

ئیبلیس كە نازناوی (ئەبو كردوس)ی هەیە بەگشتی توانا و هێزی زۆر لاوازە بەسەر مرۆڤدا، هیچ دەسەڵاتێكی نییە، تەنها دەسەڵاتی وەسوەسەو جوانكردن و درۆكردنە.

بۆنموونە كە ئادەمی هەڵخەڵەتاند، بەهۆكاری درۆكردنی بوو، بۆیە پێویستە مرۆڤی ئیماندار خۆش باوەڕ نەبێت، پاشان جوان كردنی حەرام بوو بە درۆ، خوای پەروەردگار داوای كرد كە لەو دارە نەخۆن، شەیتان حەرامەكەی جوان كرد و وتی بیخۆن بە هەتا هەتایی دەمێننەوە!

زۆر گرنگە مرۆڤ واقعی بێت، دوای شتی خەیاڵ و خورافات نەكەوێت، هەموو كەس كۆتایی بەژیانی دێت،

بۆیە مرۆڤ ئەزموون وەردەگرێت لەژیانی پێغەمبەران، باوكە ئادەم بیری چووە كە خوای گەورە هەتا هەتاییە و

هەموو مەخلوق لەناودەچن، پاشان دروستكردنی خەیاڵ پڵاوێكی تر لەلایەن شەیتانەوە كە گوایە دەبێتە فریشتە، باوكە ئادەم لەبیری چووە كە هەموو فریشتە ڕێزی لێ گرتووە و لەوان ڕێزدارتر كراوە، ئیتر بۆ جێگاو مەكانەتی خۆتت پێ كەمە!

شەیتان دەیەوێت مرۆڤ ڕوت و قوت بكاتەوە، شەرم و حەیای نەهێڵێت، گرنگە بۆی كە مرۆڤ بخاتە تاوان كەم بێت یان زۆر، نایەوێت بەتەنها لە دۆزەخ دابێت.

هۆكاری ڕوتبوونەوەی ئادەم و خێزانی بە گوێ كردنی شەیتان بوو، خوای گەورە ئاگاداری كردنەوە كە ڕوت نەكرێنەوە، جا ڕوت كردنەوەی لاشە بێت وەكو ئەمڕۆ كەوا پیاو و ژن خۆیان ڕوت دەكەنەوە و هەر یەكەو لاشە و تاتۆكانی بە شێوەیەك دەردەخات، ئەوەش ویستی شەیتانە، لە ئێستادا شەیتان پێ دەچێت لایەنگر و ئەندامی زۆری هەبێت، تەنانەت لە پلەی باڵا خەڵكی زۆرە، خۆی پاڵی لێ داوەتەوە ئیش و كارەكانی باش دەڕوات!

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَـٰنُ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَـٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾

﴿قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًاۢ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾﴾ طه

واتە: بە دڵنیایی ئامۆژگاری و وەسیەتمان بۆ ئادەم کردبوو لە پێشتردا کە لەو دارە نەخوات، بەڵام ئەو لەبیری کردو شەیتان خەڵەتاندی، نەمان بینی کە عەزیمەتی هەبێ لەسەر ئەو شتە. ئێمە بە فریشتەکانمان وت: کڕنووشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن﴿١١٥﴾ هەموویان کڕنوشیان بۆ برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت﴿١١٦﴾ ئێمەش وتمان: ئەی ئادەم ئەم ئیبلیسە بە دڵنیایی دوژمنی تۆ و حەوای خێزانتە، با لە دونیادا لە بەهەشت دەرتان نەکات و بچنە سەر ڕووی زەوی ماندوو ئەبن لە گەڕان بە دوای ڕزق و ڕۆزی﴿١١٧﴾ ئەگەر تۆ لە بەهەشتدا بمێنیتەوە ئەوە بە دڵنیایی نەبرسیت ئەبیت و نە ڕوتیش ئەبیت، چوونکە جۆرەها خواردن و پۆشاکی چاکی تیایە﴿١١٨﴾ لە بەهەشتیشدا هەرگیز تینوت نابێت و هەرگیز تیشکی خۆر لێتنادات و گەرمات نابێت﴿١١٩﴾ شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد بە دەنگێکی نهێنی وتی: ئەی ئادەم ئایا ڕێنماییت بکەم بۆ دارێك کە ئەگەر لێی بخۆیت بۆ هەمیشە زیندوو ئەبیت و مردنت بەسەردا نایەت موڵکێکیش کە هەرگیز لەناو ناچێت و کەم ناکات﴿١٢٠﴾ ئەوانیش بە قسەی ئیبلیسیان کردو لە دارەکەیان خواردو عەورەتیان دەرکەوت، خێرا گەڵای دارەکانی بەهەشتیان ئەدا بەسەر خۆیاندا، ئادەم سەرپێچی خوای گەورەی کردو ژیانی لێتێکچوو بەوەی هاتە سەر ڕووی زەوی﴿١٢١﴾ پاشان دووبارە خوای گەورە هەڵیبژاردەوەکە داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد، لێیخۆشبوو و هیدایەتی دا بۆ ئەوەی کە تەوبە بکات﴿١٢٢﴾ خوای گەورە فەرمووی: هەردووکتان ئادەم و حەوا دەگوازرێنەوە، ئێوەی گرۆی مرۆڤ هەندێکتان ئەبن بە دوژمنی هەندێکی ترتان، هەر کاتێك لە لایەن منەوە هیدایەتتان بۆ هات بە ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی کتێبەکان، ئەوا هەر کەسێك شوێن ئەو هیدایەتەی من بکەوێ لە دونیادا گومڕا نابێت و لە قیامەتیش بەدبەخت نابێت، بەڵکو بەختەوەر ئەبێت﴿١٢٣﴾ هەر کەسێکیش پشت لە دین و قورئانەکەی من بکات ئەوە بە دڵنیایی ژیانێکی تەنگ و تەسك لە دونیادا ئەیژیێنین لە دوودڵی و گومان و دڵەڕاوكێ و شڵەژاویدا دەژێت، لەناو گۆڕیشدا سزا دەدرێت و گۆڕەکەی لێ تەسك دەکرێتەوە تا پەراسووەکانی هەموو دەشکێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشری ئەکەین﴿١٢٤﴾ ئەویش ئەڵێ: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرم ئەکەی لە کاتێکدا کە من لە دونیا هەردوو چاوم بینا بووەو کوێر نەبووم﴿١٢٥﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: بەم شێوازە ئایەتەکانی ئێمەت پێگەیشت

تۆ پشتت تێ کردو پشتگوێت خست و وازت لێ هێناو تەماشات نەکرد ئێستاش ئاوا بە کوێری بەجێ ئەهێڵدرێی لەناو ئاگری دۆزەخداو وەکو لەبیرکراو مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت﴿١٢٦﴾

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴿٦١﴾قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴿٦٢﴾قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا﴿٦٣﴾وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴿٦٤﴾إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا﴿٦٥﴾﴾ الإسراء

واتە: کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنووشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن هەموویان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێت وتی: ئەی پەروەردگار من کڕنوش بەرم بۆ کەسێك کە تۆ لە قوڕ دروستت کردووە﴿٦١﴾ وتی: ئەی پەروەردگار هەواڵم پێ بدە سەبارەت بەو کەسەی کە ڕێزت لێناوە کە ئادەمە، کە منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، بۆچی فەزڵی ئەوتدا بەسەر مندا، ئەگەر دوام بخەی تا ڕۆژی قیامەت ئەوە زاڵ ئەبم بەسەر نەوەکانیداو هەموویان گومڕا ئەکەم تەنها کەمێکیان نەبێ کە بەندە دڵسۆزو باوەڕدارەکانن﴿٦٢﴾ خوای گەورەش فەرمووی: ئەوە ئەمێنیتەوە، بڕۆ هەر کەسێکیش گوێڕایەڵی تۆ بکات و شوێنت بکەوێ ئەوە بەدڵنیایی جەهەننەم سزای ئێوەیە سزایەکی تەواو﴿٦٣﴾ گومڕایان بکەو لە ڕێی ڕاست دەریانبکە و بیانترسێنە بە دەنگەکەت، بە سواری و بە پیادە دیسانەوە خەڵکی گومڕا بکەو بۆیان بڕۆ و زاڵ بە بەسەریاندا، بەشداریان بکە لە ماڵدا، بەشداریان بکە لە منالیشیاندا بەڵێنیان پێ بدە، وەعدو بەڵێنی شەیتان تەنها لە خشتە بردنەو هیچ حەقیقەت و ڕاستییەکی نیە﴿٦٤﴾ بەدڵنیایی بەندە دڵسۆزو باوەڕدارەکانی من، تۆ تواناو دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، خوای گەورە بەسە کە باوەڕداران پشتی پێ ببەستن و کاری خۆیانی پێ بسپێرن و خوای گەورە پارێزەرو پشتیوان و سەرخەریان بێت﴿٦٥﴾.

کە ئادەم بووە خاوەن ئەزموون، ئیتر شەیتان نەیتوانی نزیکی ببێتەوە، ئادەم خێرا تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری، خوای پەروەردگار لێرەدا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ

وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ الأعراف

واتە: (دَلَّاهُمَا) واتە: لە بانەوە کەسێك بۆ خوارەوە شۆڕ بکەیتەوە، واتە: لەو پلە بەرزەوە دای گرتنە خوارەوەو فێڵی لێ کردن، کاتێك کە ئادەم و حەوا لە دارەکەیان خوارد عەورەتیان کە دایان پۆشی بوو دەرکەوت[٣٦]، بەگەڵای دارەکانی بەهەشت عەورەتی خۆیان داپۆشی، پەروەردگار بانگی لێ کردن ئەی ئادەم و حەوا ئایا من قەدەغەی ئێوەم نەکرد لەو دارە نەخۆن؟ خوای گەورە سەرزەنشت و لۆمەی کردن بۆ کەوتنە ناو فێڵی شەیتانەوە، ئەی من پێم نەوتن: کە بە دڵنیایی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە﴿٢٢﴾ هەردووکیان یەکسەر تەوبەیان کرد، وەکو ئیبلیس نەبوون کە تاوانی کردو تەوبەی نەکرد، بەڵکو ئەمان یەکسەر دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا، ئەی پەروەردگار زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردو تاوانمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبی وە ڕەحممان پێ نەکەی ئەوا ئێمە لە زەرەرمەندان ئەبین لە دونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێیان خۆشبوو﴿٢٣﴾.

کە ئادەم زانی ململانێ دەستی پێ کردووە و خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ململانێکە، ئیتر پێویستی بەوەیە کە مرۆڤایەتی و نەوەکانی ئاگادار بکاتەوە لە دوژمنی سەرسەختی مرۆڤ و نەوەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ

---

[٣٦] ﴿... وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ... ﴿١٢١﴾﴾ طه. لێرەدا قورئان دەری دەخات داپۆشینی شەرمگە غەریزەیە لە مرۆڤدا، بۆیە ئادەم و حەوا شەرمگەی خۆیان دادەپۆشن.

قورئان دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ...﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب واتە: وەکو سەردەمی نەزانی سەرەتایی خۆتان سفوور مەکەن.

لە ئیسلامدا تەواوی لەشی ژن شەرمگەیە دەم و چاو و دەستی نەبێ، بەڵام پیاو نێوان ناوک و ئەژنۆی شەرمگەیە.

لە ڕووی زانستی سەلماوە: ( پیاو لە ڕێگای تەماشاکردن و خەیاڵ جنسی دەوروژێ، ئافرەت زیاتر بە بەرکەوتن و قسە کردن،) (الجنس والنفس في الحياة الانسانية/د. علی کمال.

بێگومان بەشێ لە هۆکارەکانی نەخۆشییە جنسییەکان وەکو ئایدز و سۆزەنەک و فەرەنگی، کە دەیان ملیۆن کەس بۆتە قوربانییان و زۆربوونی لادانە جنسییەکان و زۆربوونی تەلاق و ناپاکی خێزانی و گێچەڵی جنسی لە خۆرئاوادا بۆ سفووری و تێکەڵای دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوەیە قورئان سفووریی و تێکەڵاوی بە حەرام داناوە.

مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ الكهف

واتە: کاتێك ئێمە بە فریشتەکانمان وت کڕنووشی ڕێزو ئیحترام و بەگەورەزانین بۆ ئادەم بەرن، هەموویان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت و وتی: من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە خۆڵ دروست کردووە، ئیبلیس مەلائیکەت نەبووە بەڵکو لە جنی بوو لە گوێڕایەڵی و فەرمانی خوای گەورە دەرچوو، ئایا ئێوە ئیبلیس و نەوەکانی ئەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان جگە لە من لە دوای ئەوەی

کە بێ فەرمانی خوای گەورەی کرد، لە کاتێکدا ئەوان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن، خراپترین شتە کە ستەمکاران خۆشەویستی و پشتیوانی خوای گەورە ئەگۆڕنەوە بە شەیتان.

بەڵام بەداخەوە مرۆڤ سەرکەشەو زوو شتی لەبیر دەچێتەوە، ئەمجارە شەیتان زەفەری بە منداڵەکانی برد، توانای نەبوو جارێکی تر ئادەم و حەوا هەڵبخەڵەتێنێت، چووە لای دوو کوڕی تری ئادەم قابیل و هابیل.

## کوشتنی هابیل بەدەستی قابیلی برای

سەرنج ڕاکێشانمان بۆ ئەم ڕووداوە بنەڕەتی پەیوەندی هەیە بە یاساکانی تاوان و تۆڵە سەندنەوە، ئەحکامی لەسەر دامەزراوە، کاتێک کە دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی یاسادانان، دەبینین دەیان فەیلەسوف نمونەیان بۆ هێناوینەتەوە تا توانیویانە شتێک لە دانانی یاسا بۆ کۆمەڵگە و دەسەلاتەکەیان بونیاد بنێن، بەڵام خوای پەروەردگار لە بنەڕەتی تاوانەکەوە یاساکەی بۆ داناوین و لە زەمینە و واقعی ژیانەوە دوور لە بنەمای فەلسەفی یاسای بۆ داڕشتووین، بەڵکو بنەمای یاسای خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە بۆ شەریعەت، وشەی شەریعەت بەواتای سەرچاوە دێت، کەواتە خوای پەروەردگار بنەڕەتی سەرچاوەی یاسای بۆ مرۆڤایەتی داڕشتووە، لەسەر ئەو بنەما و بنەڕەتە مرۆڤەکان دەتوانن یاسای تری لەسەر دابڕێژنەوە، ئەمەش لە زمانی شەریعەت دا پێی دەوترێت (ئەحکام و فەتوا) ئەحکام بنەڕەتی یاساییە و ناگۆڕێت، بەڵام فەتوا لەسەر بنەمای ئەحکامەکە دێت، دەکرێت دەستکاری بکرێت و گۆڕانکاری بەسەردا بێت، یاخود پەشیمان بوونەوەش لەسەری زۆر ئاساییە، هەروەکو نموونەی جەنابی (محەمەدی کوڕی ئیدریس) کە ناسراوە بە (ئیمامی شافیعی) لە بەغداد فەتوایەکی دا چووە وڵاتی میسر لێی پەشیمان بوویەوە، ئەمەش زیاتر ئەو واتایەمان بۆ دەردەخات کە فەتوا لە جێگاو ژینگەیەکدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بەڵام ئەحکام لە جێگای خۆیدایە و ناگۆڕێت.

سەرەتای ئەم ڕووداوانە هەروا شتێکی سانا و ساکار نییە، پێش هەموو شتێک بۆ ئەوەی مێژووی یاسا و ئەحکام تێبگەین لێرەوە سەرچاوەی گرتووە، نەک حامورابی و سەرچاوەی شارستانییەتی سۆمەر و ئەکەد و ئاشووری.

چونکە زۆرێک لەماددی گەراکان دەیانەوێت مێژووی یاسا بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی شارستانییەتی (میزۆپۆتامیا) کە لە ڕاستیدا سەرەتای یاسادانان لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

سەرەتای ڕووداوەکە وەکو باسمان کرد ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ، بەزەویدا دەگەڕا هەروەها منداڵەکانی دابەش کردبوو بە ناوچەکاندا، ئەم دوو کوڕەی لە شام مابوونەوە سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریش بوون، هابیل کە سومبولی پاکی و هێمنی و برای دڵسۆزە لە ژیانی ڕۆژانەیدا سەرقاڵی ئاژەڵداری بوو، قابیلی برای کە سەرەڕۆو نەگبەت و حەسوود بوو، خەریکی کاری کشتوکاڵ بوو، هەریەک لەو دوانە دەبوو لە بەروبوومی خۆیان واتا قازانج و سوودی کارەکەیان قوربانی پێشکەش بکەن، وەکو زەکاتی ئێستا دانی قوربانییەکەش، بەخودی باوکیان بووە حەزرەتی ئادەم، ئەویش بەسەر هەژار و بێ دەرامەتەکاندا دابەشی دەکرد.

ئەوەی کە لە مێژوودا باس کراوە هابیل باشترین مەڕی دەبەخشی بە زیادەوە، قابیلیش لەبەر حەسوودی و چاو چنۆکی کەمترینی دەبەخشی ئەویش بە نابەدڵی، لێرەدا کە ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕوونی دەکاتەوە کە خوای گەورە قبوڵی کردووە یان نا، چونکە کوڕەکانی پەیوەندی ڕاستەخۆیان بەخوای پەروەردگارەوە نییە، ئەوەش لە ئارادا هەیە کە گوایە، قوربانییەکە پێشکەش کراوە و ئاگرێک لێی دەدات، ئەو ئاگرە نیشانەی قبوڵ کردنە، ئەمەش پێناچێت سەنەدێکی ڕاستی هەبێت، چونکە خودی ئادەم کە پێغەمبەرە، ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوا و وەحی بۆ دێت و خوای گەورە ئاگاداری دەکاتەوە، قوربانییش بۆ سوتان نییە، بەڵکو بۆ سوود گەیاندنە بە خەڵکی هەژار و بێدەرەتان، هەر لەبەر ئەوەیە وەکو سەید قوطب دەڵێت: (کردارەکە نادیارە) لە کامیان قبوڵ کراوە یان قبوڵ نەکراوە، واتا (فعلى مبني على المجهول )ـە.

کەواتە ئادەم هەواڵەکە دەگەیەنێت، پاشان ئەوەی کە بەخیل و ئیرەیی و حەسوودی هەیە، دەبینێت براکەی هەمیشە لەو باشترە، لە ئەنجامی ئەو باشییەی بڕیاری کوشتنی ئەدات، واتا پێ ناچێت هەموو ئەم ڕووداوە لە چەند چرکەسات و یان ڕۆژێکدا بێت، پێدەچێت داخێکی زۆر لە دڵیدا پەنگی خواردبێتەوە بۆیە بڕیاری کوشتنی ئەدات، ئەویش وەڵامی ئەداتەوە، ئەگەر هەوڵی کوشتنم بدەیت من هەرگیز دەست درێژی ناکەمەوە سەر تۆ، سەرەتا لە شێوەی هەڕەشەدایە، پاشان کرداری کوشتنەکە ئەنجام ئەدات. لەگەڵ ئەنجامی کوشتنی براکەی ڕاستەوخۆ پەشیمانە، نازانێت چی بکات، فەرمان و حوکمی کوشتنی براکەی نازانێ چی بەسەر دێ، پێ ناچێت ئەو براکەی خۆی کردبێتە ژێر خاک، چونکە ئایەتەکە وا دەردەکەوێت کە بە

جێی هێشتووە و ڕای کردووە، پاشان لەئەنجامی ڕاکردنەکەی لەڕێگادا دوو قەلەڕەش دەبینێت یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێت و دەیکات بە ژێر خاکەوە، ئەویش بێ توانایی و بێ مێشکی خۆی هەست پێدەکات کە ئەو قەڵە ڕەشە لەو بەتوانا تر بوو، تەنانەت براکەشی نەکردە ژێر خاک بۆیە ئەوەندەی تر پەشیمانی دەربڕی، بەڵام پەشیمانی دادی نەدا بۆیە لە خەسارەت مەندەکان بوو.

ئیبن کەثیا دەڵێت: قابیل ڕایکرد بۆسەر شاخ، یاخود بەرەو یەمەن کەوتەڕێ...

ئەوانەش کە باسی هێنانی خوشکی یەکتر دەکەن لەمێژوودا، هیچ بنەمایەکی ئیسلامی نییە، بەڵکو ئیسرائیلیاتە و تێکەڵ کراوە بە سەرچاوەی ئیسلامی ئایەتەکەش زۆر بەڕوونی دیارە کە پەیوەندی بە خواناس و قوربانییەوە هەیە خوای گەورە لە قورئاندا چیرۆکەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿۞وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٨ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٩ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٣٠ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ٣١﴾ المائدة

واتە: بەسەرهات و ڕووداوی دوو کوڕەکەی ئادەم (قابیل و هابیل) بۆ ئەو خەڵکەی بگێڕەوە کە بە ڕاستی ڕوویداوە کاتێ کە قوربانییەکەیان کرد، لە یەکێکیان وەرگیرا (کە لە سەر حەق بوو، لە خوا ترس بوو) و لەوی تریان وەرنەگیرا (چوونکە ڕق ئەستوورو لەخوا نەترس بوو) (کەچی قابیل بە هابیلی) وت: هەر دەتکوژم (هابیل لەوەڵامی هەڕەشەکەیدا) وتی: خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت ٢٧ خۆ ئەگەر تۆ دەستت درێژ بکەیتە سەر من و بتەوێ بمکوژی، من دەست درێژ ناکەمە سەر تۆو ناتکوژم چوونکە بەڕاستی من لە سزاو تۆڵەی خوا پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم ٢٨ دەمەوێ گوناهی کوشتنی من و گوناهەکانی تری خۆیشت کەڵەکە ببێت لەسەرت و ببیتە نیشتەجێی ناو ئاگر، هەر ئەوەشە پاداشتی ستەمکاران ٢٩ نەفسی سەرکەشی قابیل هانی داو کوشتنی براکەی لا سادە و ساکار کرد کوشتی، ئیتر خۆی خستە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانەوە ٣٠ لەوەدوا گیری خوارد بەدەست تەرمەکەیەوە، (چوونکە وا دیارە هابیلی شەهید یەکەم کەسە کە بکوژرێت و بمرێت بۆیە)، خوای میهرەبان قەلەڕەشێکی ناردو چاڵێکی لە زەویدا هەڵکەند (بۆ قەلەڕەشێکی تری مردارەوە

بوو) تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە، (ئەوجا کە ئەوەی دی) وتی: هاوار لە من، من نەمتوانی وەکو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوم لێ نەهات تا لاشەی براکەم ئەسپەردە بکەم، ئیتر بۆ هەمیشە چووە ڕیزی پەشیمانانەوە﴿٣١﴾.

ئەگەر تەماشا بکەین لێرەدا توخمێکی تر لەناو توخمەکانی ململانێ دێتە ئاراوە کە دوورە لە بواری شەیتان واتا خودی شەیتان ڕاستەوخۆ دەستی تێدا نییە، هەرچەندە شەیتان میحوەری سەرەکییە، بەڵام لێرەدا باسی (نەفس) دەکات، ئەم توخمە نوێیە کە لەمرۆڤدا هەیە، بنەماکەی لەسەر حەز دروست دەبێت، پەیوەندی هەیە بە لوتبەرزی، پێچەوانەکەی تەوازوع، درۆکردن پێچەوانەی ڕاستگۆیی، دزی و دەست پاکی، چاو چنۆکی و دڵفراوانی، خاوەن ڕەوشت و بێ ڕەوشت...هتد، هەموو ئەم سیفەتانە سەرچاوەکەی لە توخمی نەفسەوەیە، ئەگەر بێت و مرۆڤ وەرزش بەنەفسی نەکات، ئەوا لەشەیتان خراپتری پێ دەکات، بۆیە زانایانی ئیسلام، بەشی (تزكية نفس)یان داناوە کە بەکوردی پێی دەوترێ (پاڵفتەی دەروون)، زۆرێک لە ئەهلی ئیسلام قوتابخانەی تایبەتی بۆ دروست کردووە، ڕێگا و مەسلەکی تایبەتی هەیە بەناوی صۆفی و موريد و ...هتد، کە هەمووی کارکردنە لەسەر پاککردنەوەی نەفس، لەو زانا گەورانەی کە کاریان کردوە لەسەر ئەم بوارە زۆرن، هەندێک بەنموونە باس دەکەین کە پێشەنگن، لەوانە حەسەنی بەسری، ئیمامی ئەحمەد، عەبدوڵڵای کوڕی، ئیمامی زەهەبی، ئیمامی کە ئیبن و تیمیە قوتابی بوو، پاشان کەزانی ئیبن تەیمییە بەتواناترە، ئیمامی زەهەبی بووە قوتابی ئیبن و تەیمییە، ئیبنو قەیمی جەوزی، ئیمامی غەزالی...هتد.

## تێبینیەکی بچووک بۆ خوێنەر!

کە تەماشای تەوراتم کرد بەشی (تكوين ) زۆرینەی سەرچاوەکان لە تەوراتیان

وەرگرتووە، بۆیە ئەوەندەی کە ئاماژەم پێداوە زیاترم دەست نەکەوتووە، بۆیە بە دوو ئاراستە ئەم باسە دەبینم، ئاراستەی یەکەم بەدڵنیاییەوە سەرچاوەی یاسادانانە لە ئادەمەوە، سەرچاوەی دووەم موعجیزەی گەورەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئەم سورەتەو خودی ئەم ڕووداوە لە شاری مەککە دابەزیوە، کە عەرەب هیچی لەبارەی ئادەم و حەواوە نەزانیوە چ جای منداڵەکانیان، چونکە سەرسامی عەرەب بە قورئان، تەنها بە جوانی بەلاغەکەی نەبوو، هەرچەندە بەلاغەو جوانی دەنگی مۆسیقای لەناو وشەکانی قورئاندا وجوودی هەیە، ئەوەندە جەوهەر و باسەکانی قورئان جێگای سەرنجی عەرەب بووە، باسەکان بۆیان نوێ بوو، لەگەڵ ئەوەی شارەزابوون لە زانستی نەسەب بە زمانی ئەمڕۆ، مێژووی عەرەب تا قوڕەیش کە باپیرە گەورەیان بوون دەگەڕانەوە، زانیارییان دەربارەی ئادەم و حەوای خێزانی نەبوو.

عەرەب بڕوای بە زیندووبونەوەی قیامەت نەبوو، تەنها خواپەرستییان دەکرد بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بن و بەختی باشیان هەبێت لە ژیاندا، بەدوای بەهەشت و دۆزەخەوە نەبوون، هەر نەیاندەزانی چییە! بوونی شەیتان و جنۆکە و فریشتە ئەگەرچی ناویان بیستبوو، بەڵام جیاکارییان نەدەکرد لە نێوانیاندا بۆیە پێغەمبەری خوا ناوی نان بە عەرەبی جاهیلی و سەردەمی جاهیلی، چونکە جاهیلی تەواو بوون بە ئایینی خوای پەروەردگار.

لەباسی مێژووی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام، ئیبن جەعفەری طەبەری لە ئیبنو حەمیدەوە دەگێڕێتەوە کە گوایە، ئادەم زۆر خەفەتبار بوو بە کوشتنی هابیلی کوڕی، گوایە شیعرێک لە ئادەمەوە دەهێنن، کە وەکو لاوانەوەیەک بۆ هابیلی کوڕی وتویەتی:

تَغَيَّرتِ البلادُ ومَنْ عليها فَوَجْهُ الأرض مُغْبَـرٌ قَبيـح

تغيّر كلُّ ذي لـونٍ وطعـم وقلّ بشاشةُ الوجهِ المليح

بەم جۆرە قابیل بووە ئەو کەسەی کە لە سەردەمی تەکلیفی مرۆیی بۆ پابەندبوون بە ئایینەوە، یەکەم تاوانی کوشتنی خستە سەر شانی خۆی و هەرکەس کەسێک بکوژێت بەبێ تاوان، چەندە تاوان دەچێتە سەر خاوەنەکەی، ئەوەندەش بۆ قابیلی کوڕی ئادەمە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: هەر کەسێک بە زوڵم بکوژرێت، ئەوا خوێنەکەی یەکەم جار دەڕوات بۆ ئەو کەسەی کە یەکەم کاری کوشتنی ئەنجام داوە، کە کوڕی ئادەمە[٣٧].

لەسەرچاوەی ئیسرائیلییات هاتووە دوای کوشتنی هابیل، خوای گەورە (شیث) بەخشیەوەتە ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام، لە مێژووی ئیبن کەثیردا هاتووە ئەویش لە طەبەری وەریگرتوە (شیث) بە واتای دیاری خوایی دێت (هبة من الله).

خوای گەورەش کە دیاری بەخشی چاوەڕێی دیاری وەرگرتنەوە نییە، بۆیە ناونراوە بە (هبة من الله).

---

[٣٧] لا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا، إلّا كانَ علَى ابْنِ آدَمَ الأوَّلِ كِفْلٌ مِن دَمِها، لأنَّهُ كانَ أوَّلَ مَن سَنَّ القَتْلَ/احمد، البخاري، مسلم، ابن ماجة و ترمذي ڕیوایەتیان کردووە.

## وەفاتی حەزرەتی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ

هەموو مەخلوقێک لەسەر زەوی و لە گەردووندا، بێجگە دۆزەخ و بەهەشت خوای پەروەردگار قەدەری بۆ داناوە، سەرەتا و کۆتایی هەیە. ئادەمیش ئەگەر چی یەکەم پێغەمبەرە لە دوای تەواو بوونی قەدەری، ئەویش دەبێت وەفات بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار، دوای خۆی وەسیەتی کرد بۆ شیثی کوڕی و لە دوای خۆی خوا کردیە پێغەمبەر و صحوفی بۆ نارد، ئادەم لە وڵاتی هیندستان لەو جێگایەی کە سەرەتا نیشتمانی بوو لەوێ نێژراوە. قسەیەکی تر لەبارەیەوە هەیە کە گوایە لە (شاخی ئەبی قوبەیس) لە شاری (مەککە) نێژراوە. لەبارەیەوە وتە زۆرە، بەهەرحاڵ ئەمەی کە گرنگە ئاماژەی پێ بدەم لەدوای مردنی بە یەک ساڵ خاتوو حەوای خێزانی وەفاتی کردووە.

وەکو وتراوە هەردووکیان لای یەکتریەوە نێژراون، بنەڕەت و سەرچاوەی ڕاستی ئەوەیە کە جێگا و گۆڕی پێغەمبەران نابێت دیار بێت، بێجگە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕۆژی وەفاتی ئادەم وەکو ئەو ڕۆژە بووە کە خوای گەورە دروستی کردووە ئەویش ڕۆژی جومعەیە، لەدوای ئادەم شیثی کوڕی کاری بانگەواز و گەیاندنی ئایینی خوای گرتە ئەستۆ.

## شیث پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ
## یەکەم زمانی دانیشتوانی سەرزەوی

گومان لەوەدا نییە زمانیش لەگەڵ نووسیندا هەردووکیان دەرئەنجامی پەرەسەندنی مرۆڤن لەگەڵ ساڵانی ژیانی مرۆڤ دا پەرەیسەندووە، قسەکردن دەرئەنجامی ئەو تۆنی دەنگانەیە کە لە گەرووەوە دەردەچێت، نووسینیش وێنەی ئەو دەنگانەیە مرۆڤ بەکاری هێناوە، فەرموودەیەکی لاوازمان هەیە کە یەکەم زمان ئادەم و شیث و ئیدریس و نووح، ئەم پێغەمبەرانە کە بە پێغەمبەرە سەرەتاییەکان ناسراون زمانی سریانییان هەبووە، پاشان هەندێک سەرچاوەی تر ناوی ناوە بە زمانی (ئادەم)ی، هەرچەندە هەر ناوێکی هەبێت بە دڵنیاییەوە زمانێک هەبووە کە خەڵکی سەردەمی ئادەم قسەیان پێ کردووە، زمانیش بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ یەک سەرچاوە و هەموو زمانەکانی تری لێ جیابووەتەوە بە گوێرەی قۆناغەکانی سەردەم و مێژوو گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، ئەوەی لە ئێستادا لە بەردەستماندایە ئەوەیە کە کۆنترین زمانێک ئاخافتنی پێکراوە لە بابل دا سۆمەرییەکان بەکاریان هێناوە، ئەویش زمانی سۆمەرییە، هەرچەندە هاوشێوەی زمانی نووسینی سۆمەرییەکان بووە زۆر لەوانیش کۆنتر بووە.

ئەوەی گرنگە باس بکرێت زمان و نووسین لە ئەنجامی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ پەیدا بووە، کاتێک خوای گەورە مرۆڤی ئامادە کردووە بۆ هەڵگرتنی ئەمانەتی ئایینی توانای خوێندن و نووسین و گفتوگۆیان هەبووە بە باشترین شێوە، هەربۆیە ئادەم خاوەنی ۱۰ کتێب بووە، شیثی کوڕی خاوەنی ۵۰ کتێب بووە بەناوی (صحف) و هەروەها شیث یەکێک بووە لە پێغەمبەرە خاوەن پیشە و دەست ڕەنگینەکان، کە ئاسن و کانزاکانی بەکار هێناوە، وەکو ئاماژەی پێدراوە لە ناوچەی بابل و عێراقی ئەمڕۆدا ژیاوە.

کاری هەرسێ پێغەمبەرە سەرەتاییەکە ناساندنی خوا بووە، لە سەردەمی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام هیچ کێشەیەک ڕووی نەئەدا، خێرا مرۆڤەکان پابەند دەبوون و هەموو زاتی پەروەردگاریان دەپەرست، سەردەمی شیث زیاتر وەکو ئادەم بووە، زیاتر زانیاری و زانستی ئەدایە خەڵکی لە ڕووی ئایین و پاشان دنیاوە، لەناوچەی بابل و فارس دا زۆر خۆشەویست بووە کە دوای خۆی منداڵەکانی بە پادشایی دەست پێ دەکەن و سەرپەرشتی ۷ هەرێمی فارس دەکەن منداڵەکانی و یەکێک لە کوڕە ناودارەکانی پادشاکانی ناوچەی فارسە کە بابلی لەژێر ڕکێف دا بووە بەناوی (مەهلائیل) بووە، هەرچەندە لە فەرموودەیەکی ئەبو زەردا هاتووە کە (لاوازە، مرفوع)ە، کوڕی یەکەمی ناوی (ئانوش) بووە، ئانوش-یش باوکی (قینین) بووە، قینین-یش باوکی مەهلائیل بووە، وەکو ئەوەی باس دەکرێت نەوەکانی ئادەم لە بەشی شیث و شارستانییەتی بابل و ئەکەد و ئاشوور هەروەها فارسیان دامەزراندووە.

کەواتە شارستانییەتی ناوچەکانی (میزۆپۆتامیا) لە بنەڕەت دا لە نەوەکانی ئادەم-ەوە هاتوون، کەواتە سەرەتای دەستپێکی شارستانییەت لێرەوە سەر هەڵدەدات لەدوای نەوەکانی شیث.

## ئیدریس پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَام[٣٨]

**١**

## یەکەم قەڵەم و نووسینی دانیشتوانی سەرزەوی

خوای پەروەردگار لە قورئاندا لە دوو جێگادا باسی کردووە و دەفەرمووێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ۝٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ۝٥٧﴾ مریم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٨] هەندێ بڕوایان وایە ( ئیدریس) دوای (شیث) دێ و دەبێ بە پێغەمبەر و نەوەی ئەوە، ( قصص القران ابن كثير/ل:٤٨

<===

واتە: ئەی محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ لەو قورئانە پیرۆزە باسی ئیدریس پێغەمبەریش عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ بۆ خەڵکی بکە بە دڵنیایی ئەویش زۆر ڕاستگۆ بووە و پێغەمبەری خوای گەورە بووە﴿٥٦﴾ بەرزمان کردۆتەوەو پلەو پایەی بەرزمان پێ بەخشیووە کە لە ئاسمانی چوارەمە، یاخود پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشیووە، یاخود لەبەهەشتدا پلەمان بەرز کردۆتەوە﴿٥٧﴾

﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴿٨٥﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئیسماعیل و ئیدریس و ذولکیفل عَلَيۡهِمَا ٱلسَّلَامُ هەموو ئەمانەش ئارامگر بوونەو ئارامیان گرتووە.

ئیدریس عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ یەکێکە لە کوڕەکانی ئادەم، ڕایەکی تر هەیە کە ئادەم باپیریەتی و شیث باوکێتی، بەڵام ئەو ڕایەم لا پەسەندە کە یەکێک لە کوڕەکانی ئادەم بووە و باوکی خۆی بینیوە، واتا ئادەمی بینیووە.

ئیدریس لەناو وڵاتی میسردا پێغەمبەرایەتی کردووە، وەکو هەردوو پێغەمبەرانی پێش خۆی واتا ئادەم و شیث بە زەویدا گەڕاوە کە دەڵێن بەزەویدا گەڕاوە واتا بەو جێگایانەدا گەڕاوە کە کۆمەڵگە و مرۆڤی تێدا نیشتەجێ بووە، لەو جێگایانە وڵاتی یۆنانستانە کە لەوێ بە (خنوخ) ناسراوە، یاخود خنوخ زمانی عیبرییەو لە تەورات دا بەو ناوە هاتووە، هەروەها میسرییەکان بە (ئەرمیس) ناویان بردووە، عەرەب وشەکەی گۆڕیوە بۆ (هەرمیس) هەروەها خنوخی گۆڕیوە بۆ (أخنوخ) هەروەکو چۆن کوڕەکانی شیث شارستانییەتی میزۆپۆتامیایان دامەزراندووە نەوەکانی ئیدریسیش شارستانییەتی میسری کۆنیان بوونیاد ناوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

هەندێ بڕوایان وایە ( اخنون) کە لە تەوراتدا هاتووە، هەمان ئیدریسە، هەندێ بڕوایان وایە (ئیدریس هرمس)ی دانایە لە یۆنان، بەڵام هیچ کام لەو قسانە پشت ڕاست نەکراونەوە.

( الأنبياء والرسل في مصر الفرعونية/ اسماعيل حامد/ل: ٥٢ بۆ ٦٠ سەیر بکە.

بە پێ ی قسەی ( د. خزعل الماجدي) ئادەم و شیش لە خاکی سۆمەڕدا ژیاون، ئەو زنجیرەیە لە ئادەمەوە تا نوح بە (١٠) بەرە باب دەست پێ دەکات، ئەو ناوانە لە شوێنەواری سۆمەری دا هاتوون.

( انبياء سومريون/ د. خرعل الماجدي/ ل: ٥٩-٦٠سەیر بکە.

بڕوای زۆرینە ئەمەیە، سۆمەرییەکان ئاری بووبن، یان کورد پاشماوەی گەلی نوح بن و لە باکوری عێراق ( کوردستان) نیشتەجێ بووبن لە جودی.

( موسوعة الحضارات القديمة/ ا.د. محمد سهيل طقوش/ل: ٢٤٥ سەیر بکە.

هەرچەندە بەشێک بە سامییان دەزانن. چونکە وشەی گۆتی ( کوردی- جودی) لە یەک ڕەگەوە هاتوون وەکو ( د. فريد لی) باسی کردووە.( سفينة نوح/ احمد فقيه/ل: ١٧) قورئان دەفەرموێ: ﴿... وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ ...﴿٤٤﴾﴾ هود، لە داهاتوو باسی دەکەین.

پێغەمبەرێكی خاوەن سیفەتی جوان بووە، ڕاستگۆو ئارامگر بووە، زانایانی نەسەب و گێڕانەوەی ڕەچەڵەك بنەڕەتی پێغەمبەری خوا محەمەد ﷺ دەگەڕێننەوە بۆ حەزرەتی ئیدریس[٣٩].

هەروەها لە فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە كە ئیدریس یەكەم كەس بووە قەڵەمی بەكارهێناوە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات خوێندن و خوێندەواری لە پێغەمبەرانەوە ماوەتەوە بۆ مرۆڤایەتی[٤٠].

پاشان یەكەم پێغەمبەر بووە كە چەك و جبەخانەی دروست كردووە، هەروەها خەباتی كردووە دژی ئەو كەسانەی كە لاڕێ و سەرلێ شێواو بوون، دیارە دەڵێن یەكەم كەس بووە كە جیهادی كردووە، جیهاد بە هاتنی ئادەم فەرز بووە، چونكە مەرج نییە جیهاد تەنها بۆ جەنگ كردن بەكار بهێنرێت، بەڵكو ئیدریس یەكەم كەس بوو كە جیهادی جەنگی كردووە دژی خراپەكاران.

بەم هۆكارەیە كە پێغەمبەرانی سەرەتادا جێگاو پلەوپایەی بەرز بووە جیهادی دژی بێباوەڕان نەبووە، بەڵكو دژی تاوانباران بووە ئەوانەی كە زیناو مەیخواردنەوە و تاوانیان ئەنجام داوە لەدوای ئیدریسەوە.

شەیتان دەكەوێتە وەسوەسەی ناو خەڵكی و هاوبەش دانان دروست دەبێت تا سەردەمی ئیدریس پێغەمبەر، بە ماوەیەك دوای جەنابیان ئینجا شیرك و تاوانی شەریك دانان دێتە ناو خەڵكی و فێری ئەو تاوانە گەورەیە دەبن لەلایەن خودی ئیبلیسەوە.

فەرموودەمان هەیە نێوانی حەزرەتی ئادەم و حەزرەتی نووح (دە سەدە) بووە كە هەموو لەسەر ئایینی ئیسلام بوون واتا ئایینی ئادەم، شیث و ئیدریس سەرەتای بونیادی شارستانییەت لەنێوان دیجلە و فورات كە بەدۆڵی ڕافیدەین یاخود میزۆپۆتامیا ناسراوە بە پیت و فەڕتر بووە لەناوچەكانی تری دنیا، بۆیە لەدوای وەفاتی ئادەم ئیدریس و كوڕانی شیث توانیان ناوچەكان ئاوەدان بكەنەوە بە زانست و زانیاری، لەدوای ئەوان شارستانییەت چووە ناوچەی كەنعان كە فەڵەستینی ئێستا و شام دەكات، پاشان بۆ میسر، هەڵبەت ماوەی زۆری خایاندووە. بەڵام سەرچاوەكەی ئەمان بوون، لە دوای مردنی ئیدریس عليه السلام (مەهلائیل كوڕی قینان كوڕی ئارنوش كوڕی شیث)ە كە موڵكی ٤٠ ساڵ لەبابل بەردەوام بووە و پادشایەكی دادپەروەر بووە،

---

[٣٩] لەم كتێبەدا كاتێك وشەی حەزرەت بەكار دەهێنرێت تەنها بۆ ڕێز و گەورەییە بۆ پلەو پایەی پێغەمبەران بە گشتی، دەزانین كە هەموو پێغەمبەران وەفات دەكەن بە حەزرەتی عیساشەوە.

[٤٠] إنه كان نبي يخط به، وافق خطه فذاك/مسلم، رقم ٥٣٢ في مساجد.

لە ژیانی خۆیدا مزگەوت یاخود جێگای بەندایەتی زۆری دروست کرد، لەسەردەمی ئەودا ئاسن و مادده کانزاکانی تر بۆ دروست کردنی بیناو زەقورەکانی بابل زۆرێکی تر لە بونیادی شارستانییەت لەسەر دەستی پادشا مەهلائیل دا ئەنجام و بونیاد نراوە، لەدوای مردنی مەهلائیل کورەکەی دێتە سەر حوکمی فەرمانڕەوایی بابل کە ناوی (یرد)ە، لێرەدا دەمەوێت هەڵوەستەیەک بکەین بۆ باوانی ئیدریس کە گوایە لای ئەهلی تەورات هاتووە کە لە نێوان مەهلائیل و یرد دا هاتووە، بەڵام لای نووسەر ئەم ڕایە بە فێڵ دەزانم کە جوولەکە خزاندبێتیە ناو ئەم باسەوە، فەرمووده‌مان هەیە هەرچەندە لاوازە کە ئیدریس لە میسردا بووە، ئادەمیش حەزرەتی ئیدریسی بینیوە واتا ئەگەر کوڕی ڕاستەخۆی ئادەم نەبێت کوڕی شیث-ە، هەرچەندە شیث و ئیدریس لەیەک سەردەمدا بوون، شیث لە بابل و ئیدریس لە میسر، بەڵام ئەم ناوانەی تر هیچی ناگاتە سەردەمی ئادەم عَلَيهِ السَّلَام، ڕاستە ناوی ئانوش هاتووە بە دوایدا قینین هاتووە دوای ئەو ناوی ئەم پادشایە کە مەهلائیل تۆمارە لەیەکەم پادشای بابلی یاخود سۆمەری، دوای ئەو پادشای یرد ناوی هاتووە کە نزیک بووە لە دامەزراندنی دەوڵەتی پارسیا.

بەڵگە بۆ ئەم وتەیە چییە، بریتییە لە مەهلائیل کوڕی قینین یان ناوی بە قینان هاتووە، شارێکی دروست کرد لە خوزستانی ئێرانی ئەمڕۆ بەناوی (سوس)، یردی کوڕی لەو شارە فەرمانڕەوای دەکرد نەک لە بابل، پاشان هیچ ئاسەوارێکمان نییە کە ئیدریس لە عێراق و ئێران دەرکەوتبێت، بەڵام لەسەر نووسینی کۆنی فیرعەونی ناوی ئیدریس هاتووە بە (ئەرمیس) یاخود بە پادشای پادشاکان ناسراو بووە.

یان پێدەچێت ئیدریس عَلَيهِ السَّلَام کوڕی ئادەم کە چۆتە میسر پێش شیث و نەوەکانی مرد بێت، لە خۆشەویستی ئەو لەنێوان مەهلائیل و یرد دا کوڕێکی تریان بووبێت و ناویان نابێت ئیدریس (خنوخ)، ئەم پێشینەیەش هەیە یان جوولەکە دەیەوێت بیگەڕێنێتەوە بۆ بابل و بە عیدانی کردنی پێغەمبەران بکات. هەرچەندە فەرموودەی پێغەمبەرمان هەیە دەفەرمووێت: ئەی ئەبا زەڕ چوار لە پێغەمبەران سریانی بوون ئادەم و شیث و نووح و خنوخ، کە مەبەستی ئیدریسە. هەر ئەویش یەکەم کەس بووە کە بە قەڵەم نووسیویەتی خوای پەروەردگار ٣٠ کتێبی بۆ ناردووە[٤١].

---

[٤١] **قال النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يا أبا ذر أربعة من الرسل سريانيون آدم و شيث و نوح و أخنوخ وهو إدريس، وهو** أول من خط بالقلم وأنزل الله عليه ثلاثون صحيفة./ عبدالله بن أحمد بن محمود، تفسير النسفي ج٣.




هەرچەندە بۆ نووسەر گرنگ نییە ئیدریس عیبرییە یان میسرییە یاخود بابلییە یان هەر جێگایەکی تر، بەڵام لەڕووی مێژوو و ئاسەوارەوە بەهیچ شێوەیەک یەک ناگرێتەوە کە لە میسر بووبێت و لەوێش وەفاتی کردبێت، خۆ ئەگەر بڵێین لە بابل ژیاوە ڕێگای تێدەچێت کە لەنێوانی نەوەکانی شیث لەدایک بووبێت، چونکە پادشای یرد خەڵکی پارسیا و بەدوایدا پادشای (تەهمورث) یان (طهمورش) دێت کە ئەمانە هەموویان فارس بوون، یان لە وڵاتی پارسیادا بوون، ئیبنو ئەسیر دوای ئەم پادشایە ناوی ئیدریسی هێناوە ئەویش لە طەبەری وەریگرتووە.

لێرەدا بەوەندە کۆتایی بە باسە مێژووییەکە دێنم دەگەڕێمەوە بۆ ناو ژیانی ئیدریس عَلَيْهِ السَّلَامُ ، کە مەرجی پێغەمبەر بوون زانستە یاخود سیفەتی پێغەمبەران زانا و دانا بوون، بەڵام نەک بەواتای ئەوەی کە پەیامەکەیان دەرچەی ئەقڵی خۆیان بێت و ناویان نابێت بە ئیلهامی خوایی، وەکو زۆرێک لە ئەقڵانییەکان بەم جۆرە ڕاڤەی دەکەن، نا، بەڵکو مەبەست لە زانا و دانا بوونی پێغەمبەران بەهۆکاری پەیامەکەیان بووە لەلایەن خوای پەروەردگار ئەمەش قورئان ئاماژەی پێداوە.

## زانست سیفەتی پێغەمبەرانە

خوای پەروەردگار پلەوپایەی خەڵکی بەرزکردۆتەوە بەهۆکاری زانست، تەنانەت پلەوپایەی دەوڵەتان و وڵاتانی دنیاش هەر بە زانست بەرز بۆتەوە، ئەو وڵاتانەی کە لە زانست دا پێشکەوتوون لە دنیادا قسە ڕۆشتوون و خاوەن دەسەڵاتن، پێغەمبەرانیش بەرزترین پلەی مرۆڤایەتین، جێگاو شوێنی تایبەتیان هەیە لە دڵی ئیمانداران و هەروەها لای زاتی پەروەردگاریش، قورئان هەمیشە پەیوەندی نێوان پێغەمبەران و زانستی بەیەکەوە بەستۆتەوە، پێناسەی کردوون بە دانشمەند و زانا، لەسەر بنەمای ئەوەی ئەم سیفاتە لازمە بۆ پێغەمبەران و لێیان جیا نابێتەوە کە دەبێت زانا بن، بەو زانستەی لای خوای گەورەوە بۆیان دێت.

خوای پەروەردگار زانستی کردۆتە سیفەتی سەرەکی پێغەمبەران لە ژیانیاندا، ڕۆڵی سەرەکی بینیووە بۆ خەڵکی و چواردەوریان بە گشتی، دەبێت زۆر بەتوانا و لێزان بێت لە دانەوەی زانستەکە بە خەڵکی، چونکە کاری پێغەمبەران گەیاندنی پەیامەکەیە،... ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴿٥٤﴾﴾ النور

واتە:...هیچ شتێکیش لەسەر پێغەمبەران نییە تەنها گەیاندنێکی ئاشکرا نەبێ کە ئایینەکەتان پێ بگەیەنێت.

کەواتە چۆن دەتوانێت شتێک ڕوون بکاتەوە بە جوانی و ڕوونی و شیکراوەیی ئەگەر خۆی زانا نەبێت بەو پەیام و بیروباوەڕە.

لە قورئانی پیرۆز دا هەمیشە ناوی پێغەمبەران کە هاتووە لە تەنیشتیان باسی زانست و زانیاری کراوە، بۆ نموونە ئادەم عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴿٣١﴾﴾ البقرة

واتە: خوای گەورە ئادەمی دروست کرد و ناوی هەموو شتەکانی فێرکرد، پاشان خوای گەورە پرسیاری لە مەلائیکەت کرد دەربارەی ئەو ناوانە و فەرمووی: ئەگەر ڕاست ئەکەن ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن.

لووط عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَلوطا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ﴿٧٤﴾﴾ الأنبياء

واتە: لووط پێغەمبەریش عَلَيْهِ السَّلَامُ پێغەمبەرایەتی و زانست و زانیاریمان پێ بەخشی، ڕزگارمان کرد لە دێی (سەدوم) کە کردەوەی پیسیان ئەنجام ئەدا کە نێربازی بوو، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی خراپ و دەرچوو بوون لە گوێڕایەڵی خوای گەورە.

موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴿١٤﴾﴾ القصص

واتە: کاتێك کە مووسا باڵغ بوو پێگەیشت و دروست کردنی ڕێك و دامەزراو بوو حوکممان پێی بەخشی واتە: پێغەمبەرایەتی و تێگەیشتن لە دین و زانیاریمان پێی بەخشی، بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە هەروەکو چۆن پاداشتی دایکی مووسامان دایەوە.

یعقوب عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا ۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴿٦٨﴾﴾ یوسف

واتە: کاتێك چوونە ناو میصرەوە بەو شێوازەی کە باوکیان فەرمانی پێ کردن لە چەند ڕێگاو دەرگایەکی جیاوازەوە چوونە ژوورەوە، ئەمە نەیپاراستن و هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن لەوەی کە خوای گەورە بۆی دانا بوون، ئەمە تەنها ڕەحم و سۆزو خۆشەویستی بوو لە دڵی یەعقوبدا بۆ مناڵەکانی دەریبڕی، یەعقوبیش خاوەنی زانیاری بووە کە خۆمان فێرمان کردووە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەوەی کە یەعقووب ئەیزانێ نایزانن.

یوسف عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴿٢٢﴾﴾ یوسف

واتە: کاتێك کە پێ گەیشت و کامڵ و باڵغ بوو ئەو کاتە حوکممان پێی بەخشی کە پێغەمبەرایەتییە، و زانیاریشمان پێی بەخشی کە لێکدانەوەی خەوە، بەم شێوازە ئێمە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە.

داود و سولەیمان عَلَيْهِمَا السَّلَامُ: ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾ الأنبياء

واتە: بەڵام ئێمە ئەم حوکم و بڕیارەمان لە سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ تێگەیاند، داود عَلَيْهِ السَّلَامُ وتی: با مەڕەکان هەمووی بۆ خاوەن کشتوکاڵەکە بێ لەبەر ئەوەی زەرعاتەکەیانی خواردووە، بەڵام سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: نەخێر با مەڕەکان لای خاوەن زەرعاتەکە بێ ئەوانیش زەرعاتەکەیان بۆ چاك ئەکەن تا ئەو کاتەی زەرعاتەکە پێ ئەگاتەوە ئەمان لە بەرووبوومی مەڕەکان بخۆن دوایی زەرعاتەکەیان پێ گەیاند مەڕەکانیان بدەنەوەو زەرعاتەکەیش بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە بە چاککراوی، خوای گەورەش ئەفەرموێت: بەم شێوازە ئێمە سولەیمانمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فێر کردو تێگەیاند، هەر یەکێك لەوانەش پێغەمبەرایەتی و زانست و زانیاریمان پێ بەخشی کاتێك داوود زەبووری بخوێندایە و تەسبیحات و زیکری خوای گەورەی بکردایە ئەوەندە دەنگی خۆش بوو شاخەکان و باڵندەکانیش لەگەڵیدا زیکری خوای گەورەیان ئەکرد، ئەوەی کە بمانەوێ ئێمە ئەنجامی ئەدەین. عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿...وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ...﴿١١٠﴾﴾ المائدة

واتە:...فێری نووسین و تێگەیشتنتم کرد و فێری تەورات و ئینجیلم کردیت...

هەروەها بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ﴿٤﴾عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴿٥﴾﴾ النجم

واتە: تەنها وەحیەو لەلایەن خوای گەورەوە بە وەحی بۆی هاتووە﴿٤﴾ جبریل فێری کردووەو لەلایەن خوای گەورەوە هاتووەو وەحی بۆ هێناوە کە زۆر بەهێزەو هێزێکی زۆر سەختی هەیە﴿٥﴾

هەروەها بە پێغەمبەری نازدار دەفەرموێت: ﴿...وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ...﴿١١٣﴾﴾ النساء

واتە:... فێری ئەو شتانەی کردوویت کە لە پێش ئەوەی وەحیت بۆ بێت و تۆ ببیت بە پێغەمبەر نەتئەزانی.

نموونەی تر زۆرە لە قورئاندا بەگشتی کە باسی زانست و زانایی پێغەمبەران دەکات، وەکو نموونەی:

﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴿١٦٤﴾﴾ آل عمران

واتە: بەدڵنیایی خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاند بەسەر باوەڕداراندا کاتێك کە پێغەمبەرێکی بۆیان نارد لە نەفسی خۆیان لە جنسی خۆیان، ئەویش وەکو ئەوان مرۆڤ بوو کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا ئەخوێنێتەوە، ئەوان کە نەخوێندەوار بوون پاکیان ئەکاتەوە لە کوفرو شیرك و تاوان فێری قورئان و سوننەتیان ئەکات، حیکمەت، واتە: سوننەت، هەر چەندە ئەمانە پێش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادا بوون.

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ۝٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ۝٤﴾ الرحمن

واتە: (الرحمن) ناوێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە، واتە: خوای گەورە زۆر بەڕەحم و سۆزو بەزەیی و میهرەبانە، ئەو خوایەی کە۝١ فێرە خوێندنەوەی قورئانی کردوون۝٢ مرۆڤیشی دروست کردووە۝٣ مرۆڤی فێری ناوی هەموو شتەکان کردووە، یان فێری هەموو زمانەکانی کردووە، یان فێری هەموو شتێکی کردووە، یان فێری دەربڕینی پیتەکانی کردووەو بۆی ئاسانکردووە۝٤

﴿فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا۝٦٥﴾ الکهف

واتە: لەوێ بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان بینی کە خضر پێغەمبەر بوو عليه السلام لەلایەن خۆمانەوە ڕەحمەتمان پێی بەخشیووە کە وتراوە: پێغەمبەرایەتی بووە لە لایەن خۆمانەوە فێری کۆمەڵێك زانیاریمان کردووە لە زانینی غەیب و ئەو شتانە کە مووسا عليه السلام نەیزانیوە.

﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ۝٦﴾ سبأ

واتە: بەڵام زانا باوەڕدارەکان وا ئەبینن و باوەڕیان وایە وە ئەزانن کە ئەوەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆت دابەزیوە ئەی محەمەد ﷺ ئەوە حەقە، لەقیامەتیش بە (عین الیقین) دەیبینن، ئەزانن کە ئەم قورئانە ڕێنمایی خەڵکی ئەکات بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە کە خوایەکی زۆر بە عیزەت و باڵادەستە و زۆر سوپاسکراوە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ۝٨٠﴾ القصص

واتە: بەڵام ئەوانەی زانست و زانیاری شەرعییان هەبوو زانایان وتیان: هاوار بۆ خۆتان پاداشتی خوای گەورە لە بەهەشتدا باشترە لەوەی ئێوە دەیبینن بۆ کەسانێك کە ئیماندار بن و

کردەوەی چاکیان کرد بێت، بەڵام کەس ئەم وتەیە وەرناگرێ و کاری پێ ناکات تەنها مەگەر کەسانێك زۆر ئارامگر بن لەسەر جوانی و ڕازاوەیی دونیاو پێی هەڵنەخەڵەتێن.

ئەگەرچی هەموو پێغەمبەران خاوەنی ئەم سیفاتە بەرزەن، بەڵام پێغەمبەرانی سەرەتایی زیاتر سەرقاڵ بوون بە خەڵکیەوە لەبارەی زانستەوە تا بتوانن ڕەوڕەوەی مرۆڤایەتی بخەنە ڕێ و مرۆڤایەتی بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت، کاری هەر چوار پێغەمبەرەکە مەبەستمان ئادەم، شیث، ئیدریس و نووح بەدوایاندا دوو پێغەمبەری تریش هەن هەر بە سەرەتایی هەژمار دەکرێن، ئەوانیش حەزرەتی هوود و حەزرەتی صاڵح پێغەمبەرە سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

## کۆی گشتی باسی ئادەم و شیث و ئیدریس

خوێنەری بەڕێز ماندوومان کردی بە زانیاری زۆر و بۆر، بەڵام لەبیرت نەچێت باسی ژیانی باشترین مرۆڤەکانی سەرزەوی دەکەین و کاتمان بەفیڕۆ نەداوە، بەڵکو (إن شاء الله) خوای پەروەردگار بە بەندایەتی بۆمان دەنووسێت، جا لێرەوە با نیەتی خۆمان پاک بکەینەوە بزانین بۆچی ژیانی پێغەمبەرانمان باس کردووە بەتایبەت لە گەردوون و مرۆڤ و هەموو زیندەوەرانەوە دەستمان پێکرد، پاشان بۆ پێغەمبەران کورت و پوخت بۆ ئەوەی بەندایەتی بکەین فێری وانەبین لەم سێ مەملەکەتەی لەناو مەملەکەتی گشتی پێغەمبەراندا باسمان کرد، ئەبێت بە ئەنجامێک لێیدەربچین یاخود چەند ئەنجامێک کە بێتە ئامانج و هەر ئەنجام نەبێت، پاشان ئەم ئامانجە دەبێت ڕێگامان بۆ نزیک بکاتەوە تا ستراتیژییە گرنگەکە بپێکین.

کۆی گشتی چییە لەم باسەدا؟

## سەرەتای دروستبوونی بەدیهێنراوەکان

ئەم باسە بانگەشەی دڵ مردووی غافڵ لە خوای پەروەردگار دەکات، ئەگەر وەکو باسێکی زانستی بایۆلۆجی بیکەین بە هیچ ئەنجام و ئامانجێک لێیدەردەچین، چونکە باسی زاستێکی موجەڕەد دەکەین. بەڵام ئەگەر گرێمان داوە بە خالقی ئەم کەونە ئەوکات دڵ و لاشە و کردارەکانمان هەموو گەردنکەچ و زەلیل دەبێت بۆ پەروەردگاری، بەڵام بەو مەرجەی وکو وتم نیەتمان بۆ پەروەردگار بێت جا گرنگە بزانین ئەم نیەتە چۆن پاک بکەینەوە و چۆن بتوانین لەناو خودی بابەتەکەدا ئەو پاکژییە بەدەست بهێنین.

سەرەتا بیر بکەرەوە پێش مادده، وزە، گەردوون، ئەستێرە، فریشتە، جنۆکە و مرۆڤ چی هەبووە؟ ئەمە سەرەتایەکی زۆر گرنگە بۆ بیرکردنەوە و پاک بوونەوە، دەنگێک دێت بە ڕاستەوخۆیی پێت دەڵێت: (الله) هەبووە.

ئەگەر پرسیارەکە لات ئاسایی بوو نەیهەژاندی ئەوا کەمێکی تر بیر بکەرەوە بڵێ کێ ئاسمان و زەوی و داروبەرد و دەریا و پێغەمبەرانیشی دروست کردووە؟ خۆ ئەگەر شەیتان یاری دەکات بە گوێچکەو دڵت و دەڵێت ئەی کێ خوای دروست کرد، تۆش بە حورمەتەوە پێی بڵێ ئەی مەلعون وەرە بگەڕێوە بۆ سەرچاوەی هەموو بەدیهێنراوەکان هیچ لە هیچەوە نایەت، بەڵکو دەبێت سەرەتایەک هەبێت چۆن سەرچاوەی ژمارەکان هەموو لە ژمارە (١) وە دەست پێ دەکات، دوای ژمارە (١) (٠) زانراویشە کە سفر خۆی بەتەنها هیچ نییە، دەبێت سەرچاوەی ژمارەیەک هەبێت.

تا سەرچاوەی هەموو ژمارەکانی تر بێت، (١) هەبوو ئینجا ژمارەی تر دێت، کەواتە بنەڕەتی سەرچاوەکان خالقی گەردوونە هەر خۆی هەبووە سەرەتایەو، کۆتاییە هەست بەو ئایینە دەکەیت کە خوای پەروەردگار چ توانا و هێزێکە کە پێوانە ناکرێت و وێنا ناکرێت، هیچ لەو ناچێت، هەنگاوی تر هەڵبهێنەرەوە بۆ قەدری خوای موتەعال ئەو ئایەتە زۆر بخوێنە و بڵێ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ...﴿٩١﴾﴾ الأنعام

واتە: کافران خوای گەورەیان بە گەورە نەزانیوە ئەوەندەی کە خوای گەورە شایەنی بەگەورە زانینە...

کەزانیت و قەدریت زانی ئای چ ئارامی و خۆشی و لەدڵ دەڕوێت و ڕوودەدات، لاشەت شۆڕشێکی بێ وێنە لە خۆیدا دەبینێت.

سەنتەری ئەقڵت بەوە دەست پێ دەکات کە دەڵێیت (الله) سبحان وتعالى سەرەتا خالق و بەدیهێنەری ئەم بوونەیەو پێویستی بە هیچ نییەو هەموو ڕۆژانێک بووە بوونی تۆ نەک هەر نەبووە، بەڵکو ناویشت لەهیچ جێگایەکدا باس نەکراوە، ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا﴿١﴾﴾ الإنسان

واتە: بە دڵنیایی ماوەیەك لەسەردەم و کات بەسەر مرۆڤدا تێپەڕیوە کە هیچ شتێك نەبووە تا باس بکرێ و وجوودو بوونی نەبووە، ئادەم سەرەتا پێش ئەوەی دروست بکرێ بوونی نەبوو و باس نەکراوە، یاخود مەبەست پێی مرۆڤە پێش ئەوەی کە دروست بێ وجوودو بوونی نییە.

کەواتە نە زانست نە فەلسەفە و نە بیروهۆش و تیۆرەکان ناتوانن شیتەڵی ئەم بوونە بکەن لەگەڵ خالقەکەیدا، تەنها و تەنها ئایینی پەروەردگار نەبێت، ئامانج ئەوەیە کە قەدری خوا بزانین، پاشان پەیامبەرەکانی و وەحییەکەی چ ڕێز و حورمەتێکی لە من و تۆی مرۆڤ گرتووە، ئەم گەردوونەی بۆ من و تۆ و باپیران و مرۆڤەکانی هاوڕێمانی دروست کردووە، پێویستە قەدری بزانین وەکو ئەوەی خوای گەورە خۆی داوای دەکات، دەفەرموێت:

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾ الزمر

واتە: کافران و بێباوەڕان خوای گەورەیان بە گەورە نەزانیوە چەندێك شایەنی بە گەورە زانینە و خوای گەورەیان وەکو خۆی نەناسیوە کە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە هەر حەوت ئاسمانەکە لەناو مشتی خوای گەورەدایە لە ڕۆژی قیامەت، هەر حەوت ئاسمانەکە لوول ئەکات و لەناو دەستی ڕاستی خوای گەورەدایە پاك و مونەززەهی و بەرزی و بڵندی بۆ خوای گەورە لەو هاوبەش بڕیاردانانەی کە هاوبەش بڕیاردەران ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنبياء

واتە: لە ڕۆژی قیامەت ئاسمان لوول ئەکەین و ئەیپێچینەوە هەروەکو چۆن سجل و کتێب ئەپێچرێتەوە(٤٢)، چۆن سەرەتا یەکەم دروستکراومان دروست کرد ئاوایش سەرلەنوێ دروستیان ئەکەینەوە لە ڕۆژی قیامەت، ئەمەش بەڵێنێکەو ئێمە داومانەو بە دڵنیایی ئێمە بەڵێنی خۆمان دەبەینە سەرو توانامان هەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٢] ( نیل دیگراس تایسون/ دەنووسێ:

گەردوون بەر لە (١٣/٧) ملیار ساڵ بە تەقینەوەیەکی مەزن دروست بووە و کشاوە،، ئالان گوس دەڵێ: گەردوون لە نەبوون ( عەدەم) دروست بووە لە ماوەی تریلۆنی چرکەیەک کشاوە، بۆ قەبارەی (١٠) کە (٧٨) سفری لە پێش بێت. (عن هذا الکون الفیم/ل: ١٣٧-١٣٨) سەیر بکە.

دیسان دەڵێ: ( گەردوون تا خاڵێ دەکشێ و دەوەستێ پاشان دەچێتەوە ناویەک و کۆتایی دێ، یان بێ کۆتا دەکشێ و لەناو دەچێت. هەمان سەرچاوە/ ل: ١٤٠

بەڵام گەردوون لە قورئاندا داخراوەو لە کشان دەکەوێ و بە چوونەوە ناویەک لە ناو دەچێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ئایەتی ٦٧ی سورەتی (الزمر)ی دەخوێندەوە پاشان بۆ تەمجید و بەرزی پەروەردگاری بە دەنگی بەرز فەرمووی: ئەو مەلیک و شاهو پادشایە، دەسەڵاتدار و بەهێزە، بەتوانا و خاوەنی هێزی تەواوە، خاوەنی عیزەت و بەرزییە، ئەو ڕێکخەرە و سەرپەرشتیارە، زاتی پاکی یەکەم و کۆتایی و سەرەتایە، پاشان مینبەرەکە کەوتە لەرزە لە ترساندا(٤٣)...

مینبەرێکی دار کەوتە جوڵە و لەرزین لە ئەنجامی قەدر و ناوە پیرۆزەکانی خوای موتەعال، ئایا دڵمان چەندە لەرزی، چەندە ڕەنگی دەموچاومان تێکچوو، چ حاڵەتێک لە دڵ و دەروونمان دروست بوو؟ گرنگە بزانین چەندە ئەم باسانە کاریگەری دروست دەکات لەسەر دڵ و دەروونمان چەندە هەستی ڕاستگۆیی و ئیحساسی جوان و پاکت بۆ دروست دەبێت، بپرسە (جەمادێک) بێگیانێک کەوتە جوڵەو لەرزە، هۆکار چییە کە دڵی ئیماندار نالەرزێت، چونکە هەرچەندە بەدوای دروستبوونی گەردوون و جوانییەکانی ژیان، بەڵام لەبیرمان چۆتەوە چۆن سەرەتای هەیە ئەم گەردوونە بەدڵنیاییەوە کۆتایی دێت و کۆتایی هەیە، کەواتە بنەڕەتی پرسەکەمان ئەوەیە کە دەبێت بزانین ئەم هەموو خەلقە کە دروستی کردووە، بە دڵنیاییەوە هەموو دەگەڕێینەوە بۆلای زاتی پاکی، ئەوکات هەست بە لاوازی خۆمان دەکەین، دەڵێین خۆ ئێمە خاوەنی موڵک و سامان نەبووین، تەنها زاتی بەرزی اللەیە کە موڵکی نەبڕاوەیە و هەر ئەو زاتە خاوەنی هەموو شتێکە.

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ۝٦٨﴾ الزمر

واتە: فوو ئەکرێ بە کەڕەناو شەیپووردا لەلایەن ئیسرافیلەوە کە فوو کردنی یەکەمەو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر هەمووی ئەمرێت و تیا ئەچێت تەنها ئەوەی کە خوای گەورە ویستی لێ بێت، کە وتراوە ئیسرافیل خۆیەتی و دواتر خۆیشی ئەمرێت، یان فریشتەی گیان کێشانە، یان هەڵگرانی عەرشی پیرۆزی خوای گەورەن، یان شەهیدەکانن، یان مووسا پێغەمبەرە عَلَيْهِ السَّلَامُ پاشان دووەم جار فووی پیا ئەکاتەوە خەڵکی هەر هەمووی هەڵئەستن و لە گۆڕەکانیان دەرئەچن و تەماشا ئەکەن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٣] يقول عبدالله بن عمر: رأيت النبي في اليوم يصحوا المنبر ينادي بأعلى صوتيه (الزمر:٦٧)، ثم علا صوته و ظل يشير بيده صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: (يمجد الله نفسه يقول أنا الملک... أنا الجبار... أنا القوي... أنا العزيز... أنا المدبر... أنا الأول... أنا الآخر) يقول عبدالله بن عمر: فضل النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسماء الله الحسني فرأيت المنبر يرتجف برسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

لەدوای کێشانی ڕۆحی فریشتەکانیش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ هُم بَـٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾﴾ غافر

واتە: لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکی لە گۆڕەکان دەرئەچن و دەرئەکەون و هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە لە کردەوەکانیان کە لە دونیا کردوویانە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئەمڕۆ موڵك بۆ کێیە؟ کەس نییە وەڵام بداتەوە خۆی ئەفەرمووێ: تەنها بۆ خوای گەورەیە کە خوایەکی تاك و تەنهاو زۆر باڵادەست و بەتوانایە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾ الروم

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە سەرەتا دروستکراوەکان دروست دەکات پاشان لە دوای مردنیش سەرلەنوێ زیندوویان ئەکاتەوە، کە ئەمەیان ئاسانترە لای خوای گەورە، ئەوەی یەکەمیش هەر ئاسانە بەڵام سەبارەت بە عەقڵ و تێگەیشتنی ئێمە ئەمەیان ئاسانترە، نموونەی هەرە بەرز بۆ خوای گەورەیە لە ئاسمانەکان و زەوی، خوای گەورە لە کەس ناچێت و کەس لە خوای گەورە ناچێت و تاك و تەنها و بێ هاوەڵە خوای گەورە زۆر بەعیززەت و باڵادەستە، زۆر کاربەجێیە لە وتەو کردەوەیدا.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾﴾ العنكبوت

واتە: ئیبراهیم ڕێنماییان دەکات بۆ جێگیر کردنی زیندوو بوونەوەو پێیان دەفەرموێت: ئایا نابینن خوای گەورە سەرەتا چۆن دروستکراوەکان دروست ئەکات لە دڵۆپە ئاوێك پاشان دێنە دونیاوەو ئەمرن و دواتریش زیندوویان ئەکاتەوە بە دڵنیایی ئەمە بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە.

باسی خەلق و گەڕانەوەی واتا دروستبوونی کەون و تێکچوونی هەموو گەردوون لەواتای قیامەتی هەیە، دەبێت ئەزەلیەت بۆ خوای پەروەردگار دروست بێت و عیزەتیش بەرانبەر بە شەیتان و بێ باوەڕان.

ئیبن قەیمی جۆزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: گەورەترین دەرگا بۆلای خوای پەروەردگار زەلیل بوون و هەژارییە کە دەریبڕیت بۆ پەروەردگارت، پێغەمبەر ﷺ

دەفەرموێت: لەباسی چوون بۆ میعراج زەلیلی جوبرەئیلمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: وەکو پارچە پەڕۆیەکی کۆکراوەی دڕاو وابوو لەتاو ترس و زەلیلی بۆ خوای پەروەردگار(٤٤).

شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەڵێت: لەهەر دەرگایەکی خوای پەروەردگارم دا پڕ بوو لە خەڵکی، نموونە دەرگای نوێژ، دەرگای ڕۆژوو، دەرگای قورئان خوێندن و زەکات و...هتد، بەڵام لەدەرگای زەلیلی و گەردنکەچی بۆ خوام دا چۆڵ و هۆڵ بوو، خەڵکی زۆر کەم لێبوو، بۆیە لێرە بانگتان دەکەم بۆلای پەروەردگار.

پاشان کە باسی عەرش دەکەین تۆی ئیماندار پێویستە موشتاق بیت بۆ بینینی، ئەو مەخلوقە گەورەیە ئاواتی بۆ بخوازیت بۆ بینینی لە هەردوو دنیادا لە وڵاتەکان و شارەکان، جوانترین بینا و پارک و شوێنی گەشتوگوزاری دروست دەکەن بۆ سەردانی کردنی، من و تۆی ئیماندار دەبێت خۆمان ئامادەدە بکەین بۆ بینینی قیامەت، بینینی عەرشی خوای موتەعال، بینینی میزان و کورسی و هەموو ئەو دروستکراوانەی هەواڵمان پێگەیشتووە لە ڕێگای قورئان و فەرموودەوە، ناساندنیان واتا هەوڵدان بۆ بینینیان، هەوڵدان بۆ گەیشتن پێیان کاتێک باسی قەڵەم دەکەین دەبێت ئەوەمان بیربکەوێتەوە کە ڕابردووو و داهاتوو لای پەروەردگار نییە، کات و شوێن و سەردەم بۆ خوای پەروەردگار بڕیار نادرێت، خوایە و ئاگاداری هەموو دروست کراوەکانیەتی، زانستی تەواوی هەیە بەسەریدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ۝٧﴾ المجادلة

واتە: ئایا نابینی خوای گەورە زانیاری وردی هەیە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیەو ڕووئەدات هیچی لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە، هیچ سێ کەسێك نییە بەیەکەوە بە نهێنی قسە بکەن و چپە چپ بکەن ئیلا خوای گەورە چوارەمیانەو زانیاری پێیانەو ئاگای لێیانە، ئەگەر پێنج بن ئیلا خوای گەورە شەشەمیانە یان لەو ژمارە کەمتر بن یان زیاتر بن ئیلا خوای گەورە لەگەڵیاندایە لە هەر شوێنێك بن، لەگەڵدابوونی خوای گەورە بە بیستن و بینین و زانیاری و تواناو دەسەڵات و ویستێتی، بەڵام زاتی پیرۆزی خۆی لەسەر عەرشە پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا هەواڵیان پێ ئەدات بەو کردەوەو وتانەی کە کردوویانە بەتایبەتی ئەوەی کە چپە چپ و نهێنی بووە، بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانایە بە هەموو شتێك.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٤٤) رايت جبريل يوم المعراج كالحلس البالي من خشية الله.

هەمیشە بەدوای ئەو بەندایەتیانە نەگەڕێین کە خوای گەورە خاوەنی ڕەحمە بۆ چوونە ناو بەهەشتەکەی بۆ نموونە لە ڕووی ئیمانیەوە تەماشای ئەو نیعمەتانەی خوای پەروەردگار بکەین وەکو نموونەی ڕەحمەتی خوا کاتێک کە زەوی و ئاسمانی دروست کرد و زیندەوەرانی بەدیهێنا لە ئەنجامی ڕەحمەتی زۆری پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێوەری کردووە بە ١٠٠ ڕەحمەت، یەک ڕەحمەت و بەزەیی داوەتە دروستکراوەکانی ئەوی تری هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت دابەشی بکات بەسەر بەدیهێنراوەکانی، مەگەر کەسێک خۆی بەرەو هەلاکەت بەرێت دەنا ڕەحمەتی خوای پەروەردگار زۆر فراوانە و ٩٩ ڕەحمەتی بۆ هەڵگرتووین بۆ لێخۆشبوون و بۆ بەزەیی پێداهاتنەوە پیاماندا[٤٥].

بۆ تۆی خواناس کە شارەزا نیت لەبواری زانستی بایۆلۆجی و گەردوونی و جیۆلۆجی گرنگە بگەڕێیت بەدوای نهێنییەکانی بەندایەتی، بەڵام لە کۆتاییدا نەبیتە ڕێگر لەوەی کە لە بواری زانستی دەکۆڵێتەوە، چونکە هەرکەسە و تایبەتمەندە لەبواری خۆیدا و بەشی خۆی دەبات لە بەندایەتی، بگەڕێ بزانە خوای پەروەردگار کە هەموو بەدیهێنراوەکانی دروست کرد لەسەر عەرشی خۆی چی نوسیووە؟ نووسیویەتی: ڕەحمەت و بەزەیم پێش توڕەیی و تۆڵە سەندەنەوەم کەوتووە، ئەوە بۆ من و تۆی ئیماندار گرنگە[٤٦].

کەواتە خوێنەری بەڕێز هەر لە ئێستاوە بە حساباتی خۆتا بچۆرەوە و بزانە دەتوانی چی بکەین بۆ میللەت و خەڵکی موسڵمان و لە پێش هەموویەوە بۆ خودی خۆت؟

لەبیرت نەچێت و بیرت دەهێنمەوە کە خوای پەروەردگار من و تۆی کردۆتە خەلیفە واتا جێنشین بۆ پیادەکردنی بەرنامەی خوا، دەزانی چەندە واتا و مانای گەورەی هەیە، هەروەها واتای سەربەرزی و دانایی و ڕێز و حورمەتە لای خوای گەورەوە، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێت کە خۆڵ و خاکی، لە خاک و ئاو دروست بوویت کە دەکاتە قوڕ، ئەمەش دەبێت تەوازوع و زەلیلیت پێ ببەخشێت کە زانیت حەقیقەتت لە خۆڵە، دەبێت هەرگیز لوتبەرز نەبیت، خۆت بە لاواز بزانیت کە لە ڕاستیدا مرۆڤ لاوازە، بزانیت دوژمنێکی سەرسەخت هەیە ئەویش شەیتانە

---

[٤٥] - جعل اللهُ الرحمةَ مائةَ جُزء ، فأمسك عنده تسعةً وتسعين جزءًا ، وأنزل في الأرضِ جزءًا واحدًا ، فمن ذلك الجزء تتراحمُ الخلقُ حتى ترفعَ الفرسُ حافرَها عن ولدها خشيةً أن تُصيبه/البخاري

واللفظَ لمسلم: إنَّ اللَّهَ خَلَقَ يومَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأرْضَ مائَةَ رَحْمَة، كُلُّ رَحْمَةٍ طِبَاقَ ما بيْنَ السَّمَاءِ وَالأرْضِ، فَجَعَلَ منها في الأرْضِ رَحْمَةً؛ فَبِهَا تَعْطِفُ الوَالِدَةُ علَى وَلَدِهَا، وَالْوَحْشُ وَالطَّيْرُ بَعْضُهَا علَى بَعْضٍ، فَإِذَا كانَ يَوْمُ القِيَامَةِ أَكْمَلَهَا بِهذِه الرحْمَةِ/مسلم

[٤٦] عن أبي هريرة رضيَ اللَّهُ عنه قَالَ: قَالَ رسُولُ اللَّه صَلى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم: (لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الخَلْقَ، كَتَبَ في كِتَابٍ، فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ: إنَّ رَحْمتي تَغْلِبُ غَضَبِي)، وفي روايةٍ : (سَبَقَتْ غَضَبِي)متفقٌ عَلَيْه

لەسەر ڕێگات دانیشتووە بۆ ئەوەی ڕێگای خراپەت بۆ ڕوون بکاتەوە، لەهەمانکاتدا وەرزش بە نەفسی خۆت بکەیت تا هاوکارت نەبێت بۆ ڕێگای شەیتان، خوای پەروەردگار ڕۆحی پێشکەش کردوویت کە ئەم ڕۆحە تایبەتە بەتۆی مرۆڤ لە خانەی زیندووەوە بتکات بە مرۆڤی خاوەن دڵ، ئەقڵ، نەفس، هۆش و پەیوەندی توندوتۆڵ بە خواوە ببەستێت و بەڕێگای پیاوچاک و پێغەمبەراندا بڕۆیت، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسی دا لەسەرزمانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بەندەکەم لە نەبوونەوە بەدیهێنایت و بینین و بیستن و ئەقڵ و دڵم بۆ بونیاد نایت، بەندەکەم من داپۆشەری عەیب و کەموکورتیەکان و تاوانتم کەچی لێم ناترسی و گوێڕایەڵیم ناکەیت، بەندەکەم من لە بیرت ناکەم کەچی تۆ منت لەبیر کردووە، بەندەکەم شەرمت لێ دەکەم کەچی تۆ شەرم لەمن ناکەیت، کێ هەیە لەزاتی من گەورەتر و بەرزتر و خاوەن بەخشندەیی و ڕێز کە لە تۆی نابێت، کێ هەبوو لە دەرگای من بدات و وەستا بێت تا من دەرگام بۆ نەکردبێتەوە، کێ هەیە داوای لەمن کردبێت و پێمنەبەخشیبێت، من بەخیلم و ئێرەیی دەبەم یان تۆ بەندەکەم، یاخود من بەخیل نیم کەچی بەندەکانم بەخیلن بەرانبەر بە من[٤٧].

ئەم فەرموودە قودسیە چەندە واتای قووڵ و بەزەیی و ڕەحمەتی تێدایە، دڵ دەهەژێنێت.

لەڕاستیدا کاتێک ئەم فەرموودانە دەخوێنمەوە شەرم دەکەم، دەزانم تۆی خوێنەریش شەرم ئەتگرێ لەبەزەیی و سۆز و میهرەبانی پەروەردگارمان، کەواتە خوای پەروەردگار هەموو دەرگایەکی بۆ خستوینەتە سەر پشت بڕۆینە خزمەتی داوای لێ بکەین، ئەگەر هەرچی ڕوویدا لەدواییدا کە ڕێگای خوای پەروەردگارمان نەگرت پێویستە لۆمە و سەرزەنشتی خۆمان بکەین، بۆیە پێویستە هەمیشە سوپاسی خوای پەروەردگار بکەین، چونکە لەدوای ئادەمەوە مرۆڤی زۆر تایبەت دروست کردووە و ڕۆحی کردووە بە بەریدا، ڕۆح بەبەردا کردن هەروا ئاسان نییە، پەیوەندی بەستنە بە خوای موتەعال، بۆیە کە ڕۆح کرا بە بەری ئادەم دا، واتا مەبەست لە زیندوێتی مرۆڤ بوونی ئادەم نییە، بەڵکو ڕۆح چوون بەبەریدا بەو واتایەی ئەرکی بەندایەتی کەوتە سەرشان، بۆیە لەکاتی ڕۆح کردن بەبەریدا (پژمی) بۆیە فریشتەکان فێریان کرد بڵێت (الحمدلله) خوای پەروەردگاریش وەڵامی دایەوە و فەرمووی (یرحمک الله) واتا پەروەردگارت ڕەحمەت پێ بکات، دروستبوونی ئادەم و بوون بە پێغەمبەر هەمووی ڕووداوی گرنگە بۆ مرۆڤایەتی، بڵاوبوونەوەی بەزەویدا خۆی و نەوەکانی، هەر خێروبەرەکەت بوو. ئەو ڕۆژەشی

---

[٤٧] يقول الله تبارک وتعالي في الحديث القدسي: (عبدي أخرجتک من العدم إلي الوجود، أنشأت لک السمع والبصر والعقل والقلب، عبدي أسترک ولا تخشاني، عبدي أذكرک وتنساني، عبدي أستحي منک ولاتستحي مني، فمن أعظم من جودا وكرما، من ذا الذي يقرع بابي فلا أفتح له، ومن ذا الذي يسألني فلا أعطيه، أبخيل أنا كبخيل عبدي علي).

کە دنیا کۆتایی دێت هەر هەمان ڕۆژە کە ئادەمی تێدا دروست بووە، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی هەینییە، چونکە باشترین ڕۆژی هەفتەیە لەبەر بەندایەتی و پاشان ئادەمی تێدا دروست بووە و مردووە. بەهەمانشێوە دەستی کردووە بە بانگەواز لەسەر زەویدا و ڕۆژی قیامەتیش لەو ڕۆژەدایە، ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.[٤٨]

بۆیە لەو ڕۆژەدا سوننەتە مرۆڤ خۆی بشوات، خۆی بۆنخۆش بکات، پاشان سڵاوات دانە لە پێغەمبەر ﷺ، چونکە هەمان سیفات و پێناسەی ئادەمە، پاشان جلوبەرگی جوان و پاک و خاوێن، هەروەها سیواک و پاکوخاوێنی دەمودان و چوون بۆ نوێژی جومعە.

نەک بۆ سەیران و هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەک، بەداخەوە ئێستا بۆ سەیرانی ڕۆژانی جومعە بەو شێوەیە خۆیان دەڕازێننەوە نەک چوون بۆ مزگەوت، خەڵکێک هەیە لەو ڕۆژەدا مەی دەخواتەوە و خراپەکاری دەکات! لەکاتێکدا لەبەر ئەوەی کە ئادەمی تێدا دروست کراوە دوعای تێداگیرا دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لە ڕۆژی جومعەدا کاتێکی تێدایە کە بەندە موسڵمانەکان داوا بکەن لە خوای گەورە، خوای گەورە پێیان دەبەخشێت. زانایان دەڵێن ئەو کاتەیە کە ئادەمی تێدا دروست بوو، ئادەمیش لە ڕۆژی جومعە لە نێوانی عەسر و شەو دا لەدایک بووە[٤٩].

پاشان لە نەفسی هەموو نەوەکانی دوای ئادەم، واتا مرۆڤایەتی لەدوای هاتنی پێغەمبەرایەتی خوای گەورە لە نەفس و فیطرەتیاندا بوونی خوای تێدا ڕواندووە، ڕۆژی قیامەت هیچ کەس ناتوانێت بڵێت نەمزانی خوا هەیە! بەڵکو خوای پەروەردگار لە ڕێگای دروستکراوەکانییەوە خۆی دەناسێنێت بە فیطرەت و بە سرووشتی خەڵکی ئاقڵ و شێت و دانا و نەدان فەیلەسوف و جاهیل، هەموو لە هەست و ناخیاندا هەیە کە پەروەردگارێک هەیە و دەبێت بیپەرستن، ئەمەش لە باوکە ئادەمەوە وەرمانگرتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردووین[٥٠].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٨] خير اليوم طلعت عليه الشمس يوم الجمعة، فيه خلق آدم و فيه نزل إلى الأرض، وفيه منت وفيه تقوم الساعة./رواه مسلم.

[٤٩] في اليوم الجمعة ساعة لا يصادفها عبد مسلم يسأل الله حاجة إلا أعطاه إياها/مسلم.

خلق آدم بعد العصر من يوم الجمعة في آخرالخلق في آخر ساعة من ساعات الجمعة فيما بين العصر والليل/البخاري.

[٥٠] عن أبي هريرة رضِي الله عنه ، قال: قال: رسول الله صلى الله عليه وسلم لما خلق اللهُ آدمَ مسح ظهره، فسقط من ظهره كل نَسمة هو خالقها من ذُرِّيته إلى يوم القيامة/رواه الترمذي.

خوای گەورەش دەفەرموێت:

﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ﴿١٧٢﴾﴾ الأعراف

واتە: پەروەردگار کاتێك کە ئادەمی دروست کرد هەرچی نەوەی ئادەم هەیە تا ڕۆژی قیامەت هەر هەمووی لە پشتی ئادەم دەرکرد و کردنی بە شایەت بەسەر نەفسی خۆیانەوە، خوای گەورە پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ هەرچی نەوەی ئادەم هەیە هەر هەموویان وتیان: بەڵێ شایەتی ئەدەین کە تۆ پەروەردگاری ئێمەی، خوای گەورە فەرمووی: بۆیە ئێستا پێتان ئەڵێم تا لە ڕۆژی قیامەت نەڵێن ئەی پەروەردگار ئێمە لە یەکخواپەرستی تۆ بێ ئاگاین و نەمانزانی کە تۆ تاك و تەنهایت و شەریکت نییە.

هەموو ئەوانەی لە ئەنجامی پێغەمبەر ئادەم بوو کە باوکی بەشەریەتە، ناوی خێزانی لەگەڵیدا ئەگەرچی لە قورئان دا نەهاتووە، مەدلولی گەورە و مەبەستی سەرەکی تێیدا کە پیاو و ژن هەردووکیان لەیەک سەرچاوەن، ئەویش مرۆڤە و جیاواز نییە، چونکە زۆرێك لە بیروباوەڕەکان و کۆمەڵگەکان پێیان وایە ئافرەتان مەخلوقێکی ترە و مرۆڤ نییە، بەڵام خوای پەروەردگار هاوشانی ئادەم هێناویەتی و هەروەکو ئادەم مرۆڤە، لە زۆر ئایەتەکاندا باسی نەژادی پیاو و ژن کراوە کە یەک سەرچاوەن، تەنانەت زۆرێک لە ڕاڤەکاران بەو چاوەوە لێکیان داوەتەوە بە ئادەم‌و حەوا.

کەواتە وانەی حەوا ئەوەمان بۆ دەردەخات ئافرەتیش هاوشێوەی پیاوانن مرۆڤن و کاری ژیان دابەش کراوە لە نێوانیاندا.

پاشان مرۆڤ کە دەبێتە خاوەنی ئایین دەچنە بەهەشت، ئادەم بووە پێغەمبەر ئەوە بەهەشتی و ڕێگای بەهەشتی بوو خۆشی و گەڕانی لەسەرزەویدا بانگەوازەکە بوو، بڵاوکردنەوەی نەوەکانی بوو. ئیتر هەندێک لەم نەوانە خۆیان زوڵم لە نەفسی خۆیان دەکەن، چونکە خوای پەروەردگار زوڵم لەکەس ناکات، هەروەکو چۆن نەوەکانی ئادەم وەک قابیل زوڵمی کرد لە هابیل، باشترین وانەیە بۆمان ئەگەر لێی تێبگەین، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: لە فەرموودەیەکی قودسیدا ئەی بەندەکانم من زوڵم کردنم لەسەر خۆم حەرام کردووە، پاشان لەنێوان ئێوەشدا حەرامم کردووە کەواتە زوڵم لەیەکتری مەکەن، ئەی بەندەکانم ئێوە هەموو سەرلێشێواو بوون هیدایەت لای منە، داوای هیدایەت و ڕێنمونیم لێ بکەن تا هیدایەتتان بدەم، ئەی بەندەکانم، ئەی بەندەکانم ئێوە هەموتان برسی بوون تێرم کردن، ئێوەش من تێر بکەن (مەبەست خواردن و پارەیە بدەن بە هەژاران) زیاتر تێرتان دەکەم، بەندەکانم ئێوە هەموو

ڕوت و ڕەجاڵن، من پۆشتە و پەرداخم کردن، ئێوەش من دابپۆشن تا داپۆشەرتان بم (مەبەست دەستەبەرکردنی جلوبەرگە بۆ هەژاران و نەداران)، ئەی بەندەکانم ئێوە هەڵە دەکەن بەشەو و ڕۆژ من لە هەموو تاوانەکانتان خۆش دەبم، داوای لێخۆش بوون بکەن با لێتان خۆش بم، ئەی بەندەکانم ئێوە نەدەتوانن ببنە هۆکاری زیان گەیاندن پێم و ژیانم پێ ناگەیەنن، بەپێچەوانەشەوە نابنە هۆکاری سوودگەیاندن و سوودیشم پێ ناگەیەنن، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەستان تا کۆتا کەستان لە جنۆکە و مرۆڤەکان کۆببنەوە لە سایەی دڵی کەسێک دا واتا بەرەو تەقوا، هیچ لە موڵک و سامانم کەم و زیاد ناکات، بەپێچەوانەوە یەکەم کەستان تا کۆتا کەس لە جنۆکە و مرۆڤ کۆببنەوە لەسەر دەستی کەسێک سەرکردایەتیتان بکات بۆ خراپەکاری هیچ لەموڵک و سامانم کەم ناکات. ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەستان تا کۆتا کەستان لە جنۆکە و مرۆڤ کۆ ببنەوە و داوام لێ بکەن، وەڵامی هەموتان ئەدەمەوە، ئەوەشی داوا دەکەن پێتان دەبەخشم هیچ لەموڵکم کەم نابێت، وەکو ئەوە وایە دەرزییەک بکەیت بە زەریایەکدا. بەندەکانم ئەوە بەڕاستی کردەوەکانی خۆتانە لەسەرتان هەژمار دەکرێت، ئەگەر لەکردەوەکانتان چاکەتان هەبوو ئەوە سوپاسی خوای لەسەر بکەن.

خۆ ئەگەر لەکردارەکانتاندا شتی زشت و خراپەتان کرد و بینیوە لەقیامەت ئەوا تەنها لۆمەی نەفسی خۆتان بکەن[٥١].

زوڵم و زۆرو لوتبەرزی لەیەک سەرچاوەیە، نەخۆشییەکی زۆر کوشندەیە لە ڕۆژی قیامەت دا ئەوانەی لوتبەرزن خوای پەروەردگار زەلیلیان دەکات، دەیخاتە ژێر پێی خەڵکی ئەوەش

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٥١) عن أبي ذر الغفاري رضي الله عنه ، عن النبي ﷺ فيما يرويه عن ربه عز وجل أنه قال: يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي ، وجعلته بينكم محرما فلا تظالموا ، يا عبادي كلكم ضال إلا من هديته ، فاستهدوني أهدكم ، يا عبادي كلكم جائع إلا من أطعمته ، فاستطعموني أطعمكم ، يا عبادي كلكم عار إلا من كسوته ، فاستكسوني أكسكم ، يا عبادي إنكم تخطئون بالليل والنهار ، وأنا أغفر الذنوب جميعا فاستغفروني أغفر لكم ، يا عبادي إنكم لن تبلغوا ضري فتضروني ، ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني ، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أتقى قلب رجل واحد منكم ما زاد ذلك في ملكي شيئا ، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أفجرِ قلب واحد منكم ما نقص من ملكي شيئا ، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني ، فأعطيت كل واحد مسألته ما نقص ذلك مما عندي إلا كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر ، يا عبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم ثم أوفيكم إياها ، فمن وجد خيرا فليحمد الله ، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه/رواه مسلم.

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوینەتێ و دەفەرموێت[٥٢] ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی هێندەی مسقاڵە زەرەیەک لوتبەرزی و خۆبەزل زانی لەدڵیدا بێت[٥٣].

زوڵم و زۆر و شیرک و لوتبەرزی قۆناغن، مرۆڤ کە خۆ بەزلزان بوو هەوڵی زوڵم کردن ئەدات، کە زوڵمی کرد ئەکەوێتە ناو شیرکەوە، جا لەبەر ئەوە ئاگات لە هاوسەرەکەت بێت یان بە پێچەوانەوە ژنان زوڵم مەکەن لە هاوژینەکانتان، یان لە خزمەتکار و کرێکار، یاخود مامۆستا لە قوتابی یان بازرگان لە موشتەری...هتد. زوڵم مرۆڤی ئیماندار کوێر دەکات ئیمان لە دڵیدا ناهێڵێت ڕۆشنایی ئیسلام خامۆش دەکات.

لوتبەرزی پیشەی ئیبلیسە خۆی سەرگەردان کرد، منداڵی ئادەمیشی وەکو خۆی سەرگەردان کرد بە هۆکاری لوتبەرزی و زوڵم لەخۆ کردن و لەخەڵک کردن. دەبێت ئاگات لەخۆت بێت و زوڵم لە خۆت نەکەیت، زوڵم لەخۆ کردن نەدانی حەقی بەندایەتییە بۆ خوای پەروەردگار.

هەرگیز ناوی ڕاستی شتەکان مەگۆڕن وەکو شەیتان کردی کە دارە حەرامکراوەکەی ناونا بەداری ئەبەدی (شجرة الخلد) کێشەی ئەمڕۆ ئەو گۆڕینی ناو و پێناسەیە، بۆ نموونە عارەق و مەی ناونراوە بە مەشروباتی ڕۆحی وەکو ئەوەی تەنها مەی ڕۆح تێر بکات، بۆ ئەم ناوە؟ بۆ ئەوەی دوور بکەوێتەوە مرۆڤ لە زیکر و یادی خوا تا ڕۆحی پەروەردە بکات، شەیتان لەجیاتی ئەوە حەرامی بۆ داناوە.

یاخود (ڕیبا)ی ناو ناوە بە ئابووری پێشکەوتوو، ڕوتوقوتی ناوناوە بە لەشجوانی و ئازادی پۆشین و مۆدێل، بێ ئایینی و ئیلحاد ناونراوە بە ئازادی ڕادەربڕین، بە پێچەوانەوە موسڵمانی خواناس و سەر ڕاست ناونراوە بە ڕادیکاڵ و ئیرهابی، ئافرەتی داپۆشراو و بەڕێز دەڵێن وەکو یاپراخ خۆی پێچاوەتەوە، قسەی تریش کە لێرەدا شیاوی باس نییە، ڕیش هێشتنەوەی پیاو و شەرواڵی کورت هەمووو ئەمانە بۆتە جێگای تانە دان، بۆیە پێناسە و ڕاستییەکان ون بوون، ئەوەش کاری شەیتانە دەبێت هەموو ڕاستییەکان وەکو خۆیان باس بکرێن.

کەواتە لە ڕووداوی ئادەم و ململانێیی شەیتان پێویستە فێر بین کە تاوان نەکەین، چونکە تاوان تووشی ناڕەحەتی و چەرمەسەریمان دەکات لە دنیا و لە قیامەت دا و دەبێتە هۆکاری چەندین نەهامەتی بۆ خاوەنەکەی.

---

(٥٢) يُحشَرُ المتَكَبِّرونَ يومَ القيامةِ أمثالَ الذَّرِّ في صُوَرِ الرِّجالِ يغشاهمُ الذُّلُّ من كلِّ مَكانٍ ، يُساقونَ إلى سجنٍ في جَهَنَّمَ يسمَّى بولُسَ تعلوهُم نارُ الأنْيارِ يُسقونَ من عُصارةِ أهْلِ النَّارِ طينةَ الخبالِ/الترمذي.

(٥٣) لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَن كانَ في قَلْبِهِ مِثْقالُ ذَرَّةٍ مِن كِبْرٍ/حيح مسلم، ابوداود و الترمذي.

یەکەم: تورەبوونی خوا: مرۆڤ کە تاوان دەکات خوای پەروەردگار لەخۆی تورە دەکات، خوای پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرموێت: من اللهم و بێجگە زاتی من هیچ خوایەکی تر نییە، ئەگەر گوێڕایەڵ بیت ئەوا ڕازیم لێت، بەڕاستی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بەرەکەتە، کەرەمی خوای پەروەردگار کۆتای نییە، پاشان دەفەرموێت: ئەگەر سەرپێچی بکەیت ئەوا تورە دەبم، خۆ ئەگەر خوای پەروەردگار تورە ببێت ئەوا لەعنەت دەکات، واتا دوورت دەخاتەوە لە ڕەحم و بەزەیی خۆی، کە ئەم لەعنەتە ٧ نەوە دەگرێتەوە! (خوای گەورە پەنامان بدات) [٥٤].

دووەم: موسڵمان ڕقت لێ هەڵدەگرن: هۆکاری تاوانکردنە کە موسڵمانان ڕق و بوغز لەتاوانباران هەڵدەگرن، شێخ حەسەنی بەصری دەڵێت: خۆتان بپارێزن لە لەعنەتی دڵی ئیماندار کە خۆشی هەستی پێ ناکات.

کە ئیمانداران لەدڵەوە لەعنەتی دەکەن و ئەو لەعنەتەش تاوانبار دەگرێتەوە خوای گەورە لەعنەتەکەی بەسەردا دەکات[٥٥].

سێیەم: مرۆڤی تاوانبار و گوناهبار دووردەکەوێتەوە لە زانست و واتا مەحروم دەبێت لە زانستی شەرعی و تەنانەت زانستی دنیایی.

ئیمامی شافیعی شیعرێکی زۆر نایابی هەیە لەوبارەیەوە کە بەسەر خۆی هاتووە لە بازاڕی بەغداد بەرەو لای وەکیع-ی مامۆستای دەڕوات[٥٦] چاوی بە ئافرەتێک دەکەوێت تووشی نەزەر دەبێت، ئەوەی ئامادەی کردووە بۆ مامۆستاکەی هەمووی لەبیر دەچێتەوە، پاشان سکاڵای لەبیر چوونەوەکەی بۆ وەکیعی مامۆستای دەکات، ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێت: کە زانست نوورە ئەو نوورەش هیدایەت و ڕێنموونی تاوانباران ناکات، بە پاڕانەوە و بەندایەتی دەگاتە زانست (رب زدني علما) [٥٧].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٤] يقول الله تبارك وتعالى في القدسيات: أنا الله لا إله إلا انا، إن أطعت رضيت وإن رضيت باركت، وبركتي ليس لها منتهى، وإن عصيت غضبت، وإن غضبت لعنت، لعنتى تصل الى السبع من الولد/ رواه أحمد.

[٥٥] يقول الحسن البصري ليغدر احدكم ان تلعنه قلوب المؤمنين وهو لايشعر، يعمل بمعصية الله فيلقي الله بغضبه في قلوبهم.

[٥٦] هەرچەندە دەڵێن ئەم رووداوە لە میسر ڕوویداوە نەك عێراق.

[٥٧] شَكَوتُ إِلى وَكيعٍ سوءَ حِفظي.

فَأَرشَدَني إِلى تَركِ المَعاصي

<===

مرۆڤی خاوەن تاوان لەبەر تاوانەکانی نایپەرژێتە سەر وەرگرتنی زانست.

چوارەم: دەبێتە هۆکاری کەمی ڕزق و ڕۆزی، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: کەسێک تاوان دەکات دەبێتە هۆکاری بڕانی ڕزق و ڕۆزی لەبەر تاوانەکەی.[٥٨]

پێنجەم: شەرم کردن لەخواو دوورکەوتنەوە لەخوای پەروەردگار بەهۆکاری تاوانکردن، مرۆڤ کە تاوان دەکات شەرم دەیگرێت و دوعاو پاڕانەوە و نوێژ بکات بەهۆکاری زۆری تاوان.

شەشەم: شەرم کردن لە خەڵکی و سەرشۆڕی لەناو کۆمەڵگادا و نەبوونی متمانە بە تاوانباری گوناهەکان، بەهۆکاری ئاکار و ڕەوشتی لەناو کۆمەڵگادا بێزراوە.

حەوتەم: دوورکەوتنەوە لە بەندایەتی و خواناسی، هۆکارەکەی تاوانە، مرۆڤ زۆر لاواز دەکات لەبەندایەتی خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ).

هەشتەم: تاوان دڵ ڕەق دەکات و سۆز و میهرەبانی ناهێڵێت و مرۆڤ لە ڕەحم و بەزەیی دوور دەخاتەوە.

نۆیەم: گۆڕانکاری بەسەر نیعمەتەکانی ژیان: تاوانکردن دەبێتە هۆکاری خراپی خێزان و منداڵ و گۆڕانکاری بەسەر نیعمەتە باشەکانی ژیان دێت بۆ خراپە.

دەیەم: بەستنی زمان: تاوانی زۆر مرۆڤ وا لێدەکات ناتوانێت ڕاستی بڵێت، یاخود حەق بڵێت، تەنانەت کاتی سەرەمەرگ توانای وتنی شایەتمانی نییە.

ئێمەش موسڵمانین دەمانەوێت بە موسڵمانی بژین و بمرین خوای گەورە دەفەرموێت:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴿١٠٢﴾ آل عمران

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

وَأخبَرَني بِأنَّ العِلمَ نورٌ

وَنورُ اللَهِ لا يُهدى لِعاصي

(٥٨) علي بن محمد ثنا وكيع عن سفيان عن عبد الله بن عيسى عن عبد الله بن أبي الجعد عن ثوبان قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم وإن الرجل ليحرم الرزق بالذنب يصيبه/رواه أحمد.

واتە: ئەی باوەڕداران تەقوای خوای گەورە بکەن ئەوەندەی کە خوای گەورە شایەنێتی، ئێوە مەمرن ئیلا لەسەر ئیسلام نەبێ و بە موسڵمانێتی نەبێ، ئەوەی لەسەر هەر شتێك بژی لەسەر ئەوەیش دەمرێت، لەسەر ئەوەیش زیندوو دەکرێتەوە.

ئەی چۆن دەتوانین کۆتایی بە تاوان بهێنین؟!

١. بە پاککردنەوەی دڵ و دەروون (جهاد النفس).

٢. ئاگادار بوون لە فێڵی شەیتان و چاودێریکردنی خۆمان.

٣. دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ و بێدین.

٤. سوپاسگوزاری خوا بە وشەی (الحمدلله) و بەگشتی یاد و زیکری خوای موتەعال.

٥. زۆر خوێندنی قورئان.

٦. بەردەوامی لە نوێژ و چوون بۆ مزگەوت.

٧. گوێگرتن لەوانە ئایینییەکان و چوون بۆ مەجلیسی مامۆستایان.

٨. زۆر خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەران.

٩. خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

١٠. زوو زوو تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوە، هەوڵدان بۆ کردنی سوننەت.

ئەمەش وامان لێدەکات کە دووربکەوینەوە لە هەموو دارێک کە بەرووبوومی سەوزی حەرامی هەیە و باوکە ئادەم و دایکە حەوا فێریان کردین.

چونکە مرۆڤ لەکاتی تاواندا نابێت دڵخۆش بێت بەڵکو دەبێت غەمگین و بێزار بێت.

لەکتێبی مێژوودا هاتووە ئادەم کە لە دارەکەی خوارد بەهۆکاری ئەو تاوانەی هەمیشە خەفەتبار بوو، بەڵام ئیبلیس خۆشحاڵ بوو بە تاوانەکەی خۆی پێوە با ئەدا و داوای کاتی زیاتری دەکرد بۆ تاوان کردن، لەهەمووی ناهەموارتر تاوانەکەی دایە پەنای خوای پەروەردگار، بێئەدەبی کرد لە حوزوری خوای موتەعال.

پاشان ئەوەی گرنگە لەم باسەدا ئەوەیە مرۆڤ هەوڵبدات باشە و چاکەی دایکی و باوکی وەربگرێت، هەروەکو چۆن شیث و ئیدریس لەباوکیان ئادەم فێری زانستی ژیان بوون، تا توانیان کۆمەڵگە دروست بکەن و خەڵکی کە کۆچکردن و خواردنی بەرووبوومی دار و ئاژەڵ فێر بکەن بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، بوونیاندنانی زانست لەناو خەڵکیدا ئەگەر چی هەمووشی سەرەتایی بووە، بەڵام پێغەمبەران سەرچاوەی داهێنانی بوون، ئەگەرچی وەکو ئاماژەشمان پێداوە زۆر سەرەتایی بووە، بەڵام بۆ ئەو سەردەمە گرنگ بوو مرۆڤەکان هەر ئەوەندە توانیویانە وەربگرن.

## پوختەی باسە مێژووییەکان

هەروەکو زانراوە بەڵگەیەکی ئەوتۆ لەبەردەستا نییە بۆ سەردەمی ئەو سێ پێغەمبەرە لە مێژوودا، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگە، سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین ئەم سێ پێغەمبەرە هەنگاویان ناوە بۆ بونیادنانی شارستانییەت و ژیار، بەڵام لەسەردەمی ئەماندا دروست نەبووە، وەکو بەڵگەی مێژوویی، خۆ ئەگەر هەبووبێت و لەناوچووبێت هیچ بەڵگەیەکمان لانییە، بەڵام بەڵگەی ئەوتۆ لەبەردەست نییە و هەموو مەزەندە کردنە، ئەو نەوانەی لەنێوان ئیدریس و شیث دا باسکراون پادشای سەرەتایی بوون، بەڵام بێ جێگای دیاریکراوی شارستانی دەشێت وەکو سەرۆک هۆز و کۆمەڵگە سەرەتا بەکات ناسرا بێت، بەڵام دەرکەوتنی ئەم پێغەمبەرانەو سەرەتای بونیادی خێزان و کۆمەڵگە و کۆبونەوەیان لەناوچەکانی میزۆپۆتامیا کە بێ ژیار بووە، واتا ژیانی سەرەتایی ژیاون، گرنگی سەردەمی ئەم پێغەمبەرانە زانینی ناوی کەرەستە و شتومەکەکانی دەوروپشتیان بوو، بونیادی زمان و پێداویستی ئەو چاخە بوو، کە مرۆڤەکانی تێدا ژیاون [٥٩].

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٥٩) وەکو ( (د. خزعل الماجدي) لە کتێبی ( جورا الا لهة) دا ( ل: ١٢٤) دا ئاماژە دەکات: یەکەم مرۆڤی ژیر وەکو بەڵگەکان پیشانی دەدەن لە دۆڵی دووزێ بووە لە: ئەثوبیا، بەر دەکوکا، چەمچەماڵ لە نێوان (٥٠٠٠٠٠-١٠٠٠٠٠) ساڵ پ.ز. یەکەم مرۆڤی نیاندرتاڵ لە (١٠٠٠٠٠-٤٠٠٠٠٠) پ.ز. بووە لە شانەدەر، مرۆڤی ژیر (٤٠٠٠٠-١٠٠٠٠٠) پ.ز بووە لە شانە دەر و ڕەزازە.

بێگومان گوتییەکان وەکو ( ج.ار. درایڤەر) تاووتوێی کردووە، وەکو ( ئونکلوس) دەڵێ: کەشتی نوح لە سەر کێوێ نیشتەوە. بە ناوی ( کاردۆ) یان ( قاردۆ) ئەو وشانە ( کاردا، کاردۆیی، کوردی، گۆتی) هەموویان لە فلوجی دا یەک وشەن.

کەواتە: سەرەتای ژیان و دووبارەبوونەوەی ژیان لەناوچەی ( جودی) کوردستان بووە.

( د.احمد محمد الخلیل) دەنووسێ: ( گۆتیەکان ) بە هەموو ئەو گەلانە گوتراوە لە باکوری خۆرهەڵاتی ( بابل) ژیاون. وە زۆربەی ئەو گەلانەی لە کوردستانی کۆندا ژیاون.( الحوريون/ نيلهلم) / تأريخ اسلاف كرد؛ ل: ٣٢

کاری هەرسێ پێغەمبەرەکە بونیادنانی سەرەتای چاخەکانی مرۆڤایەتی بووە لە نزیک بە ٨ هەزار ساڵ دەکات، کە ژمارەی ساڵەکەش دڵنیایی نییەو توانای قبوڵ کردن و ڕەتکردنەوەی هەیە لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەی کۆنکرێتی لەبەردەستدا نییە.

ئەوانەشی کە حەزرەتی ئادەم بە ئەفسانە و میتۆلۆجیا دەزانن لە ڕاستیدا ئەوان خاوەن بەڵگە نین، دەنا بەڵگەی ئارکۆلۆژی خرایە ڕوو کە لە کۆنترین نووسین و شارستانییەت باسی ئادەم عَلَيْهِ السَّلَام کراوە ئەویش شارستانییەتی سۆمەر و بابل و فیرعەونییەکان لە میسردا بەڕاشکاوی باسیان کردووە.

لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە کە سەرەتای هاتنی پێغەمبەرانی سەرەتایی کە سێ پێغەمبەر بوون (ئادەم _ شیث _ ادریس) بونیادی کۆمەڵگەیان داناوە نەک شارستانییەت.

هەوڵەکانی دوای ئەم پێغەمبەرانە بۆ شارستانییەت بوو، یاخود دروستکردنی شارۆچکەی بچووک و کۆمەڵگەی بچووک بووە، لە سێ جێگای دنیادا کە هیندستان، عێراق و میسری ئەمڕۆدا بووە.






نیشتەجێبوونیی
کۆمەڵگەکان لە سەرەتای
مێژوودا

## مەملەکەتی چوارەم:
## نووح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ کێیە؟

ژیانی ئەم پێغەمبەرە عەزیزە عَلَيْهِ السَّلَامُ لە قورئاندا تاڕادەیەک بە ڕوونی بۆمان باس کراوە لەڕووی بانگەواز و کرداری لەگەڵ گەلەکەیدا، هەروەها لە نێوانی ئادەم و نووح دا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەواڵی پێداوین کە ١٠ سەدەیان نێوان بووە، واتا نزیکەی هەزار ساڵ زیاتر یان کەمتر بە گوێرەی ئەو دە ڕەوەندەی کە ژیاون لەسەر زەویدا، لەڕووی ڕەچەڵەک(نەسەب) و باوانی مێژوونووسانی ئەهلی کیتاب و موسڵمانانیش لەوانەوە بۆیان گواستووینەتەوە بۆ ناو کتێبە مێژووییە ئیسلامییەکان، بەڵگەیەکی ئەوتۆمان لەبەردەست نییە لەڕووی سەرچاوەی ئیسلامی کە باوانی بەو شێوەیە بێت، هەروەها بەڵگەی مێژووی ڕوون لەبەردەست نییە بێجگە لەوەی کە هەواڵێک هاتووە دەڵێت نووح کوڕی لامل کوڕی متو شلح کوڕی خنون (ئیدریس) کوڕی یرد کوڕی مەهلائیل کوڕی قینین کوڕی ئانوشی کوڕی شیث-ی کوڕی ئادەمە.

ئەگەر تەماشای باوانی بکەین بەم شێوەیە لەنێوانی نووح و ئادەم ٨ باوانە یان ٨ ڕەوەندە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت ١٠ ڕەوەند نێوانیانە، لێرەدا دوو ڕەوەند دیار نییە، چونکە فەرموودەکە ڕاستەو لە بوخاریدا هاتووە، ئەگەر لەنێوان ئادەم و نووح حساب بکەین خۆیان نابن بەو جیلە، چونکە فەرموودەکە دیارە و نێوانیان باس دەکات نەک لە ئادەم بۆ خودی نووح پێغەمبەر دەفەرموێت: لەنێوانی ئادەم و نووح ١٠ ڕەوەندە و هەموویان لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوون[٦٠].

سەدە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە ١٠٠ ساڵ هەژمار کراوە، خۆ ئەگەر بە گوێرەی ژیانی نووسراوی ئەوان لێکی بدەینەوە ئەوان ئەگەر لە ٨ هەزار ساڵ ژیابێتن ئەوا ١٠ هەزار ساڵ دەکات، ئەمەش ڕاست نییە، دیسان دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو تیۆرەی کە ڕۆژمێری ئەوان جیاواز بووە لەگەڵ ڕۆژمێری ئێستای ئێمە، وەکو (خزعلي) دەڵێت: هەر سێ هەفتە لەلای سۆمەری و بابلییەکان هەفتەیەک بووە، داخۆ کۆمەڵگەکانی پێش شارستانییەت چۆن هەژماریان کردووە؟

هەروەها لە مێژوودا ناوی هاتووە (ملحمة جلجامش) باسی نووح و کەشتییەکەی و لافاوەکە کراوە، بە پیاوچاک و چاکەخواز ناوی هاتووە، پێناچێت لە نێوانی ئادەم و شیث و ئیدریس دا

---

[٦٠] كان بين آدم و نوح عشرة قرون كلهم على الإسلام/البخاري.

پێغەمبەری تر هاتبێت تا سەردەمی نووح، چونکە ئەو سێ پێغەمبەرە ئایینی ئیسلامیان بڵاوکردۆتەوە، لەنێوان ئەو سێ پێغەمبەرەو نووح دا پیاوچاکان و زانایانی ئەو سەردەمە ڕۆڵی گرنگیان بینیوە کە ئەمە ڕای گشتی ئەهلی ئیسلامە لەسەری، ئاماژەیەک لە قورئان دا هاتووە بە پێنج کەس ناویان هاتووە (ود، سواع، یعوق، یغوث و نسر) بووە، کە ئەم پێنج کەسایەتییە بە ئەهلی چاکە و چاکەخواز و زانا و دانا ناویان هاتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم ناوانە بوونەتە پەیکەرو پاشان وەکو خوا پەرستراون، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە پیاوچاک و زانای ئاسایی بووبێتن، چونکە ئەم ناوانە لەهەموو جێگاکانی تری دنیا، پەیکەریان بۆ تاشیوون و پەرستوویانن، ئەو پێنج ناوە لە هەر جێگایەکی دنیادا ناوەکانیان هاتووە و ناونراون بە (مەردوخ، عەشتار، قیسارە و بیلۆن) لە میزۆپۆتامیا ئەم ناوانەیان هەبووە لە یۆنان و ڕۆم ناونراون بە (ژوپیتەر، ڤینۆس، ئاپۆلۆ، زیوس و ئارتمیس) لە میسر بەناوی (زایۆس، زریۆس، زیمۆس و حوروس)، عەرەب ناوی ناون بە (هوبەل، لات، مەنات، عوزا و ئوور).

کەواتە هەرچەندە بەڵگەی پێغەمبەر بوونیان لە بەردەستدا نییە، بەڵام دەگونجێت بڵێین پێغەمبەر بووبێتن، چونکە پێغەمبەران زۆرن و ناوی هەمووی نازانین و نەزانراون، چۆن دەشێت کە پێغەمبەر نەبن، بەهەمانشێوە دەشێت بڵێین پێغەمبەر بووبێتن، چونکە ئاسانتر بووە بۆ خەڵکی بیانپەرستن، هەرچەندە پیاوچاکیش بن هەر شەیتان لە ململانێکەدایە و کاری قیزەونی خۆی ئەنجام دەدات.

کەواتە ئێستا لە مێژووی نێوان سێ پێغەمبەرانی ڕابردووو و حەزرەتی نووح پێنج کەسی ناسراومان دەست کەوتووە کە پیاوچاک و چاکەخواز بوون، نێوان نووح و ئادەمیش هەموویان لەسەر ئیسلامەتی بوون، واتا هیچ ئایینێکی داهێنراو نەبووە و دەستی پێ نەکردووە، لەسەر بنەمای ئیسلامەکە شەیتان شیرک و هاوبەش دانانی فێری خەڵکی کردووە، ئەم ڕووداوانەش هەمووی کە باس دەکەین لەنێوان کۆمەڵگانشینی میزۆپۆتامیادا بووە واتا لە نێوان دیجلە و فورات ڕووداوەکان ڕوویانداوە.

## خوای پەروەردگار یەک ئایینی ناردووە

خوای پەروەردگار یەک ئایینی ناردووە ئەویش ئایینی ئیسلامە، پێشتر بە کورتی ئاماژەمان پێداوە و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ...﴾ آل عمران ،پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (كان بين آدم و نوح عشر قرون، كلهم على الإسلام).

کەواتە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تایبەت نییە بە پێغەمبەری خوا محەمەد ﷺ ، بەڵکو ئایینی هەموو پێغەمبەران بووە، بەڵام شەریعەت بە گوێرەی کۆمەڵگە و شارستانییەتەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە کۆتاییان قورئان بووە، کە گونجاوە بۆ هەموو کات و سات و سەردەم و شارستانییەتێک لەکاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت.

بەڵگەشمان بۆ ئەوەی کە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە: خوای گەورە دەفەرموێت لەسەر زمانی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾﴾ یونس

واتە: ئەگەر پشت بکەن لە ئیمان هێنان بە من خۆ من داوای هیچ ئەجرو پاداشتێکم لە ئێوە نەکردووە، پاداشتی من تەنها لای خوای گەورەیەو ئەو پاداشتم ئەداتەوە فەرمانم پێکراوە کە من لە موسڵمانان بم.

هەروەها لەسەر زمانی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی سەلامی خوایان لەسەر بێت کە کەعبەی پیرۆزیان نەوژەن دەکردەوە خوای گەورە لەسەر زمانیان دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾﴾ البقرة

واتە: ئەی پەروەردگار جێگیرو دامەزراومان بکە لەسەر ئیسلام و گوێڕایەڵی و دڵسۆزی و کردەوەی چاك لە نەوەی ئێمەیش واتە: مەبەست پێی ئوممەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەوانیش با ئوممەتێکی موسڵمان بن، ڕێوشوێنی بەندایەتی و خواپەرستیمان نیشان بدە، ئەو شوێنانەی کە حەجی لێ ئەکرێ و تەوبەمان لێ قبووڵ بکە هەر تۆ تەوبە زۆر قەبووڵ ئەکەی و زۆر بە ڕەحم و بەزەییت.

لەسەر زمانی یەعقوب عَلَيْهِ السَّلَامُ کە بە ئیسرائیل ناسراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ البقرة

واتە: ئیبراهیم و یەعقوبیش هەمان ئەم وەسیەتەی خوای گەورەیان کرد، ئەی نەوەکانم خوای گەورە ئەم ئایینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە کە ئیسلامە، بۆیە ئێوە نەمرن ئیلا بە موسڵمانیەتی نەبێ، بەردەوام بن لەسەر ئیسلام و واز لە ئیسلام نەهێنن، ئەمە وەسیەتی ئیبراهیم و یەعقووب بووە.

بەهەمان شێوە لەسەر زمانی حەزرەتی مووسا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ﴿٨٤﴾﴾ یونس

واتە: مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخوای گەورە هێناوە تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن و تەوەکول بکەنە سەر خوای گەورە و کارەکانتان بەخوای گەورە بسپێرن ئەگەر ئێوە موسڵمانن خوای گەورەتان بەسە.

لەسەر زمانی عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوایان لێبێت دەفەرموێت: ﴿۞فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٥٢﴾﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ هەستی کرد بەردەوامن لەسەر کوفرو ئیمانی پێ ناهێنن فەرمووی: کێ پشتیوانی منە لە دەعوە و بانگەواز کردن بۆ گەیاندنی ئایینی خوا؟ حەواری و قوتابی و کەسە تایبەتەکانی خۆی کە دوانزە کەس بوون وتیان: ئێمە پشتیوانی ئایینی خوای گەورەو پێغەمبەری خوای گەورە ئەبین بۆ بڵاو کردنەوەکەی ئایینی خوا، ئیمانمان بەخوای گەورە هێناوە و تۆیش لە ڕۆژی قیامەت شایەتیمان بۆ بدە کە ئێمە موسڵمانین.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران

واتە: هەر کەسێ جگە لە ئیسلام داوای دینێکی تر بکات و لەسەر دینێکی تر بێت ئەوا خوای گەورە لێی قبووڵ ناکات و لێی وەرناگرێت لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە زەرەرمەندانە و ڕزگاری نابێت.

پاشان ئەو ئایینانەی کەناوی ئایینی تریان وەرگرتووە، هیچی پەیوەندی نییە بەخوای پەروەدگارەوە، بۆ نموونە یەهوودی لکێنراوە بە گەلێک، نەسرانی بە ناوچەیەک، هندۆسی بە کیشوەرێک (قارەیەك)، بوزی و کۆنفۆشیۆسی... هتد هەریەکە بەناوی ناوچە و گەل و کەسێکەوە کراوە، ئەوەی کە ڕاست و دروستە یایینی خوایە ئیسلام، کە کۆمەڵی موسڵمانان لە سەر ئەو ئایینەیە کە خوای پەروەردگار پێی ڕازییە و بێجگە ئەو ئایینە کە ئیسلامە، هیچ ئایینێکی تر وەرناگرێت و پەیوەندی بە پەروەردگارەوە نییە.

کەواتە سەربەرزییە بۆمان کە خاوەنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامین و پێویستە لەسەرمان بە خەڵکی ڕابگەیەنین ئەم ئایینە و بانگەوازی بۆ بکەین، چونکە فەرمانی خوایەو بە ئاشکرا و بێ ترس بڵێین ئێمە ئیمانداران، ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ۝٣٣﴾ فصلت

واتە: کێ هەیە وتەی لەو کەسە باشتر بێت کە بانگی خەڵکی ئەکات بۆ لای یەکخواپەرستی و گوێڕایەڵی خوای گەورە، وتراوە مەبەست پێی بانگدەرانیشە کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ نوێژکردن خۆیشی کردەوەی چاك ئەکات، نەك وەك ئەو کەسانەی کە فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە چاکەو خۆیان نایکەن، بەرهەڵستی خەڵکی دەکەن لە خراپەو خۆیان دەیکەن، ئەڵێت منیش یەکێکم لە موسڵمانان.

## لەسەرەتاوە بۆ ناوجەرگەی ڕووداوەکان

نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکێک لەو پێغەمبەرانەی کە (ئولول عەزمە)، (أولو العزم)، بەواتای ئەوەی زۆرترین ئازار و ناڕەحەتییان بەسەردا هاتووە، ئەوانیش پێنج پێغەمبەرن سەلامی خوا لەهەموویان بێت (نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا و محەمەد).

یەکێک لە کێشەکانی زۆرینەی بێدین بوونی مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا بەهۆکارێکی تری ژیانی ئەم پێغەمبەرەیە کە لە ڕووی واقیعی و ڕاستییەوە لە کتێبەکانی تەورات و ئینجیل دا باسی کراوە بەخەیاڵ و فەنتازیا لێکدراوەتەوە.

جێگای نووح پێغەمبەر لەنێوانی دیجلە و فورات دابووە، زانایان بە ناوچەی کوفەی ئێستای عێراق دەستنیشانیان کردووە، ئەم وتەیەش تا ڕادەیەکی زۆر جێگای بڕوایە، چونکە لە پاشماوەی دێرینی بابل و ئاشووری و ئەکەد و کێشەکان ناوی هاتووە، هەروەها لە نووسراوە کۆنەکانی پادشای (ئاشووربانیپاڵ یان بەنی بەعل) هاتووە، کە ئاشکرا کردنی لەلایەن زانای شوێنەوارناس (دی مورگان) باسکراوە و ئەویش لە زانای مێژوو و شوێنەوارناس (کونتنو) گواستییەوە و دکتۆر (شوقی ابوخلیل) لە کتێبی (أطلس القرآن) دا باسی کردووە.

ناوی نووح و باسەکانی لە قورئان دا لە ٤٣ جێگادا یاخود ئایەت دا باس کراوە لە نێوانی ئیدریس و نووح دا هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە، تەنها بوونی پیاوچاک لەو نێوەندەدا هەبوو، پیاوچاکان هەڵساون بەکاری خۆیان لەدوای پێغەمبەران، میراتی پێغەمبەران زانستەکەیان بووە، پیاوچاکان و زانایان کاری بانگەوازیان ئەنجام داوە، لەلایەکی تریشەوە شەیتان و نەفسی

مرۆڤەکان کەوتونەتە ململانێی سەخت لەگەڵ خواناساندا سەرەتا بەتاوان و کاری خراپە و پاشان سەرکێشانی بۆ کوفر و خوانەناسی و هاوبەش دانان، نێوان ئادەم و نووح ١٠ ڕەوەند بووە، بەمەش سەردەمێکی دوور و درێژە، هیچ ئایینێک نەبووە بێجگە ئیسلام، مرۆڤیش بە سرووشتی حەزی بە داهێنان و نوێگەریی بووە، شەیتان لەسەر ئەو بوارە کاری کردووە، لەناو کۆمەڵگەکاندا کە پرژ و بڵاو بوون و زۆر سەرەتایی بوون هۆکاری گەیاندن و پەیوەندی کۆمەڵایەتی زۆر سەخت بووە، بەهۆکاری بژێوی ژیان و دواکەوتووی خەڵک، شەیتان بڕیاری خۆی داوە لەسەرەتاوە کە مرۆڤ هەڵبخەڵەتێنێت، بۆیە سەرەتا بەناوی پیاوچاک و یادکردنەوەی پیاوچاکان وەسوەسەی بۆ خەڵکی دروست کرد کە گۆڕی خواناسان و پیاوچاکان وەکو وەفا و یادگارییەک مزگەوت یاخود نزرگە بەسەر گۆڕەکانیان دروست بکرێت، ئەگەرچی لە ڕووی ڕووکەشەوە کارەکەش دیارە بۆ ڕەوەندی یەکەم، بەڵام لەڕووی شەرع ناوەخنەوە هەموو فێڵ و تەڵەکەبازییە، ڕەوەندی یەکەم لای گرنگ نەبوو چونکە هەموو خواناس و لەسەر فیطرەتی پاک و باش بوون، خوایان بەحەق دەپەرست، کێشەکە لەوەدا بوو شەیتان جوانکاری چیرۆکی فەنتازیای وا دروست دەکات، کە ناچاری خەڵکی سادە و ساویلکە دەکات گوێی بۆ بگرن، لەکاتێک بەدرۆکردن و جوانکاری و وتە درۆزنەکانی توانی ئادەم و حەوا لە خشتەبەرێت و حەرامیان دەرخوارد بدات.

بۆ یەکەم جار چەند پرسێکی زۆر ترسناک هاتە ئاراوە، پرسی یەکەم هاوبەش دانان بۆ خوا بەناوی پیاوچاک و زانایان و تەوەسول کردن پێیان، هەڵبەت لەدوای مردنیان، پاشان دروستکردنی چینایەتی کە دەردێکی زۆر کوشندەی ناو کۆمەڵگەیە، ئەم چینایەتییە بەهۆکاری منداڵ زۆر و پارەو سەروەت و سامان دەرکەوت لە ناو کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، پاشان حەزی شەهوەت و گوێنەدان بەحەڵاڵ و حەرام، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: لەناو دڵی **مرۆڤەکە دادەپۆشێت و خاڵەکە تەشەنە دەکات و هەموو دڵ ئەگرێتەوە تا بەرەو کافر بوونی** دەبات، چارەسەری تۆ بەگەڕانەوەیە بۆلای پەروەردگار.

مرۆڤ کە کافر بوو لوتبەرز دەبێت، خۆویست دەبێت حەزی تەنها بە تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی دەبێت، هەموو ئەم نەخۆشییانەی ناو کۆمەڵگە بۆ چارەسەرکردن خوای پەروەردگار پێغەمبەری بۆ دەنێرێت و یاخود بانگخوازان کە بە پەیامی پێغەمبەران کار دەکەن.

نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ لەو پێغەمبەرانەیە کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ ناو کۆمەڵگەکان و بۆ چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیی و دەروونییەکان و پاشان بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو چەوتیانەی کە شەیتان و نەفسی مرۆڤە گەندەڵکارەکان ئەنجامیان داوە، نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ خۆی ئەندامێکی ناو

کۆمەڵگەکە بووە[٦١]، شارەزا بووە بە دابونەریتی خەڵکەکە، خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی حوججە و ڕاستییەکانیان پێ ڕابگەیەنێت و چەمکی دینداری و خواناسییان بۆ ڕاست بکاتەوە پێغەمبەرانیش کە هەڵبژاردەن لەناو خەڵکەکەیاندا دەبێت ناسراو بن و دوور بن لە تاوان وەکو زینا کردن و مەیخواردنەوە و پیاوکوژی و زوڵم و بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ ئەوەی پێغەمبەرایەتی پێ بکات و خۆی بسەپێنێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦١] خودای گەورە لە قورئان دەفەرموێ: ﴿... وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ ...﴾ هود ئەو ناوچەیە بۆتانی ئێستایە، کە ( جەزیرەی عبدالله کوڕی عومەر) یەکێکە لەو گوندانەی لانکەی شارستانی بووە دوای لافاوو کەشتی نوح لە سەر جودی نیشتۆتەوە.

(هروي) دەڵێ: (دوورگەی ئیبن عومەر دووەم شارە دوای لافاوەکە نیشتۆتەوە).

(جزيرة ابن عمر- بۆتان/ د. سلام حسن طه خوشناو/: ٢٣.

تا ئێستا (٨٠) هەزار کتێب لە سەر لافاوی نوح نووسراوە، لە ئەفسانەی چینی دا ئاماژە بە کەشتی نوح دەکات بە ناوی ( نو - واە)، ئەو کەشتی یە (٨) کەسی هەڵگرتووە.

(اسرار السلالات البشرية/ رونه نوربير غن/ل: ٢٦

وە گوندی ( هەشتاکان) هەمان دوورگەی ئیبن عومەرە ( جزيرة بن عمر /بۆتان/د. سلام/ل: ٣٢.

کۆمەڵێ زانای شوێنەرزان، لە وانە ( هول) لە مۆزەخانەی بەریتانیا ( لیونارد دولی) لەگەڵ مۆزەخانەی بەریتانیا و زانکۆی ( بنسلفانیا) لە نێوان ( ١٩٢٢-١٩٣٤) دا زۆر پاشماوەی کۆنیان دۆزییەوە لە دۆڵی دوزێ، دەریان خست کە شوێنی لافاوەکە بووە. ( د.رالف سونسکی) توێژینەوەی لە ئەشکەوتی شانەدەر کرد، کە پاشماوەی مرۆڤی تێدا دۆزرایەوە بۆ (١٠٠) هەزارسال دەگەڕایەوە. ( الإنسان/ د زغلول النجار/ ل: ٢٠٠)




## هۆکاری گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە لە قورئان دا

لەناو قورەیش ڕووداوەکانی ژیانی نووح و بگرە خودی کەسایەتی نووح ناسراو نەبووە، عەرەب زۆر لاواز بوون لە ڕووی ژیانی پێغەمبەران بە گشتی، تەنانەت لە شیعری جاهیلیشدا لە شیعرەکانیدا ناوی نووح نەبراوە تا هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی دەست پێکرد لەناو قورەیش دەستیان کرد بە ئازاردانی موسڵمانان و پاشان پێغەمبەری نازدار ﷺ، لەدوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە حەوشی کەعبەدا نوێژی دەکرد قورەیش لێی کۆبوونەوە و ئازاریان ئەدا تەنها ئەبوبەکر بە دەنگییەوە چوو، ئەویش کە کەوتە ناو قورەیش هەر ئەوەندە وتی: لە کەسێک ئەدەن کە دەڵێت (تەنها پەروەردگار خوامە؟) ئەویش کەوتە بەر لێدانی قورەیشی کافر، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هیجرەتی کرد بۆ طائیف و لە چوونیدا بەرد بارانکرا، قاچی موبارەکی بریندار بوو، ئازاری زۆریان دا لەگەڵ زەیدی کوڕی حارس دا، خوای گەورە لە قورئان دا باسی نووح پێغەمبەر عليه السلام -ی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە ژیانی پێغەمبەران و بانگەوازکردنیان هەموو بەیەک ئاراستەدا ڕۆیشتووە، چۆن لەناو گەل و هۆزەکەی تۆدا خۆبەزل

زان و لوتبەرز و چینی دەوڵەمەند و هەژار و کۆیلە هەیە، لەناو ژیانی پێغەمبەرانی تردا هەمان شت هەبووە و پێشتر ڕوویداوە.

خوای گەورە دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥٩ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ۝٦٠ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٦١ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٦٢ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٦٣ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا عَمِينَ ۝٦٤﴾ الأعراف

واتە: بەدڵنیایی ئێمە نووح عَلَيْهِ السَّلَام -مان نارد بۆ لای قەومەکەی کە یەکەم پێغەمبەر بووە لە دوای ئادەم و دە پشت لە نێوانیاندا بووە هەموویان لەسەر ئیسلام و یەکخواپەرستی بوونە، فەرمووی: ئەی قەومی خۆم ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و بیپەرستن چوونکە جگە لە خوای گەورە هیچ پەرستراوێکی ترتان نییە کە حەق بێ و شایەنی پەرستن بێ، ئەگەر ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە نەکەن و شەریك بۆ خوای گەورە دانێن، ئەوە من لە ڕۆژێك ئەترسم کە تووشتان بێ کە سزاکەی یەکجار گەورەیە، کە ئەو ڕۆژە بوو خوای گەورە تۆفانی بۆ ناردن و نوقمی کردن لە ئاودا، یاخود سزای ڕۆژی قیامەتە﴿٥٩﴾ دەسەڵاتدارو ناودارو سەرکردەکان لە قەومی نووح وتیان: ئەی نووح کاتێك کە تۆ بانگی خەڵکەکە ئەکەی کە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن ئێمە تۆ ئەبینین لە گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادایت و لە ڕێگای حەق لاتداوە﴿٦٠﴾ نووحیش عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی قەومەکەم من هیچ گومڕا نەبوومەو لە ڕێگای ڕاست دەرنەچووم، بەڵکو نێردراو و پێغەمبەرێکم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە بۆ لای ئێوە نێردراوم تا بانگتان بکەم بۆ یەکخواپەرستی﴿٦١﴾ پەیامی پەروەردگارتان پێ ئەگەیەنم بەدڵسۆزییەوە ئامۆژگاریتان ئەکەم، هەندێك شت هەیە کە لەلایەن خوای گەورەوە من ئەیزانم کە خوای گەورە هەواڵی بە من داوە لە ڕێگای وەحییەوە کە ئێوە نایزانن﴿٦٢﴾ ئایا پێتان سەیرە یان بەدرۆی ئەزانن کە زیکرێك لە پەروەردگارتانەوە، واتە: وەحییەك لەلایەن خوای گەورەتانەوە بێت بۆ سەر پیاوێك لە خۆتان کە نووحە کە خۆتان ئەیناسن بۆ ئەوەی کە ئاگادارتان بکاتەوە لەو خراپەکاری و گومڕایی و شیرکەی کە تیایدان، بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن و بەهۆی ئیمان هێنان و تەقواوە خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات﴿٦٣﴾ بەڵام ئەوان نووحیان بەدرۆ زانی و ئێمە نووح و ئەو باوەڕدارانەی کە لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن لەناو کەشتییەکەدا، ئەوانەیشی

كە ئایەتەكانی ئێمەیان بەدرۆ زانی و ئیمانیان پێ نەهێنا نوقممان كردن لەناو ئاوەكەدا، كە خوای گەورە تۆڵەی سەند لە دوژمنانی بۆ دۆستانی كە سەركەوتن و سەرەنجام لە دونیاو قیامەت بۆ باوەڕدارانە، ئەمانە بەڕاستی قەومێك بوون كە كوێر بوون و حەقیان نەئەبینی و ئامۆژگاری سوودی بۆیان نەبوو﴿٦٤﴾

بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران بەگشتی بزانن كە كاری پێغەمبەران بە ناڕەحەتی و ئازار و ئەشكەنجە دەست پێدەكات، گەیاندنی پەیامی خوا هەروا ئاسان نییە و ماندوو بوونی دەوێت، ئەوەشی خستە بەرچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ كە هەموو پێغەمبەران لەناو هۆز و گەلەكانی خۆیانەوە هاتوون و هیچ سەنەدێكی تر بێجگە هێز و توانای خوایان لەپشت نەبووە، بۆ ئەوە تێبگەن و خوای گەورە ڕەحمیان پێبكات، خۆ ئەگەرەكان زۆرن كە بەدرۆ دەخرێتەوە، ئەوكات سزای خوایی دەست پێدەكات و لەناو ئازار و ئەشكەنجەدا بەهۆكاری سەرپێچی خۆیان نغرۆ دەبن.

ئەم كوێر بوونە لەبەرانبەر ڕاستیدا ململانێیەكە هەر دەبێت هەبێت، چونكە ئەگەر خودی ململانێكە دروست نەبێت ناگاتە ئاستی بەرز، ئەوكات ئازادی مرۆڤەكان دەرناكەوێت، خوای گەورەش مرۆڤی ئازاد كردووە لە هەڵبژاردنی ئیمان و كوفردا، بەڵام دەبێت بەرپرسیارێتی هەڵبگریت لە كۆتاییدا.

پاشان گێڕانەوەی لە چەندین سورەتدا بەهۆكاری ئەوەی هەموو دیمەن و گۆشەنیگا و لایەنەكانی ژیانی تێدا بەرجەستە ببێت، چ لەبواری بانگەواز و چینایەتی و سەرپێچی و كوفر و ڕووداوە سرووشتییەكان و بەموعجیزە بوونیان و سەردەم و كۆمەڵگە و خێزان و پاشان گفتوگۆ و دەمێ دەمێكان و...هتد.

## بانگەوازی یەكتاپەرستی چینایەتی ناهێڵێت

ئیسلام دژی هەموو چینایەتی و دەرەبەگایەتی و جیاكارییەكە لەناو خەڵكیدا بەگشتی خودی بانگەوازی ئیسلامی و كاری هەموو پێغەمبەران ناسینی خوای گەورەیە بەیەكتاپەرستی لە خوایەتی و پەروەردگارێتیدا و پاشان لە پەیام و مەنهەجدا، لەدوای ئەم بنەڕەتە گرنگە بەشەكانی تری بانگەواز جیادەبێتەوە كەهەمووی گرێ دراوە بە تەوحیدەوە.

كاری حەزرەتی نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ بنەڕەتی بانگەوازەكەی خواناسی و خواپەرستی بوو بە یەكتاپەرستی.

نووح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ هەڵبژێردراو بووە بە پێغەمبەر، خوای گەورە ئاگاداری کردووە کە هۆشداری بداتە گەلەکە و ئاگاداریان بکاتەوە لە هەڵە و چەوتییەکانیان کە دەستیان داوەتێ، پاشان هاوبەش بۆ خوای پەروەردگار دانەنێن، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾﴾ هود

واتە: بە دڵنیایی ئێمە نووح پێغەمبەر عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ -مان نارد بۆ لای قەومەکەی خۆی، کە یەکەم پێغەمبەر بوو خوای گەورە ناردی بۆ ناو بتپەرستان، کە پێی فەرموون: من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە لەلایەن خوای گەورەوە هاتوومە ئەتانترسێنم بە سزای خوای گەورە ئەگەر ئیمانم پێ نەهێنن﴿٢٥﴾ کە هیچ کەسێك نەپەرستن لە غەیری خوای گەورەو بە تاك و تەنها خوا بپەرستن، ئەگەر ئیمان نەهێنن و بەردەوام بن لەسەر شەریك دانان بۆ خوای گەورە ئەوا من لە سزای ڕۆژێك ئەترسێم لەسەرتان کە سزاکەی زۆر بە ئێش و ئازارە کە ڕۆژی قیامەتە، یاخود ڕۆژی زریان و تۆفانەکەیە﴿٢٦﴾

ئەگەرچی هۆشداری دراوە، بەڵام لەگەڵیشیدا چارەسەر هاتووە کە یەکتاپەرستییە، پاشان زیاتر دڵنیایان دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾﴿٤﴾ نوح

واتە: نووح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم من ترسێنەرو ئاگادارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆ ئێوەو ئەتانترسێنم بە سزای خوای گەورە﴿٢﴾ ئێوە عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەتاك و تەنهاو شەریکی بۆ دامەنێن، تەقوای خوای گەورە بکەن و خۆتان لە تاوان و حەرام بپارێزن، گوێڕایەڵی من بکەن لە هەر شتێك کە فەرمانتان پێ ئەکەم ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ، لەو تاوانە گەورانەی کە کردوتانە کە بەهۆیەوە ڕووبەڕووی سزای خوای گەورە ئەبنەوە ئەگەر ئیمان نەهێنن﴿٣﴾ ئەگەر ئیمان بێنن سەرەڕای ئەوەی خوای گەورە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ و ماوەشتان بۆ درێژ ئەکاتەوە بۆ کاتێکی زیاتر سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئەگەر لەسەر کوفرەکەتان بەردەوام بن ئەو ئەجەلەی کە خوای گەورە بۆی داناون دواناکەوێت، ئەگەر ئێوە ئەمە ئەزانن ئیمان بێنن تا خوای گەورە سزاتان نەدات﴿٤﴾

لێرەدا خۆبەزلزانی و لوتبەرزی کافران دەردەکەوێت، هەمیشە لەوەڵامدا دەڵێن: ئاخر تۆ چیت مرۆڤێکی وەکو ئێمەی، ئینجا بەهۆکاری مرۆڤ بوونی پێغەمبەران دەڵێن تۆ بۆ بەناوی

خواوە قسە دەکەیت، لەکاتێک دا خوای پەروەردگار ئەو مافەی داوە کە بۆ خەڵکی پەیامی خوا ڕوون بکەنەوە، نەک بەناوی خواوە قسە بکەن، ئەمەش سەرتێکدانی کافرانە بۆ ئەوەی کەس شوێن بانگەوازەکە نەکەوێت، بە بچووک تەماشای دەکەن و داوا دەکەن ئەگەر خوا کەسی بناردایە ئەوا پیاوانی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداری دەنارد لەکاتێک دا بانگەوازی خوایی لەگەڵ دەسەڵاتداراندا یەکانگیر نییە، چونکە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هەر بۆ پەروەردگارە، لێرەوە چینایەتییەکە جوانتر دەردەکەوێت و داوای بەرپرس و پیاوانی خاوەن دەسەڵات و بەرژەوەندچییەکان لەناویاندا قوت دەبنەوە و دەڵێن شوێن خەڵکی هەژار و لات و پوت بکەوین کە هیچ پارەو سەروەت و سامان و دەسەڵاتێکیان نییە و لەکاتێکدا خاوەنی هیچ بەرپرسیارێتی و ڕاوبۆچوونێک نین، وا پەی دەبەین تۆ درۆ دەکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾﴾ هود

واتە: دەسەڵاتدارە کافرو بێباوەڕەکان لە قەومی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ وتیان: ئەی نووح تۆش تەنها مرۆڤێکی وەکو ئێمەیت و نابینین هیچ جیاواز بیت لە ئێمە، نابینین هیچ کەسێك شوێن تۆ کەوتبێ لە دەسەڵاتداران و پیاوماقووڵان و گەورەکان تەنها فەقیرو هەژاران نەبێ کە تەنها بۆچوونێکی سادەیان هەیەو یەکسەر شوێنت کەوتوون بە بێ بیرکردنەوە، نابینین ئێوە هیچ فەزڵێکتان بەسەر ئێمەوە هەبێ لە شتی دونیاییدا بەڵکو گومان ئەبەین کە ئێوە درۆزن بن.

لێرەدا یەکەم تاوان کە دەدرێتە پەنای پێغەمبەران بە درۆزنی هەژمار دەکەن، پاشان کە ڕوونی دەکاتەوە بۆیان، لەڕابردووودا درۆتان لێ نەدیووم، خوای پەروەردگار لەناو خۆتاندا کەسێکی هەڵبژرادووە ئەوەش بۆ خۆی ڕێزێکە لە ئێوەی ناوە، من ئەوەی لەسەرمە پێتان ڕابگەیەنم پەیامی خوایە و من نێردراوی ئەو پەروەردگارەم بۆ لاتان سەیرە کە من باش دەناسن لە خۆتانم و ساڵەهایە لەناو ئێوەدا دەژیم کە چی بڕوام پێ ناکەن، هۆکاری هاتنی پێغەمبەران لەناو گەلەکانیاندا زیاتر بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنی خەڵکەکەیە، ئەم هۆکارەش ڕەحمەتی خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾﴾ الأعراف

واتە: دەسەڵاتدارو ناودارو سەرکردەکان لە قەومی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ وتیان: ئەی نووح کاتێك کە تۆ بانگی خەڵکەکە ئەکەی کە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن ئێمە تۆ ئەبینین لە

گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادایت و لە ڕێگای حەق لاتداوە﴿٦٠﴾ نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومەکەم من هیچ گومڕا نەبوومەو لە ڕێگای ڕاست دەرنەچوومە، بەڵکو نێردراو و پێغەمبەرێکم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە بۆ لای ئێوە نێردراوم تا بانگتان بکەم بۆ یەکخواپەرستی﴿٦١﴾ پەیامی پەروەردگارتان پێ ئەگەیەنم و بەدڵسۆزییەوە ئامۆژگاریتان ئەکەم، هەندێك شت هەیە کە لەلایەن خوای گەورەوە من ئەیزانم کە خوای گەورە هەواڵی بە من داوە لە ڕێگای وەحییەوە کە ئێوە نایزانن﴿٦٢﴾ ئایا پێتان سەیرە یان بەدرۆی ئەزانن کە زیکرێك لە پەروەردگارتانەوە، واتە: وەحییەك لەلایەن خوای گەورەتانەوە بێت بۆ سەر پیاوێك لە خۆتان کە نووحە کە خۆتان ئەیناسن بۆ ئەوەی کە ئاگادارتان بکاتەوە لەو خراپەکاری و گومڕایی و شیرکەی کە تیایدان، بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن و بەهۆی ئیمان هێنان و تەقواوە خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات﴿٦٣﴾

کاتێک سووربوونی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ دەبینن لەسەر بانگەوازەکەی دەیانەوێت هەرچۆن بوو ئەو خەڵکەی کە شوێنی پەیامەکەی کەوتبوو لێی دوربخەنەوە، یان بە پێچەوانەوە پێغەمبەرانیش شۆڕشی یەکتاپەرستی دەگێڕن و هەرچی بتی ئەفکار و بتی پەیکەر هەیە لەناوی دەبەن، خوای گەورە لەسەر زاری نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ دەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمًا تَجۡهَلُونَ﴿٢٩﴾وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴿٣٠﴾﴾ هود

واتە: ئەی قەومی خۆم کاتێك کە من ئەڵێم موسڵمان بن لەبەرامبەر ئەمە داوای پارەتان لێ ناکەم و بۆ ئەوەم نییە کە سەروەت و سامانتان ببەم، بەڵکو پاداشتی من تەنها لای خوای گەورەیە، من ناچم لەسەر داوای ئێوە باوەڕداران دەربکەم و دووربخەمەوە کە فەقیرو هەژارن، ئەوان ئەگەن بە خوای خۆیان و پاداشتیان ئەداتەوە لەسەر ئیمان هێنانیان، بەڵام من ئێوە ئەبینم کەسانێکی زۆر نەزان و نەفامن کاتێك داوا ئەکەن کە ئەو فەقیرو هەژارە موسڵمانانە دووربخەمەوە﴿٢٩﴾ ئەی قەومی خۆم ئەگەر من ئەو فەقیرو هەژارە موسڵمانانە دەربکەم و دووریانبخەمەوە خوای گەورە سزام ئەدات، ئەو کاتە کێ هەیە من بپارێزێ لە سزای خوای گەورە؟ ئەی بۆ بیر ناکەنەوە﴿٣٠﴾

لەدوای ئەوە پێیان دەڵێت: ئەوانەی شوێن کەوتووی پەیامی خوان دوای پارە و پلەو پایە نەکەوتوون، بەڵکو داوای پاداشت لەخوا دەکەن و دەفەرموێت: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ

ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿٣١﴾ هود

واتە: من هەرگیز بە ئێوەم نەوتووە کە خەزێنەکانی ڕزق و ڕۆزی خوای گەورە بەدەست منە، یان من زانیاری غەیب ئەزانم، یان من فریشتەم، بەو کەسە فەقیرو هەژارە موسڵمانانەم نەوتووە خوای گەورە خێریان پێ نابەخشێ و پاداشتیان ناداتەوە کە ئێوە بەکەمیان ئەزانن و سووکایەتیان پێ ئەکەن، واتە: خوای گەورە تووشی خێری کردوون بەوەی ئیمانیان هێناوە، خوای گەورە خۆی زاناترە چی لە دڵی ئەواندایە لە ئیمان و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی، ئەگەر من ئەوان دووربخەمەوە بەڕاستی من کەسێکی ستەمکارم، یان ئەگەر من بڵێم خوا خێر بەوان نابەخشێ و بەئێوەی ئەبەخشێ کەسێکی ستەمکارم.

ئەوەتا ئیسلام لەسەرەتای مرۆڤایەتی نەک هاتنی پەیامی پێغەمبەر محەمەد ﷺ کاری بۆ نەهێشتنی چینایەتی کرد.

چونکە سیمای دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتووەکان هیچی جیاوازتر نییە لە سیما و شێوەی هەژاران، ئیتر لێرەوە ململانێی سەخت دەست پێدەکات و خۆڕاگری و برسێتی و تینوێتی و قسەی سووک و تانەو تەشەر لەلایەن کافر و بێ باوەڕەکانەوە ئەنجام دەدرێت، خۆڕاگری و بەهێزی ئیماندار لێرەوە دەست پی دەکات کە هەروەکو لە بەرانبەر حەزرەتی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەنجامیان دا و بەگاڵتە و تانە و تەشەر دژی وەستانەوە.

بە وشەی شێت بوو یان جنۆکە دەستی لێ وەشاندوە ناوزەدیان دەکرد و خوای موتەعال دەفەرمووێت: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٢٥﴾﴾ المؤمنون

واتە: ئەیانوت ئەمە هیچ شتێك نییە تەنها پیاوێکەو شێت بووەو نازانێ چی ئەڵێ، چاوەڕێ بن تا ماوەیەکی تر کارەکەی دەرئەکەوێت و بۆتان دەرئەکەوێ کە ئەمە شێتە، یاخود چاوەڕێ بن تا دەمرێت و لە کۆڵتان دەبێتەوە.

ئینجا هەڕەشەی بەردبارانکردنی لێکراو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ﴿١١٦﴾﴾ الشعراء

واتە: وتیان: ئەی نووح ئەگەر واز نەهێنی لە بانگەواز کردنمان بۆ ئەم ئایینە تازەیە ئەوە بەردبارانت ئەکەین.

لەدواییدا هیچ چاری نەما و دەستی بڵند کرد بۆلای پەروەردگاری سکاڵای لای خوای پەروەردگار تۆمار کرد لەسەریان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ۝١١٧ فَٱفْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ۝١١٨﴾ الشعراء

واتە: نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی قەومەکەم بە درۆیانزانیم و وەڵامیان نەدامەوە۝١١٧ جیاوازی و جیاکاری و بڕیارێك بدە لە نێوان من و ئەواندا تا دەرکەوێ کێمان لەسەر حەقین و کێمان لەسەر باتڵین، خۆم و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگارمان بکە و ئەوان لەناو ببە۝١١٨

پاشان دەکەوتنە شوێنی و هاواریان لێ دەکرد شێتە شێتە نووح شێتە! خوای گەورە ئەو دیمەنەمان بۆ دەگوازێتەوە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿۞كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ۝٩﴾ القمر

واتە: لە پێش ئەمانیشدا قەومی نووحیش، نووح پێغەمبەریان بەدرۆ زانی و ئیمانیان پێی نەهێناو وتیان نووح شێت بووە، بەرهەڵستیان کرد بە جۆرەها بەرهەڵستی کردن و هەڕەشە لێکردن و ئازاردان.

ئەمەش هەروا ئاسان نییە تەمەنێکی زۆری لە نێوانیاندا بەسەر برد کە بە ڕۆژمێری ئەوان ٩٥٠ ساڵ تەنها پێغەمبەرایەتی لەناویاندا کرد و بانگەوازی دەکردن، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ۝١٤﴾ العنكبوت

واتە: بە دڵنیایی ئێمە نووحمان بۆ لای قەومەکەی نارد، هەزار ساڵ پەنجا کەم لەناویان مایەوەو دەعوەو بانگەوازی ئەکرد بە شەو و ڕۆژوو نهێنی و ئاشکراو تاك و کۆمەڵ، دوای ئەوەی کە باوەڕیان نەهێنا زریانەکە هات و خوای گەورە بردیانیەوەو لەناوی بردن ئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد بەوەی کە ئیمانیان نەهێنا.

لەدوای تەمەنێک لەبانگەواز ئەوان وەکو منداڵ پەنجەیان دەخنی بە گوێیاندا بۆ ئەوەی گوێ بیستی وتەکانی نەبن، ئازاری خۆی و ئیماندارایانیان ئەدا خوای گەورە لە قورئان دا دیمەنەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت:

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١) قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ (٢) أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ (٣) يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٤) قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا (٥) فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا (٦) وَإِنِّى كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا (٧) ثُمَّ إِنِّى دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا (٨) ثُمَّ إِنِّىٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا (٩) فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا (١٢) مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا (١٣) وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا (١٤) أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا (١٥) وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا (١٦) وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا (١٧) ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا (١٨) وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا (١٩) لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا (٢٠) قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا (٢١) وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا (٢٢) وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا (٢٣) وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا (٢٤) مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا (٢٥) وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا (٢٦) إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا (٢٧) رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا (٢٨)﴾ نوح

واتە: بەدڵنیایی ئێمە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان نارد بۆ لای نەتەوەکەی فەرمووو تۆ ئاگاداری قەومەکەت بکەرەوەو بیانترسێنە، پێش ئەوەی سزایەکی بەئێش و ئازاریان بۆ بێت لەلایەن خوای گەورەوەو سزایان بدات وەکو تۆفان و زریانەکە، یاخود بە سزای ئاگر(١) نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم من ترسێنەرو ئاگادارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆ ئێوەو ئەتانترسێنم بە سزای خوای گەورە(٢) ئێوە عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەتاك و تەنهاو شەریکی بۆ دامەنێن، تەقوای خوای گەورە بکەن و خۆتان لە تاوان و حەرام بپارێزن، گوێڕایەڵی من بکەن لە هەر شتێك کە فەرمانتان پێ ئەکەم ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ، لەو تاوانە گەورانەی کە کردوتانە کە بەهۆیەوە ڕووبەڕووی سزای خوای گەورە ئەبنەوە ئەگەر ئیمان نەهێنن(٣) ئەگەر ئیمان بێنن سەرەڕای ئەوەی خوای گەورە لە تاوانەکانتان خۆش ئەبێ و ماوەشتان بۆ درێژ ئەکاتەوە بۆ کاتێکی زیاتر سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئەگەر لەسەر کوفرەکەتان بەردەوام بن ئەو ئەجەلەی کە خوای گەورە بۆی داناون دواناکەوێت، ئەگەر ئێوە ئەمە ئەزانن ئیمان بێنن تا خوای گەورە

سزاتان نەدات﴿٤﴾ نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار من بانگەوازی قەومەکەی خۆم کرد بۆ ئیمان هێنان بەتۆ بە شەو و بە ڕۆژ بە بەردەوامی﴿٥﴾ بەڵام بانگەوازی من هیچ شتێکی بۆ ئەوان زیاد نەکرد تەنها دوورکەوتنەوەو ڕاکردن نەبێت﴿٦﴾ هەر کاتێك کە من بانگیانم کردبێ بۆ ئەوەی کە تۆ لێیان خۆش بیت، واتە: بۆ ئەوەی ئیمان بێنن کە بەهۆی ئیمان و گوێڕایەڵی و عیبادەتەوە تۆ لێیان خۆشبی، ئەوان پەنجەکانیان ئەکردە گوێیانەوە بۆ ئەوەی قسەی من نەبیستن، جلەکانیان ئەدا بە بان سەریانداو دەموچاویان دائەپۆشی بۆ ئەوەی نەمبینن و قسەی من نەبیستن و من نەیانناسمەوە بەردەوام بوون لەسەر کوفرو سەرپێچییان، خۆیان بەگەورە زانی لەوەی کە حەق وەربگرن خۆبەگەورە زانینێکی سەخت﴿٧﴾ پاشان من بە ئاشکرا لە نێوان خەڵکیدا دەعوەو بانگەوازم کردن﴿٨﴾ پاشان دەعوەو بانگەوازەکەم بۆ ئاشکرا کردن بە دەنگی بەرز، بە دەنگی بەرز بانگەوازم کردن بە نهێنیش هەر بانگەوازم کردن لە نێوان خۆم و خۆیاندا، واتە: یەك یەك چوومەتەماڵیان و یەك یەك قسەم لەگەڵ کردوون و هەموو شێوازێکم لەگەڵیاندا بەکارهێناوە بۆ ئەوەی کە باوەڕ بێنن﴿٩﴾ پێم وتن ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لەو کوفرو تاوان و شیرکانەی کە پێشتر کردوتانە ئەبینن خوای گەورە زۆر لێخۆشبووە بۆ ئەو تاوانبارانەی کە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەن و لێیان خۆش ئەبێ﴿١٠﴾ خوای گەورە بارانتان بۆ ئەبارێنێ بارانێکی زۆر یەك لە دوای یەك بە لێزمەو بەخوڕ﴿١١﴾ هەر بەهۆی داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە، خوای گەورە ماڵ و مناڵتان پێ ئەبەخشێ باخ و بێستانتان پێ ئەبەخشێ ئاو و کانی و ڕووباریشتان پێ ئەبەخشێ، هەموو نیعمەت و بەخششێکتان پێ ئەبەخشێ تەنها ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن﴿١٢﴾ نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەوە ئێوە چیتانە بۆ خوای گەورە بە گەورە نازانن، ئەوەندەی کە خوای گەورە شایانی بە گەورە زانینە، بۆ بەتاك و تەنها خوای گەورە ناپەرستن و گوێڕایەڵی ناکەن ئەوەندەی کە خوای گەورە شایەنی بەتاك پەرستنە﴿١٣﴾ لە کاتێکدا خوای گەورە ئێوەی دروست کردووە لە چەند قۆناغێکی جیاوازدا: سەرەتا دڵۆپە ئاوێك بوونە، پاشان بوونە بە خوێنێکی مەیوو، پاشان بوونە بە پارچە گۆشتێك، پاشان تەواو دروستبوونە، پاشان لە دایك بوونە، ئینجا منداڵ بوونە، پاشان گەنج و پاشان پیری، ئەم هەموو قۆناغانە بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە بۆ ئێوە تا کەی ئیمان ناهێنن﴿١٤﴾ ئایا نابینن کە خوای گەورە حەوت ئاسمانی دروست کردووە چین لەسەر چین ئاسمان لەسەر ئاسمان و ڕایگرتووە﴿١٥﴾ لەناو ئاسمانیشدا مانگی داناوە وەکو جوانی وایە بۆ ئاسمان، نوورو ڕووناکییەو گەرمی تیا نییە، خۆریشی داناوە وەکو چرایەك کە سەر زەوی ڕووناك ئەکاتەوە و گەرمی و ڕووناکی تیایە﴿١٦﴾ خوای گەورە ئێوە واتە ئادەمی لە زەوی دروست

کردووە⑰ پاشان کە مردن ئەتانگەڕێنێتەوە ناو زەوی لەناو گۆڕەکاندا لە ڕۆژی قیامەتیش دووبارە دەرتان ئەکاتەوە لەناو زەوی⑱ خوای گەورە زەوی بۆ ڕاخستوون تا لەسەری بەرژەوەندیەکانتان بەدەست بێنن⑲ تا ڕێگای فراوان بۆ خۆتان بکەنەوە بۆ بەرژەوەندی خۆتان تیایدا هاتووچۆ بکەن⑳ نووح عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی پەروەردگار ئەوان سەرپێچیان کردم و بە قسەیان نەکردم خەڵکەکە شوێنی سەرکردەو دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندەکان کەوتن کە ئەمانە زۆری ماڵ و منداڵیان هیچ شتێکی بۆ زیاد نەکردن تەنها گومڕایی و زەرەرمەندی نەبێ㉑ نەخشەو پیلان و فێڵێکی زۆر گەورەیان دانا کە وایان نیشاندا ئەمان لەسەر حەق و هیدایەتن، خەڵکی نەزان و نەفامیان هاندا بۆ ئەوەی کە ئازاری نووح عَلَيْهِ السَّلَام بدەن و بیکوژن㉒ دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندو ناودارو گەورەکان بە خەڵکە ژێردەستەکەیان وت: واز نەهێنن لە پەرستنی خوایەکانتان ئەو پێنج خوایەی کە ئەیانپەرستن وازیان لێ مەهێنن و بەردەوام بن و دامەزراو بن لەسەر پەرستنیان و بە قسەی نووح نەکەن واز لە پەرستنی (وەدد و سواع و یەغوث و یەعوق و نەسر) مەهێنن㉓ نووح عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی پەروەردگار دەسەڵاتدارو گەورەکانیان، یاخود ئەم بتانە خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردووە خوایە ئەوەی کە زاڵم و ستەمکارو هاوبەش بڕیاردەرە هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەکەی تەنها گومڕابوون و زەرەرمەندی نەبێ㉔ بەهۆی تاوانەکانیانەوە کە شەریك دانان بوو بۆ خوای گەورە، خوای گەورە نقوم و نغرۆی ئاوی کردن لەناو ئەو ئاوەی کە تیایدا غەرق بوون ڕاستەوخۆ خوای گەورە لە فێنکی ئاوەکەوە بەرەو گەرمی ئاگر بردیانی، ئەمانیش هیچ پشتیوانێکیان نەبوو کە لە سزای خوای گەورە بیانگەڕێنێتەوەو بیانپارێزێ، کەسێك نەبوو کە فریایان بکەوێ و ڕزگاریان بکات㉕ دوای ئەوەی نووح عَلَيْهِ السَّلَام بێئومێد بوو خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە چیدی خەڵکی ئیمان ناهێنن هەر ئەو چەند کەسەیە کە ئیمانیان هێناوە، ئەمیش دوعای کردو وتی: ئەی پەروەردگار لەسەر ڕووی زەویدا هیچ کافرێك مەهێڵە㉖ نووح عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی پەروەردگار ئەگەر واز لەمانە بێنیت و بمێننەوە ئەمانە خەڵکی گومڕا ئەکەن و لە ڕێگای حەق لایان ئەدەن، خۆیشیان هیچ مناڵیان نابێ ئیلا دواتر مناڵەکانیان کە گەورە ئەبن زۆر فاجرو خراپەکارو کافر ئەبن و گوێڕایەڵی تۆ ناکەن㉗ ئەمە دوعای نووحە ئەی پەروەردگار لە خۆم و لە دایك و باوکم خۆشبە ئەوەیشی کە هاتۆتە ماڵی من بە ئیمانداری خوایە لە هەرچی باوەڕداری پیاو و ئافرەت هەیە لە هەر هەموویان خۆشبە بە زیندوو و مردووەوە، دوعای بۆ هەموو باوەڕداران کردووە هیچ شتێك بۆ زاڵمان و موشریکان زیاد مەکە تەنها بەهیلاك چوون و تیاچوون و زەرەرمەندی دونیا و قیامەت نەبێت، دوعاکەیشی هەموو هاوبەش بڕیاردەرو ستەمکارێك ئەگرێتەوە تا ڕۆژی قیامەت㉘

## قۆناغی دوای بانگەوازکردن و (طۆفان)

دوای ئەوەی شەوو ڕۆژ بانگەوازی کردن و بیری هەموو نیعمەتەکانی خستنەوە، ئاگاداری کردنەوە لە تۆڵە و سزای خوای موتەعال و تورە بوونی ئەوان زیاتر و زیاتر خوانەناسی و هاوبەش دانان و کاری زشت و خراپیان ئەنجام ئەدا و ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوون.

نووح سکاڵای لای پەروەردگار لێکردن، خوای گەورە وەڵامی نووحی دایەوە کە دەست بکات بە دروستکردنی کەشتییەک کە خۆی و ئیماندارانی پێ ڕزگار بکات.

ئینجا گەلەکەی هاتن خۆیان دڵنیاییان دا بە نووح عَلَيْهِ السَّلَام کە سزایان دەوێت، وتیان: ئەگەر ڕاست دەکەیت و ئەم هەموو موناقەشەو موجادەلە و دەمە دەمێمان لەگەڵ دەکەیت ئەگەر ڕاستگۆیت و ڕاست دەکەیت ئادەی بزانین کامەیە سزای خواکەت؟!

نووح فەرمووی: دیارە ئامۆژگارییەکانم بۆ ئێوە هیچ سوودی نییە، خۆتان سەرلێشێواو و لوتبەرزن هەرچەندە من ڕاستگۆ و ئامۆژگاری کارێکی باش بووم بۆ ئێوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی نووح عَلَيْهِ السَّلَام تۆ زۆر دەمەقاڵێ و مشتومڕت لەگەڵ کردین و زۆریشت وت، ئەو هەڕەشانەی کە لە ئێمەی ئەکەی کە ئەگەر ئیمان نەهێنین خوا سزامان ئەدات، با سزای خوای گەورە بێت ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی﴿٣٢﴾ نووح عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی قەومەکەم سزا بەدەست من نییەو هەر کاتێك خوای گەورە ویستی لێ بێت دەینێرێت، بەڵام هەر کاتێك خوای گەورە سزا بنێرێ ئێوە ڕزگارتان نابێ لە سزای خوای گەورەو شوێنێك نییە بۆی ڕا بکەن﴿٣٣﴾ چەندێك من ئامۆژگاریتان بکەم ئامۆژگاری من بۆ ئێوە سوودی نییە لەبەر ئەوەی حەق وەرناگرن و حەقەکە ئاشکرایە، کە خوای گەورە بیەوێ گومڕاتان بکات کە ئێوە شایەنی هیدایەت

نەبن و ڕێگای گومڕایی بگرنە بەرهەر ئەو پەروەردگاری ئێوەیەو هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێنەوە﴿٣٤﴾ یاخود کافرانی مەککە ئەڵێن: محەمەد ﷺ ئەم چیرۆك و بەسەرهاتەی نووحی هەڵبەستووە، یاخود قورئانی هەڵبەستووە، ئەی محەمەد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگە[illegible] من شتێکم هەڵبەستبێت و لە خۆمەوە بیڵێم تاوانەکەی لەسەرشانی خۆمەو لەسەر ئێوە [illegible] من بەریم لە هەموو ئەو درۆ هەڵبەستن و تاوانانەی کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن﴿٣٥﴾ دوای نۆ[illegible] پەنجا ساڵ دەعوەو بانگەواز خوای گەورە وەحی بۆ نووح نارد ئەی نووح لەمهوو[illegible]یچ کەسێك ئیمان ناهێنێ لە قەومەکەت تەنها ئەوانە نەبێ کە پێشتر ئیمانیان هێناوە بێئ[illegible]بە لە ئیمان هێنانیان، خەفەت مەخۆ لە کردەوە خراپەکانی ئەوان کە ئیمان ناهێنن﴿٣٦﴾ ل[illegible] چاوی ئێمە و بە ڕەزامەندی و پاراستنی ئێمە کەشتییەکە دروست بکە بە وەحی و [illegible]مانی ئێمە دروستی بکە، پێت ئەڵێین چۆنی دروست بکە بەو شێوازە بەڵام گفتوگۆم لەگەڵ[illegible]کەو داوای ڕزگار کردنی ستەمکارانم لێ مەکە، ئەوان ڕزگار نابن و هەموویان نوقمی ئا[illegible]ئەبن﴿٣٧﴾ نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتییەکە، هەر کۆمەڵێك ل[illegible]ومەکەی بەلایدا تێئەپەڕین گاڵتەیان پێ ئەکردو ئەیانوت: نووح تۆ پێشتر پێغەمبەر بووی [illegible]بووی بە دارتاش؟! یاخود ئەیانوت: لە وشکانیدا کەشتی دروست ئەکەی ئایا کەشتی لە [illegible]یدا ئەڕوات؟

گاڵتەیان پێ ئەکرد نووحیش فەرمووی: ئەگەر ئەمڕۆ ئێوە گاڵ[illegible] پێ بکەن، ئەوە ئێمەش سبەینێ لە داهاتوو گاڵتە بە ئێوە ئەکەین کاتێك کە نوقم ئەبن ل[illegible]اوەکەدا﴿٣٨﴾ ئەو کاتە ئەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە ڕیسوا و سەرشۆڕی دەکات لە [illegible]دواتریش لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی بەردەوامی دەبێ لەناو ئاگری دۆزەخدا﴿٣٩﴾

## جۆری طۆفان و لافاوەکە[illegible]گاکەی [62]

ئەو ڕووداوەی کە باسکراوە لە قورئاندا هەرو[illegible]داوێکی سرووشتی ئاسایی نەبووە، بەڵکو سزای خوایی بووە بەڵام لە چوارچێوەی یاساکان[illegible]وشتدا، ئەو طۆفان و لافاوە ئەوەندە بەهێزە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[62] ( کولن وڵسن) دەنووسێ: ( ڕاسام) لە کتێب[illegible] ( سنحاریب) لە نەینەوا بەشێ تابلۆکانی (گلگامش)ی دۆزیتەوە، کە باسی لافاوی نوحی کردووە، ( [illegible]سمس) لە مۆزەخانەی بەریتانیا لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکات.

بە پێی قسەکانی ( هوربیجر) ئەندازیا[illegible]لمانی ڕووداوی لافاوی نوح بە هۆی ڕووداوێکی سروشتی بووە، ئەو پێی وایە بە هۆی مانگەوە ڕوو[illegible]ە کاتێ لە زەوی نزیک کەوتۆتەوە)، بڕوای وایە: ( ئەو لافاوە کیشوەری ئەتلانیتس ژێر ئاو خستووە[illegible]بە کیشوەری ون بوو ناسراوە)، وە بڕوای وایە: ( ٤٠٠ پ. ز ) ڕوویدا بێت. ( الإنسان و قوان الخفیة[illegible] ولسن/ل:١٠٠-١٠٤) سەیر بکە.

کە شوێنەوارناسان و ئەوانەی لەو بوارەدا کاریان کردووە دەڵێن; تا ئەم ساتە وەختەی تێیدا دەژین هاوشێوەی نەبووە، هەر دەبێت وابێت وەکو خوای گەورە دەفەرموێت سزا و ئەشکەنجەی زاڵمانە.

پاشان زۆرێک لە ڕاڤەکارانی قورئان بەهەموو سەرزەوی ڕاڤەیان کردووە واتا تەواوی سەرزەوی گرتۆتەوە، هەندێک لە کەمینەی موسڵمانان لە کۆن و نوێ دا دەڵێن تەنها ئەو ناوچەیەی گرتۆتەوە کە گەلی نووحی تێدا ژیاون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾ نوح

واتە: دوای ئەوەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بێئومێد بوو خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە چیدی خەڵکی ئیمان ناهێنن هەر ئەو چەند کەسەیە کە ئیمانیان هێناوە، ئەمیش دوعای کردو وتی: ئەی پەروەردگار لەسەر ڕووی زەویدا هیچ کافرێك مەهێڵە.

لێرەدا مەبەست هەموو سەرزەوی نییە، بەڵکو نێوانی دیجلە و فوراتە کە طۆفان و لافاوەکە ئەوەندە بەهێز بووە هەردوو ڕووبارەکەی کشاندووە و کردویەتیە دەریایەک لەناوچەکەدا، ئەمەش زانست و جیۆلۆجیا ڕاستی ئەمەیان سەلماندووە. چەندین زانا و پسپۆڕ لەو بوارەدا باسیان کردووە و دانیان پێدا ناوە نموونەی یەکەم کەس باس دەکەین لەوانە زانای بەناوبانگی بەریتانی (سێر لێونارد وڵی) لە ساڵی ١٩٢٠ هاتۆتە عێراق و پشکنینی کردووە لەناوچەکانی (تەل عەبیر) چەندین شوێنەواری سەردەمی چاخی بەرئایینی دۆزییەوە[٦٣].

نووسەر لەسەر ئەو ڕایەیە کە تەنها ناوچەکانی دۆڵی ڕافیدەین دا ڕوویداوە، هەروەها بێجگە اوچەکانی شارستانییەتەکانی عێراقی کۆن هیچ کەس باسی ئەو ڕووداوەی نەکردووە ئەمەش ەوە دەگەیەنێت تەنها لەو ناوچەیەدا بووە، ئێرانی کۆن و هیندەکان ڕەتیان کردۆتەوە کە لە وچەی ئەواندا لافا و طۆفان ڕوویدابێت، هەرچەندە ڕاستەوخۆ بە زەندیق و درۆزن ناوبراون، وماڼمان لە کافر بوونیان نییە، بەڵام لەبواری مێژوودا ڕاستیان کردووە. ئەم لافاوە ناوچەیەکی کجار زۆری داگیرکردووە لە بەشێکی زۆر لە وڵاتی ئەو ناوچانەی داپۆشیووە و فەرمان بە ەزرەتی نووح کراوە کە کەشتییەک دروست بکات بۆ پاراستنی خۆی و کەسووکارەکەی و اندارن بەگشتی، کە بەگوێرەی وتەی زانایان ڕاڤەکاری قورئان ٨٠ کەس یاخود ٨٠ خێزان ن. هەروەها شوێنەوارناسان لە ٧ تابلۆی خەتی بزماری سۆمەرییەکاندا باسی نووح هاتووە وەکەی ئاژەڵ و گیاندارانی ناوچەکەی ڕزگار کردووە، ئەم گیاندارانە بریتی نەبوون لە شێر،

---

[٦٣] ئەم زانیارییانە لە کتێبی (مع الأنبیاء)ی (عفیف عبدالفتاح طیارە) باسی کردووە (کاوە هاوڕاز) یەتی بە کوردی لاپەڕە ١٠٥.

زەڕافە، فیل، پڵنگ، مشک و...هتد، بەڵکو ئەو گیاندارانە بریتی بوون لە گیاندارەماڵییەکان و ئەوانەی کە پێداویستی ژیانی خەڵکی ئەو سەردەمە بوون لە مەڕوماڵات، ئەسپ، گوێدرێژ و پەلەوەرەکان واتا بەگشتی گیاندارانی ماڵی، ئەوەشی دەڵێن گوایە کە هەموو ئاژەڵان بووە هیچ بەڵگەی نییە لەڕووی لۆژیک و ئەقڵیشەوە ڕێگای تێناچێت، کەوا شێر و ئاسک و پڵنگ و مەڕو ماڵات و پەلەوەرەکان بە گشتی لەگەڵ گورگ و سەگ و پشیلەدا تێکەڵ کرابێتن و لە کەشتییەکدا پێکەوە بووبێتن و هەمووی بەسەلامەت ڕزگاریان بووبێت، لەگەڵ ڕووداوە ڕاستییەکاندا هیچ ناگونجێت و ڕاستی تێدانییە.

پێش ڕوودانی طۆفانەکە خوای پەروەردگار ئاگاداری حەزرەتی نووحی کردەوە کە کەشتییەک دروست بکات، بەدڵنیاییەوە بەئاراستەی خوای گەورە بوو کە ئەو کارەی کرد، چونکە یەکەم جارە کە داهێنانی گەورە ئەنجام بدرێت لەناو مرۆڤایەتیدا، دیارە کاتێک نووح دەبینرا لە کەشتییەکەدا کاری دەکرد لەگەڵ هاوکارەکانی، ملهوڕ و بێباوەڕ و موشریکەکان گاڵتەیان پێدەکردن، داخۆ کەشتییەکی ئاوا گەورەی بۆچییە لەو ناوچەیەدا کە تەنها ڕووبارە، و پێویستی بەو کەشتییە گەورەیە نییە کە ئاوا هەموو خۆیان پێوە سەرقاڵ کردووە! دیارە لەدوای تەواو بوونی خوای پەروەردگار ناونیشانی دایە نووح کە لەبەر چاڵ و چۆڵی دۆڵەکانەوە ئاو هەڵدەقووڵێت وەکو ئەوەی ئاوەکە بکوڵێت، سەرەتا لەناو خاک و دۆڵ و چیاکانەوە ئاوی خۆی دەڕژێنێتە سەرزەوی و پاشان لە ئاسمانەوە، ئەمەش سزاو توڕەیی خوای پەروەردگارە بۆ بەندە سەرکەشەکانی کە لە ڕێگای ڕاست لایانداوە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾* وَقَالَ ٱرْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْرٜىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَٰبُنَيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾﴾ هود

واتە: گاڵتەیان پێ ئەکرد نووحیش فەرمووی: ئەگەر ئەمڕۆ ئێوە گاڵتەمان پێ بکەن ئەوە ئێمەش سبەینێ لە داهاتوو گاڵتە بە ئێوە ئەکەین کاتێك کە لەناو ئاوەکەدا نوقم ئەبن﴿٣٨﴾ ئەو کاتە ئەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە ڕیسوا و سەرشۆڕی دەکات لە دونیا، دواتریش لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی بەردەوامی دەبێ لەناو ئاگری دۆزەخدا﴿٣٩﴾ تا فەرمانی ئێمە هات و سەر زەوی

هەمووی ئاوی لێ هەڵقووڵا، تەنانەت تەنووری نان کردن هەمووی ئاوی لێوە هەڵئەقووڵا، وتمان: ئەی نووح لە هەموو ئاژەڵ و باڵندەو گیانلەبەرو دانەویڵەیەك جوتێك نێرو مێ هەڵگرە بۆ ناو کەشتییەکە، کەسوکاری خۆتیش بخەرە ناو کەشتییەکە، کەسوکار مەبەست موسڵمانان و ماڵ و منداڵی، تەنها ئەوەی کە پێشتر بڕیار درابێ کە ئەوانە ئەبێ غەرق بن کە کافرانن و لە بنەماڵەی خۆیشی خێزانەکەی و کوڕێکی باوەڕدارانیش هەمووی بخەرە ناو کەشتییەکەوە، تەنها کەسانێکی کەم لەگەڵیدا ئیمانیان هێنا کە وتراوە لای زۆریەکەی هەشتا کەس بوون﴿٤٠﴾ نووح فەرمووی: بەناوی خوای گەورەوە سەر بکەونە ناو کەشتییەکە، بەناوی خوای گەورەوە کەشتییەکە ئەڕوات، بەناوی خوای گەورەشەوە لەنگەر ئەگرێ و ئەوەستێتەوە بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێخۆشبووە بۆ تاوانەکان، زۆر بەڕەحم و بەزەییە بەوەی کە ئەم کۆمەڵە خەڵکەی ڕزگار کرد، کاتێك کە کەشتییەکە لەناو ئاوەکەدا ئەڕۆیشت شەپۆلی ئاوەکە وەکو شاخ ئەیدا بەسەریاندا﴿٤١﴾ نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ بانگی لە یەکێك لە کوڕەکانی کرد کە کافر بوو، دوور بوو لە نووحەوە ئەی کوڕی خۆم باوەڕ بێنەو لەگەڵماندا سەربکەوە، لەگەڵ کافران و بێ باوەڕاندا مەبە ئەوانەی لە دەرەوەی کەشتییەکەن و نوقمی ئاوەکە دەبن﴿٤٢﴾

پاشان هەر لەو ساتە وەختی ڕوودانی لافاوەکەدا خیانەتی خێزانی دەردەکەوێت، لێرەدا خیانەت بەواتای نامووس نییە بەڵکو بەواتای شاردنەوەی بیروباوەری خێزانەکەی کە خۆی بە ئیماندار و شوێنکەوتووی نووح لەقەڵەم دەدا، بەڵام درۆی کرد، واتا خیانەتی لێکردووە و بڕوای بە ڕێبازو بیروباوەڕەکەی نەبووە، ئەمەش تەنها لە نووح ڕووینەداوە، بەڵکو بەسەر پێغەمبەری تریشدا هاتووە وەکو حەزرەتی لووط سەلامی خوا لەهەموو پێغەمبەران بێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾ التحريم

واتە: خوای گەورە نموونەی کافران دێنێتەوە بە خێزانەکەی نووح و خێزانەکەی لووط سەلامی خوای گەورە لە هەردووکیان بێت کە ئەمانە خێزانی دوو بەندەی چاکی ئێمەو دوو پێغەمبەری خوای گەورە بوون کە نووح و لووط بوون، بەڵام خیانەتیان لە مێردەکانیان کرد. خیانەتەکە لە دیندا بووە، واتە: لەسەر ئایینی پیاوەکانیان نەبوونە نەك خیانەتی نامووس و بەدڕەوشتی بێت، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەبەر ڕێزو حورمەتیان سەرجەم پێغەمبەرانی پاراستووە کە خێزانەکانیان کەسیان داوێن پیس نەبوونە، بەڵام خیانەتەکە ئەوە بووە خێزانی نووح بە نووحی ئەوت ئەم پیاوەی من شێت بووەو تێکچووە، کەسێك موسڵمان بوایە ستەمکارانی لێ ئاگادار

دەکردنەوە، خێزانی لووطیش کاتێك کە میوانیان بهاتایە ئەڕۆیی قەومەکەی ئاگادار ئەکردەوە کە میوانمان هاتووە وەرن دەستدرێژی بکەنە سەریان، ئەم دوو ئافرەتە کە خێزانی دوو پێغەمبەریش بوون بەڵام لەبەر ئەوەی خۆیان کافر بوون و موسڵمان نەبوون، ئەو پەیوهیندییەی لەگەڵ مێردەکانیاندا هەیبوو هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن لە سزای خوای گەورە، پێیان وترا: لەگەڵ ئەوانەی کە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئێوەش لەگەڵ هەموو کافران بچنە ئاگری دۆزەخەوە.

لەدوای خیانەتی خێزانی، کوڕەکەی دەکەوێتە گومانەوە چونکە لە گۆشەیەک لە نزیک کەشتییەکەدا وەستاوە و سەرناکەوێت، دایکی سەرنەکەوتووە و باوکیشی بانگی دەکات کوڕم سەرکەوە با لەگەڵ کافراندا نغرۆی ئەو طۆفان و لافاوە نەبیت، کەچی کوڕەکەی بڕیاری هەڵە هەڵدەبژێرێت و بۆ ڕازیکردنی دایکی شاخ هەڵدەبژێرێت، وا دەزانێت سزای خوای گەورە ناگاتە سەرلوتکە شاخەکە، ئەمە سزاو تۆڵەیە نەک حاڵەتێکی سرووشتی.[٦٤]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَىٰ نوح ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَٰبُنَيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٤٢ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ۝٤٣﴾ هود

واتە: نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ بانگی لە یەکێك لە کوڕەکانی کرد کە کافر بوو، دوور بوو لە نووحەوە ئەی کوڕی خۆم باوەڕ بێنەو لەگەڵماندا سەربکەوە، لەگەڵ کافران و بێ باوەڕاندا مەبە ئەوانەی لە دەرەوەی کەشتییەکەن و نوقمی ئاوەکە دەبن۝٤٢ وتی: ئەی باوکە ئەڕۆمە سەر یەکێك لەو شاخانە ئەمپارێزێ لە لافاوەکەو ئاوم پێ ناگات، نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك نییە لە فەرمان و سزای خوا، ئەمە سزای خوای گەورەیە مەگەر کەسێك خوای گەورە خۆی ڕەحمی پێ بکات، شەپۆلی دەریاکە بووە ڕێگر لە نێوان هەردووکیانداو لێکی جیا کردنەوە کوڕەکەی نووحیش یەکێك بوو لەوانەی کە لەناو ئاوەکەدا غەرق بوون۝٤٣

سزا خواییەکە بەردەوام بوو زیاتر دەبوو ئاو لە ئاسمانەوە دەڕژایە سەر زەوی، لەژێر خاکەوە سەردەکەوتە سەرزەوی، دۆڵی ڕافیدەین و چواردەوری بەلافاو داپۆشرابوو، ئاراستەی باوبۆران پێچەوانە بوویەوە، کەشتی نووحیش بەو ئاراستەیە دەڕۆشت کە خوای گەورە دەیویست تا لە

---

(٦٤) کوڕەکەی نوح ناوی بە کەنعان هاتووە.

چیای بەرزی جودی لەنگەری گرت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقِيلَ يَـٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَـٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴿٤٤﴾﴾ هود

واتە: پاشان خوای گەورە کە کافران و بێباوەڕانی لەناوبرد فەرمانی کرد بە زەوییەکە ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدە، ئەی ئاسمان بەسە باران مەبارێنە و با ببڕێتەوە، ئاوەکە وردە وردە کەمی کرد تا سەر زەوی وشك بوو فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بوو کە کافرانی هەموو لەناو بردو دوای بڕین، کەشتییەکەش لەنگەری گرت لەسەر شاخی (جودی) وترا: کەسانی زاڵم و کافرو بێباوەڕ هەر دووربن لە پاراستن و ڕەحمەتی خوای گەورە.

پاشا هێوربوونەوەی طۆفان و لافاوەکە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ لە شێوەی زانیاری و پرسیار و تێگەیشتن، سۆزێک لە دڵییەوە پرسیاری کرد خوایە خۆ کوڕەکەم لەنەوەی منە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَـٰكِمِينَ﴿٤٥﴾﴾ هود

واتە: نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بانگی لە پەروەردگاری کرد وتی: ئەی پەروەردگار کوڕەکەی منیش کەسوکاری من بوو، بەڵێنی تۆش حەقە کە وتت کەسوکارت ئەپارێزم تۆ لە هەموو حاکمەکان دادوەرتری.

خوای گەورە وەڵامی ئەداتەوە و دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَـٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾﴾ هود

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەی نووح با کوڕی تۆیش بێت بە کەسوکاری تۆ ناژمێردرێت، لەبەرئەوەی کافر بووەو موسڵمانان کەسوکاری تۆن و من بەڵێنم دا کەسوکارە موسڵمانەکانت ڕزگار بکەم نەك کافران، ئەم داواکردنە کردەوەیەکی باش نییە کە تۆ داوا لە من ئەکەی کوڕێکی کافرت ڕزگار بکەم، تۆ داوای شتێك لە من مەکە کە زانیاریت پێی نییە. من ئامۆژگاریت ئەکەم و ئاگادارت ئەکەمەوە لە نەزانەکان نەبیت، داوای شتێك نەکەیت کە لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا نەبێت.

لەململانێی کوفر و ئیماندا خزمایەتی و نزیک و خوێن هیچ نرخ (ئەرزش)ی نییە، بەڵکو ئیمان و خواناسی پلەی بەرزە و لەئاستی ئیماندا خوێندنەوە بۆ هەموو پرسەکان دەکرێت.

نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ باش تێگەیشت و زانی خوای موتەعال ناخی خوێندۆتەوە، بۆیە گەردنکەچی نواند و خێرا دەستبەجێ داوای ڕەحمەت و بەزەیی خوای کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ

رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴿٤٧﴾
هود

واتە: نووح عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار پەنا ئەگرم بە تۆ کە داوای شتێکت لێ بکەم کە من زانیاریم پێ نەبێت، ئەگەر لێم خۆش نەبیت و ڕەحم و بەزەییم پێ نەکەیت و تەوبەم قبووڵ نەکەی ئەوە من لە زەرەرمەندان ئەبم.

ئەوەی لەناوچەی بابل دا بوو لە کۆمەڵگەکاندا هەمووی لەناوچوو، سەرلەنوێ لەدوای طۆفان و لافاوەکە خەڵکی هیجرەتیان بۆ کرد، چونکە بە هۆکاری ئەو لافاوە بووە ناوچەیەکی زۆر پڕ خێر و بەرەکەت بۆ ئیمانداران، بۆ کافرەکانیش لەدوای لەناوچوونیان لە قیامەت لەسزا و ئازاردا دەژین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴿٤٨﴾﴾ هود

واتە: خوای گەورە فەرمووی: ئەی نووح عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ لە کەشتییەکە دابەزە بۆ سەر زەوی بە سەلامەتی و پارێزراوی لە سزای ئێمە، سەلام و بەرەکەتی خۆم ئەڕژێنم بەسەر ئێوەو ئەو ئوممەتانەیشی کە لە نەوەی ئەو کەسانەن کە لە کەشتییەکە لەگەڵتان بوون، کەسانێکی تر لە نەوەی ئەمانە کە دواتر کافر ئەبن لە دونیادا تا کاتی دیاریکراوی خۆیان ئەیانژیێنین، بەڵام پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی بە ئێش و ئازار ئەیانگرێتەوە.

## سەرچاوەی تەورات و ئینجیل بۆ باسی ڕابردوو

نەسارا بەگشتی بە هەرسێ مەزهەبەکەی کاتۆلیک و ئۆرتۆدۆکس و پرۆتستانت، پێیان وایە ڕووداوی ئادەم و حەوا و منداڵەکانی تا نووح عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ هیچی ڕووداوی ڕاستی نییە، بەڵکو پێیان وایە سیمبولە و تەنها بۆ ئەوەیە مرۆڤ لە ژیانی ئەم سیمبولانە بڕوانن کە چۆن ژیانیان بە شێوەیەکی فەنتازیایی بردۆتە سەر هەر بە فەنتازیا و ئەفسانە تەماشای دەکەن.

بەهیچ شێوەیەک نە ئادەم بە پێغەمبەر دەزانن نە نووح و نە ئیبراهیمیش، لای ئەوان ١٢ پێغەمبەری بچووک هەیە لەگەڵ چەند پێغەمبەرێکی گەورە، لەدوای هاتنی عیسای کوڕی مەریەم، ئیتر هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە، هەڵبەت ئەمە زیاتر لەناو پرۆتستانتە ڕیفۆرمییەکانی کەنیسەی ئەڵمانی بڵاوە، بەڵام لە کەنیسەی کاتۆلیک بڕوایان بەردەوام بە هاتنی پێغەمبەرە، بەڵام پێغەمبەران لای ئەوان وەکو کەسێکی ئاسایی دیندار تەماشا دەکرێت، هیچ زیادە و پلەوپایەی ئەوتۆی نییە، دەشێت پاپا گەورەتر بێت لە پێغەمبەران بەگشتی!

ئۆرتۆدۆکس بڕوای بە پێغەمبەر نییە و لای ئەوان (سەنتا) هەیە و قیمەتی (سەنتا) کە واتای پیرۆزی ئەدات زۆر لە پێغەمبەران بەهێزترن، بۆ نموونە پۆلس، پاولۆ، میکا، یونس، یوحەنا و...هتد زۆر لە پێغەمبەران بەڕێزترن، ئەو ١٢ (حەواری)یە یاخود قوتابییەی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە پێغەمبەران زۆر پلە بەرزترن، جا لە ئایینی نەسارادا پێغەمبەران زۆر ئەرزشی باس کردنیان نییە و لایان گرنگ نییە.

یەهوود بڕوایان بە پێغەمبەران هەیە، بەڵام لەناو پێغەمبەراندا نەوەی خوا هەیە کە بە کوڕی خوا دەیانناسن لەوانەش (عوزێر، دانیال، مووسا، حەزقیال، ئارمیا و...هتد) بەکۆی گشتی لای ئەوان لە سەدەکانی ڕابردووودا باسی ئادەم تا نووح بەهیچ شێوەیەک ناکەن و خۆیان نادەن لە هەورازی ئەو باسە، چونکە زۆرینەی خەڵکی کە وازی لە ئایینی ئەوان هێناوە لەبەر خورافاتی باسەکانیان بووە، بەداخەوە زۆربەی گوازراوەتەوە بۆ ناو نووسینی ئیسلامی لە تەفسیر و فەرمووده و مێژوو.

## دوای طۆفان و لافاوەکە

طۆفان و لافاوەکە نازانین چەند بەردەوام بووە، بەڵام هەواڵ و مێژوونووسان دەڵێت: سێ مانگ کاریگەری تەواوی هەبووە، لەدوای لەناوچوونی بێ باوەڕان لەناوچەی دۆڵی ڕافیدەین سەرلەنوێ خەڵکی گەڕاونەتەوە ئەو ناوچە، چونکە جێگایەکی پڕ ئاو و خێروبێری کشتوکاڵی بووە، پاشان لەڕووی گیاندارانەوە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بووە بۆ ژیانی ئاژەڵ، جا چ ماڵی بێت یاخود کێوی.

کاری پێغەمبەرانیش بڵاوکردنەوەی تەوحید و چەسپاندنی فەرمانڕەوایی خوایە لە ڕێگای شەریعەتەکەیەوە، بەدڵنیاییەوە حەزرەتی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ هەر لەو چوارچێوەیەدا بووە کە زەوی ئاوەدان بکاتەوە و فەرمانڕەوایی خوای پەروەردگار بچەسپێنێت.

بە دڵنیاییەوە لەدوای لەناوچوونی خێزانی و کوڕەکەی کەنعان کەلای ئەهلی کیتاب بە (یام) لەدوای ئەوە لە فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا هاتووە کە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ خاوەنی سێ کوڕی تر بووە بەناوی (حام، سام و یافث) کە فەرموودەکەش لاوازە، واتا پلەی (غریب)ی هەیە (عیلەتی تری زۆرە) [٦٥].

---

(٦٥) قال النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: سامُ أبو العَربِ، وحامُ أبو الحَبَشِ، ويافثُ أبو الرّومِ/ أحمد و الترمذي (حسن غريب) ترمذي قال الحديث حسن.

ناوچەی عێراق یاخود میزۆپۆتامیا خەڵکێکی زۆری تێدا لەناوچوو بە هۆکاری کافر بوونیان و سزای خوایی کە لافاوەکە بوو، بۆ ئەم مەبەستە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ دەبێت هەوڵی ئاوەدانکردنەوە و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی دابێت و منداڵەکانی بۆ گەیاندنی ئایینی خوا بەهەموو لاکانی زەوی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بڵاو کردبێتەوە بۆ گەیاندنی ئایینی خوای پەروەردگار.

بەو پێیەی کەناوی لە مێژووی دێرین و چاخەکاندا هاتووە، نووح کەسێکی ناسراو و خاوەن دەسەڵات بووە لەناوچەی ڕافیدەین واتا دیجلە و فورات، دیارە و سەرلەنوێ ئاوەدانی کردۆتەوە و بونیادی ناوەتەوە، بەتایبەت نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ کە دەست ڕەنگین و پیشەکار بووە، توانی بەئاراستەی خوای پەروەردگار ئەو کەشتییە دروست بکات کە ئەهلی کیتاب دەڵێن: جۆری دارەکان کە بەکاری هێناوە داری سنەوبەر بووە.

نەوەو زووریەتەکانیشی دەست ڕەنگین بوون، دوای خۆشی کە وەفاتی کردووە بە بەڵگەی قورئان خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ۝٧٧﴾ الصافات

واتە: نەوەکانیمان هێشتەوە ئەوانەی کە باوەڕیان پێی هێنابوو لەناو کەشتییەکەدا ئەوان مانەوە، بەڵام خێزان و منداڵی خۆی ئەوانەی کە کافر بوون نقوم بوون.

هەر ئەو توانا و ناووناوبانگەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ لەهەموو جێگاکان دەنگی دایەوە و زۆربەی ئوممەتەکانی تری دەورووبەری بۆلای ڕۆشتن و لەدوای لافاوەکە لەو ناوچەیەدا کۆیکردنەوە و بەئاراستەی وەحی کاریان دەکرد و ژیانیان بەسەر دەبرد.

ئەمەش لە ئایەتی ٤٠ سورەتی هوود[٦٦] دا بەجوانی دەردەکەوێت کە خەڵکانێکی تر لەدەوری کۆبونەتەوە لەدوای طۆفانەکە و ئەم پێغەمبەرە بەهۆکاری وەحی و زانستەکەی بۆتە بەرەکەتدار بۆ گشت خەڵکی.

بەرەکەت یاخود موبارەک لە شەرعدا بە شتێک دەوترێت کە خزمەت و چاکە لەگەڵ خەڵکانی تردا بکات، بۆیە بە هەرشتێک وترا بەرەکەتدار واتا سوودی بۆ خەڵکی هەیە بەگشتی، نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ دەست ڕەنگین و خاوەن پیشەو داهێنان بووە لەسەرووی هەمووشیانەوە پێغەمبەر بووە، جا ئەمەش هۆکاری ئەوە بووە کە بەزوویی خەڵک لەدەوری کۆ ببنەوە بۆ بونیاد نانەوەی کۆمەڵگەکان لەو ناوچایەدا، بەڵام بەهۆکاری لافاو و طۆفانەکە، ناوچەی تر پەرەیسەند و کۆمەڵگەکە دروست بوو لەناوچەکاندا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٦] لە لاپەڕەکانی پێشووتردا ئاماژەی پێکراوە.

لەڕاستیدا باس و خواستی زۆر هەیە لەسەر نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ لە مێژووودا، بەڵام بەداخەوە هەموو هەڵبەستراو و خەیاڵ و فەنتازیایە، ئەوەی کە لام ڕاست بووە زانایان کۆڕایەکیان لەسەر هەبووە بۆ خوێنەرم گواستۆتەوە.

## کۆی گشتی باس و ئامانجمان

هەروا سادە نییە ناوی پێغەمبەرێک لەقورئاندا هاتووە کە ناسراوە بە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ تەنها بۆ ئێمە باسێکی مێژوویی پوخت بێت و بزانین لەسەر زەوی کەشتی دروست کردووە و طۆفانێک ڕوویداوە، ئەمە دیوی مێژووە، بەڵام قورئان بەو جۆرە باسەکە ناکات، لێرەدا کە نموونەی قورئانیم داناوە بۆ پاڵپشتی بەهێزی ڕووداوە مێژووییەکانە دەنا قورئان باسێکی موعجیزەیی و باسێکی پڕ لە وزە (ئێنەرجی) لە چاکە بۆ مرۆڤایەتی دەگوازێتەوە تا ڕۆژی قیامەت، نەک بە واتای نەسارا کە پەنا بەخوا پێیان وایە نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ تەنانەت ئادەمیش هەموو ئەمانە ڕاستی نین، بەڵکو خەیاڵ و سیمبولن بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکانە، بەڕاستی درۆیان وتووە و گومڕای تەواون لە ڕووی ئایینەکەیانەوە کە دەستنووس و دەستکردی خۆیانە، ئێمەی موسڵمان بڕوای تەواومان پێی هەیە و بڕوامان بە ڕاستی و دروستی ڕووداوەکان هەیە، بەڵام بەچاوی مێژوویەکی ڕوون و قووڵ تەماشا ناکرێت، بەڵکو پڕیەتی لەوانە و نهێنی و ژیان کە هەوڵدەدەین هەندێکی باس بکەین.

کەواتە من و تۆی ئیمانداری وریا و چالاک نابێت ساویلکانە بیر بکەینەوە و بڵێین ماشاءالله ٩٥٠ ساڵ تەنها پێغەمبەرایەتی کردووە، لەولاشەوە کەسێکی بێئاییینی مولحید ڕاست دەبێتەوە و دەڵێت شتی وا نابێت خۆتان سەرقاڵ دەکەن بە گفتوگۆی بێئەنجامەوە، لێرەدا تۆ لات سەیرە تەمەنی نووح بەڵام پێویستە بتهەژێنێت چەند ساڵی تەمەنی خۆت تەرخان کردووە بۆ بانگەواز؟

چۆن دەتوانیت تۆش کەشتییەک بونیاد بنێیت خێزان و کەسووکار و شار و وڵات و ئوممەت ڕزگار بکەیت لە شاڵاو و شەپۆلی دەریای گومڕایی سیکۆلاریزم و ئیلحاد و سیستەمەکانی تری کوفر؟

لێرەدا بۆ من و تۆ گرنگ نییە سام و حام و یافث کێن و چییان کردووە، ئایا نەوەکانمان چۆن پەروەردە دەکەین بەچاوی خزمەت کردن بە خەڵکی یان بوون بە بار بەسەر کۆمەڵگە و خەڵک و خێزانەوە؟

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ۝٣﴾ الإسراء

واتە: ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نووح دا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە کەشتییەکەدا هەڵمان گرتن و ڕزگارمان کردن ئێوەش وەکو نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بن کە عەبدێك بووە شوکرانە بژێری خوای گەورەی کردووە، وەسفی نووحیش عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەکات بە عبودیەت و بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە و زۆر سوپاسگوزاری خوای گەورە بووە، چوونکە لە پاش خواردن و خواردنەوەو پۆشاك لەبەرکردن و هەموو حاڵەتێکیدا حەمدو سوپاسی خوای گەورەی کردووە.

ئایا تۆ چەندە بەندەیەکی سوپاسگوزاری لە جلوبەرگ و لە خواردن و خواردنەوە و کاروکەسابەت و ڕزق و ڕۆزیدا یاخود لەهەموو بوارەکانی تردا؟

ئایا وەکو نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ و پێغەمبەرانی دوایی نەوەی چاك و پاکی کە بخەیتەوە دوای خۆت بۆ دینداری و خواناسی وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ۝٥٨﴾ الأعراف

واتە: خاکی پاك دانەوێڵەو ڕووەکی باشی خۆی دەرئەکات بە ئیزنی خوای گەورە، بەڵام خاکی پیس هیچ ڕووەك و دانەوێڵەیەك دەرناکات تەنها شتی بێخێرو بێسوود نەبێت، ئەمە نموونەی باوەڕدارو بێباوەڕە، کە باوەڕدار دڵ و کردەوەی پاك و چاکە، بێباوەڕ دڵ و کردەوەی پیسە بەم شێوازە ئێمە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون ئەکەینەوە بۆ کەسانێك کە شوکرانە بژێری خوای گەورە بکەن و دان بە نیعمەتەکانی خوای گەورەدا بنێن.

دەبێت بیر لەوە بکەیتەوە ئەو سالانەی بەسەرددا تێدەپەڕن و تۆ مردوویت جێگا پەنجەت چییە و چی بووە بۆ ئیسلام و ئوممەتەکەی تا ببێتە صەدەقەی جاری بۆت؟ شەیتان لە کەمیندایە بۆ مرۆڤەکان کاری خۆی دەکات تۆ چ کارێک دەکەیت تا بتوانی ڕێگای شەیتان تەسک و باریک بکەیتەوە؟

پیاوچاکانێک شەیتان کردوونی بە خوا و پەرستویانن، ئێستا پیاوخراپان دەپەرسترێن و بیروباوەڕیان بووە بە دین و لەناو خەڵکیدا بەندایەتیان بۆ دەکرێت زۆری تر، پێویستە خۆمان دەوڵەمەند بکەین بە ئەزموونی پێغەمبەران.

شاڵاوی بتی سەردەم وەکو جاهیلییەتی کۆن پەرستویانن لە ئێستادا دووبارە بووەتەوە، جا ناوەکان گۆڕاوە دەنا هەریەک نەخشە ڕێگای جاهیلییە.

ئەم ئوممەتە هۆکاری زیندوویەتی دەگەڕێتەوە بۆ بانگەوازەکەی کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (بلغو عني ولو آية) لەمنەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بووە، ئەمەش موبارەکی

و بەرەکەتی ئوممەتەکەیە کە خاوەن بانگەوازە، نووح فێری خۆڕاگری و ئارامی و کۆڵنەدانی کردین لەم بانگەوازەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئوممەتەکەی من شاهیدی بۆ نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەدەن لە ڕۆژی قیامەت چونکە لاسایکەرەوەی کارەکانی ئەوین، بۆیە بە شاهید وەردەگیرێین. دیسان شەیتان لە مەیدانەکەدا بوونی هەیە، لای گرنگ نییە مرۆڤ تاوان بکات، دەزانێت ئەگەر خاوەنی بیروباوەڕی تەندروست بێت دەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری و تۆبە دەکات، دەشزانێت خوای گەورە لەبەندە گوناهکارەکانی خۆش دەبێت، بەڵام ئەو لەعنەتییە دەیەوێت عەقیدەی موسڵمان تووشی شیرک و هاوبەشدانان بکات بۆ خوای پەروەردگار، بۆیە زۆرێک لەپیاوچاکانی بەکارهێنا بۆ ئەوەی تەوەسولیان پێبکەن و پەیکەر و گۆڕەکانی کردنە نزرگە تا خەڵکی لە خوای پەروەردگاریان دوور بخاتەوە بەناوی تەوەسول و شەفاعەت لە ڕێگای مردوو کە ئەمەش ئەوپەڕی ترسناکی و هەڵوەشاندنەوەی ئیمانە لەدڵ و دەروون‌دا و هەروەها لە کرداریشدا.

ڕووداوەکانی ژیانی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فێری خۆڕاگری و هێزو توانای ململانێمان دەکات لەگەڵ شەپۆلەکانی کوفر و شیرک دا، (خەبابی کوڕی ئەرەت)ی فێری خۆڕاگری کرد کە بەندەیەکی لاواز بوو، عومەر لێیپرسی چ ڕۆژێک زۆر ئازاریان داویت؟ لەوەڵامدا وتی: بەردەکانی مەککە لەبەر خۆردا بوو بوونە پشکۆ لە پشتی مندا سارديان دەکردەوە، کە پشتی نیشانی عومەردا هەموو بە ئەندازەی بەردە سوورەوەبووەکانی بەر گەرمای عەرەبستان پشتیان سوتاندبوو، کونیان کردبوو، عومەر بەو ئازایەتی و چاونەترسانەی خۆیەوە لە تاواندا چاوی خۆی گرت و ئاهی بۆی خواردووە، ژیانی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بیلال و خەبابی کوڕی ئەرەت و هەزارەهای فێری خۆڕاگری و ڕاوەستاوی کرد، لەپێناوی ئیسلام و دیندا دەتوانن ڕووبەڕووی هەموو ناڕەحەتییەک ببنەوە.

نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ شەو و ڕۆژ واتا ٢٤ کاتژمێر لەناو بانگەوازەکەیدا بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا۝﴾ نوح

واتە: نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی پەروەردگار من بانگەوازی قەومەکەی خۆم کرد بۆ ئیمان هێنان بەتۆ بە شەو و بە ڕۆژ بە بەردەوامی.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵی نەدا ئەگەرچی جەنگی دەروونیان لەگەڵدا دەکرد بۆ ئەوەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ نەبینن کراسەکانیان هەڵئەدایەوە بەدەم و چاویاندا و پەنجەیان دەخنی بەگوێیاندا بۆ

ئەوەی گوێ بیستی نەبن، ﴿فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارًا ۝ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّواْ وَٱسْتَكْبَرُواْ ٱسْتِكْبَارًا ۝﴾ نوح

واتە: بەڵام بانگەوازی من هیچ شتێکی بۆ ئەوان زیاد نەکرد تەنها دوورکەوتنەوەو ڕاکردن نەبێت۞ هەر کاتێك کە من بانگیانم کردبێ بۆ ئەوەی کە تۆ لێیان خۆش بیت، واتە بۆ ئەوەی ئیمان بێنن کە بەهۆی ئیمان و گوێڕایەڵی و عیبادەتەوە تۆ لێیان خۆشبی، ئەوان پەنجەکانیان ئەکردە گوێیانەوە بۆ ئەوەی قسەی من نەبیستن جلەکانیان ئەدا بە بان سەریانداو دەموچاویان دائەپۆشی بۆ ئەوەی نەمبینن و قسەی من نەبیستن و من نەیانناسمەوە، بەردەوام بوون لەسەر کوفر و سەرپێچییان، خۆیان بەگەورەزانی لەوەی کە حەق وەربگرن خۆبەگەورەزانینێکی سەخت۞

لەکاتێکدا ئێمە زۆربەی کەرەستەی بانگەوازمان بۆ ئاسان بووە، هەر لە ڕێگای ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو، بێجگە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و وێب سایت و دەیان هۆکاری تر لە مزگەوت و گۆڤار و تەنانەت ڕێکخراوی ئیسلامی، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ ئێمەی موسڵمان لە لاوازیداین و بەرانبەرەکەمان بەهێزتر دەبێت، ئەمەش هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ پێنج جۆر دینداری.

١- خەڵکانێکی دیندار هەن قورئان دەخوێنن یان گوێی لێدەگرن گوێ لە زانا و وانەی ئایینی دەگرن، بەڵام بۆ کات بەسەربردن وەکو ئەوە وایە سەیری یاری تۆپی پێ دەکات، کام یاریزانەی هێرشی باشی برد خۆشەویستە و چەپڵەی بۆ لێ دەدەن، بەڵام لە ڕاستیدا لەناو ئەم ئایینەدا تەماشا کردن نییە، بەڵکو دەبێت هەموو لێدان و هێرش بەرین دژی ئەوانەی دژی ئایینی خوان، نابێت بە چاوی یاری تۆپی پێ تەماشای بانگخواز و مامۆستایانی ئایینی بکرێت، تۆش خۆت کەسێکی لەوان.

٢- جۆرێک لە دیندار نوێژ دەکات خۆی دەپارێزێت لەتاوانی گەورە، بەڵام گوێ بۆ زیاتر نزیک بوونەوە نادات و کەسێکی ئاسایی و سادەی ناو کۆمەڵگەیە، نە خۆی دەگۆڕێت نە گۆڕانکاری پێ دەکرێت، تەنها ئەهلی بن سێبەرە زۆری بۆ هات واز لەهەموو شتێکی دینداری دەهێنێت، وەکو کورد دەڵێت: (دەستی گرتووە بە کڵاوەکەیەوە بۆ ئەوەی با نەیبات).

٣- کەسێکی خواناسە دیندارە حەزی بە ئایینی خوای پەروەردگارە، بەڵام بە سیما وەکو مۆدێل وایە، حەز دەکات ڕیشی درێژ بێت یان نیقاب بێت، یاخود شەرواڵی کورت بێت، بەهۆکاری ڕووکەشی ئاگای لەناخی نییە، هیچ نازانێت لە ئایینی خوا وەکو ڕەجەبی تەمەڵ دەمی کردۆتەوە تا هەنجیرێک بکەوێتە خوارەوە ڕێک بۆناو دەمی، خووی گرتووە بەیەک مامۆستا و مەلا یان

بانگخوازێک، هەرچی وت ئیتر لای ئەو ئایینە، بە دوای سەرچاوەی تردا ناگەڕێت، ئەم جۆرە وەکو بەرد وایە لە جێگای خۆی ناجوولێت.

٤- زۆر دیندار و خواناسە دەیەوێت ئایینی خوا سەربخات، گوێگرە گوێڕایەڵە، بەڵام ئەوەی لەگەڵ خۆیدا نەبێت دوژمنە یان کافرە، ئەم جۆرە لە جیاتی ئیلتیزام دەمارگیری بۆ دروست دەبێت، پابەند نییە بەڵام زۆر زۆر موتەعەصیبە بە لایەن و گروپەکەی خۆی، هەندێک سەرچاوەی خوێندۆتەوە وادەزانێت تەنها ئەو ئایینە، ئەوەی لەخۆی نەبێت گومڕایە، ئەم جۆرە زۆر ترسناکن.

٥- کەسێکە بۆ ئیسلام دەژی بۆ ئیسلام دەمرێت تێکەڵاوی هەموو چین و توێژێک دەکات، بۆ هەر بارێکی کۆمەڵایەتی یان دەروونی تەفسیری باشی پێیە و واقعییە و خواناسە، ستراتیژی ئەوەیە بۆ بەهەشت کار بکات و کەبیری نەچووە کە خەلیفەیە لەسەر زەوی و وریایە و ئاقڵە، شەووڕۆژ بانگەواز دەکات بەبێ ئەوەی ببێتە بار بەسەر کەسەوە، خۆشەویستە لەناو ئیمانداراندا و گوێی بۆ دەگیرێت لەهەموو جێگاکاندا و خاوەنی زانیاری و زانستی تەندروستە.

پێویستە خۆت بدۆزیتەوە کە لەکام جۆرە دیندارەیت، خۆت بگەیەنیتە ئاستی خاڵی پێنجەم.

طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی لە یەمەنەوە هات بۆ مەککە خەڵکی قوڕەیش وتیان: گوێ بۆ محەمەد مەگرە لەخشتەت دەبات، ئەویش وتی: من شاعیرم و تەمەنم لە ڕوشدایە، گوێی بۆ دەگرم قسەکانی باش بوو وەری دەگرم و خراپ بوو خۆمی لێ بەدوور دەگرم، کە چوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، خێرا هیدایەتی وەرگرت و چەند کاتێکی کەم لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا بوو هەندێک شتی سەرەتایی فێر بوو، دوای مۆسڵمان بوونی بە پێغەمبەر ﷺ -ی وت: بەچی فەرمانم پێ دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فەرمانت پێ دەکەم بگەڕێیتەوە بۆناو هۆزەکەت و بانگیان بکەیت بۆلای خوای پەروەردگار { آمرک ان تعود الی قومک فادعوهم الی الله}.

ئەم جۆرە خەڵکانە زۆرن کە لە ڕووی کردارەوە زرەنگ و وریان، وەکو کورد دەڵێت: (کردەن)، ئیسلام مرۆڤی کردەی دەوێت، پیاوی ئازار و گەنجی چاونەترسی دەوێت.

کورت و پوخت؛ حەزرەتی نووح عليه السلام تەمەنێکی زۆری بەکارهێناوە لەبانگەوازدا لە نموونەی خۆڕاگری و ئارامگرییە، بۆیە پێویستە چاوی لێبکەین کە بۆ نموونە بۆ پێغەمبەرەکەمان هاتووە، واتا بۆ ئێمەی ئوممەتی محەمەدیشە ﷺ.

هەرگیز دوودڵ مەبن لە بانگەواز ئەگەر بە وشەیەکیش بووە، لە جەنگی فارس دا بەسەرکردایەتی (موسەنای کوڕی حارس) لە ڕیزی ڕاستی سوپاکەوە فارس هێزی هێنایە ناوجەرگەی موسڵمانان لەڕێگای هۆزی (بەنی بەکر)ەوە، موسەنای کوڕی حارس سێ وشەی بۆ نووسین بەو سێ وشەیە گەڕانەوە و لای ڕاستی موسڵمانانیان بەهێز کرد و نووسی (موسڵمانان تووشی سەرشۆڕی مەکەن) (لاتفضحوا المسلمین) سوپاس بۆ خوا موسڵمانان سەرکەوتن و بەنی بەکر خوای گەورە هیدایەتی دان بەو سێ وشەیە و کلیکی دڵیان بوو.

منیش لێرەوە پێتان دەڵێم و بەخۆم لەپێش ئێوەوە، تکایە موسڵمانان سەر شۆڕ مەکەن، بەڵام هەمیشە لە بانگەوازدا بن بۆ ئایینی خوای پەروەردگار.

## وانەیەک لە طۆفان و لافاوەکە

لە ئێستادا طۆفان و لافاوی بێئایینی و ئیلحاد و بیروباوەڕی خوانەناسی زۆر ڕووی کردۆتە وڵاتی موسڵمانان و شەپۆلەکانی چیاو دەشت و دۆڵی داپۆشیوە، بگرە شەپۆلی ڕادیۆی و سەتەلایتی ئاسمانیشی داپۆشیوە. چاومان لە طۆفانە و گوێمان لە طۆفانە، پێویستە بەهەمووومان خەریکی دروستکردنی کەشتی ڕزگاری بین لەم طۆفان و لافاوە کە بەسەرماندا هاتووە.

چاو لەحەزرەتی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بکەین شەووڕۆژ بانگەوازی دەکرد و خۆی نەدا بەدەستەوە، تووشی تەمەڵی و دوودڵی نەبوو، بەردەوام بوو ئاخر (بەرائی کوڕی مالیک) دەڵێت: حەز دەکەم ئەو کاتە بمرم کە ئیسلام عەزیز بێت، تەماشای ئەو هێز و توانا و ڕۆحە پڕ ئازایەتی و سەرکردەیە چۆن بۆ ئیسلام دەژی و دەمرێت (لأموتن والإسلام عزيز).

## ئایا چەند لە ئێمە خاوەنی ئەو کەرامەتە و عیززەتەین؟

ئەوەندە داوات لێ کراوە کە دەیزانیت، وەکو پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: تەنها لە منەوە ئایەتێک بگەیەنن (بلغو عنی ولو آية) قسەیەکی خێر، گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی هاوەڵێک پیاوچاکێک، ئەوەندەی لە توانات دایە، لابردنی بەردێک لەسەر ڕێگایەک، پێکەنینێک بەڕووی خەڵکیدا...هتد.

بەڵام بەواتای ئەوەش نا خەریکی قسەی زل بیت و خۆت هیچت لەباردا نەبێت، ﴿۞أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ البقرة

واتە: ئایا ئێوە فەرمان ئەکەن بە خەڵکی بە چاکە و ئیمان هێنان و نوێژو ڕۆژووو، خۆتان لەبیر ئەکەن و خۆتان نایکەن لە کاتێکدا ئێوە کتاب ئەخوێننەوەو لە کتابەکەدا ئەو شتانەی تیایە ئەی بۆ عاقڵ نابن و تێناگەن.

خۆت پەروەردە بکەو ئینجا خەڵکیش بانگ بکە بۆ ئایینی خوا، هەوڵبدە خەڵکی بەدین کە و هەوڵبدە کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکە، باشترین چارەسەر بۆ گرفتەکان تۆبەکردن و (استغفرالله)یە.

جارێک پیاوێک هاتە لای ئیمامی شافیعی و پرسی زۆر قەرزارم چی بکەم؟

ئیمامی شافیعی فەرمووی: (استغفرالله) بکە، پاشان کەسێکی تر هات و وتی: جەناب خێزانم منداڵی نابێت، شافیعی فەرمووی: (استغفرالله) زۆر بکە، کەسێکی تر هات وتی: تاوانم زۆر کردووە چی بکەم؟

شافیعی فەرمووی: (استغفرالله) زۆر بکە.

پاشان وتیان بە شافیعی بێجگە لەم قسەیە شتێکی ترتان پێ نییە؟

شافیعی فەرمووی: خوای گەورە بە گەلی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ -ی فەرموو: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾﴾ نوح

واتە: پێم وتن ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لەو کوفرو تاوان و شیرکانەی کە پێشتر کردووتانە ئەبینن خوای گەورە زۆر لێخۆشبووە بۆ ئەو تاوانبارانەی کە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەن و لێیان خۆش ئەبێ﴿١٠﴾ خوای گەورە بارانتان بۆ ئەبارێنێ بارانێکی زۆر یەك لە دوای یەك بە لێزمە و بەخوڕ﴿١١﴾ هەر بەهۆی (أستغفر الله) و داوای لێخۆشبوون کردن لە خوای گەورە، خوای گەورە ماڵ و منداڵتان پێ ئەبەخشێ، باخ و بێستانتان پێ ئەبەخشێ، ئاو و کانی و ڕووباریشتان پێ ئەبەخشێ، هەموو نیعمەت و بەخششێکتان پێ ئەبەخشێ تەنها ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن﴿١٢﴾

پاشان دوعای خێر بکەن بۆ یەکتری...

ئەبو هورەیرە کە نوێژی دەکرد یان خواناسی دەکرد دایکی قسەی پێ دەوت، دایکی بەردەوام موشریک بوو، زۆر بێزار بوو، ئەبو هورەیرە چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای کرد و وتی: هەرچی بانگەوازی دایکم دەکەم زیاتر قسەم پێ دەڵێت، پێغەمبەریش فەرمووی: خوایە هیدایەتی دایکی ئەبو هورەیرە بدە[٦٧].

کاتێک ئەبو هورەیرە چوو بۆلای دایکی، دایکی لەدوورەوە وتی لە جێگای خۆت بوەستە نەییتە ژوورەوە، ئەبو هورەیرەش وتی: دایکە دیسان جنێوم ئەدەیتێ؟ دایکی وتی: کوڕم شایەتومان دەهێنم!

کەواتە دوعا کردن زۆر کاریگەرە و خوای گەورە هیدایەتی خەڵکی پێ ئەدات.

خۆ ئەگەر زوڵمت لێکرا ئەوا دوعای مەزلومیش گیرایە دژی زاڵم.

پێوسیتە هەموو بەیەکەوە هەوڵ بدەین کەشتی ڕزگارکردن دروست بکەین، جا بەهۆکاری ڕاگەیاندن و خوێندنەوە و بینراو و بیستراو...هتد، تا خۆمان و کۆمەڵگەکەمان لە تۆفان و لافاوی بێ ئایینی و ئیلحاد ڕزگار بکەین و خەڵکی لە بێ باوەڕی بەرەو پابەند بوون بەرین، ئەوەی پێداویستییە بۆ ڕزگاری ئەو خەڵکەو سەرفرازی و هیدایەتیان لەگەڵ خۆت هەڵیبگرەو کاری پێبکە، جا بە قەڵەم بێت یان کۆمپیوتەر یاخود مزگەوت...هتد.

با وەک کورەکەی-نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان بەسەر نەیەت، باوکی وتی کوڕم وەرە لەگەڵماندا بەڵام قسەی نەکرد تا شەپۆلی لافاوەکە نغرۆی کرد.

ئێمەش کوڕی ئەم ئیسلامەین ئاگاداری خۆمان بین سواری کەشتی ئەم ئایینە بین و لافاو و طۆفانی خوانەناسی نغرۆمان نەکات، ﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَـٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَـٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ هود

واتە: وتی: ئەی باوکە ئەڕۆمە سەر یەکێك لەو شاخانە ئەمپارێزێ لە لافاوەکەو ئاوم پێ ناگات، نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك نییە لە فەرمان و سزای خوا، ئەمە سزای خوای گەورەیە مەگەر کەسێك خوای گەورە خۆی ڕەحمی پێ بکات، شەپۆلی دەریاکە بووە ڕێگر لە نێوان هەردووکیانداو لێکی جیا کردنەوە، کوڕەکەی نووحیش یەکێك بوو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٧] اللَّهمَّ اهدِ أمَّ أبي هريرةَ/مسلم.

لەوانەی کە لەناو ئاوەکەدا غەرق بوون ﷺ پاشان خوای گەورە کە کافران و بێباوەڕانی لەناوبرد فەرمانی کرد بە زەوییەکە ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدە، ئەی ئاسمان بەسە باران مەبارێنە و با ببڕێتەوە، ئاوەکە وردە وردە کەمی کرد تا سەر زەوی وشك بوو فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بوو کە کافرانی هەموو لەناو بردو دوای بڕین، کەشتییەکەش لەنگەری گرت لەسەر شاخی (جودی)، وترا: کەسانی زاڵم و کافرو بێباوەڕ هەر دووربن لە پاراستن و ڕەحمەتی خوای گەورە(٤١)

## گەڕانەوە بۆ سەردەمی دوای نووح

لەدوای گەڕانەوەی نووح بۆ ناوچەکانی نێوان دۆلی ڕافیدەین، بانگکردنەوەی بۆ ئاوەدانکردنەوەی کاتی مردنی نزیک بووەوە و لەکۆتایی ژیانی دا ئیبن و ئەسیری جەزیری دەڵێت: نووح لەسەرەمەرگ دا وتی: دنیا وەکو دەرگایە، لە یەکێکیان هاتمە ژوورەوە لە دەرگاکەی تریان دەرچوومە دەرەوە، هەروەها (الثعلبي) لە (قصص الأنبياء)دا باسی کردووە.

لەدوای وەفاتی نووح پادشاکانی فارس دەردەکەون کە دەسەڵاتیان هەبووە، هەرچەندە فارس بەدرۆزن ناسراون لە گێڕانەوەی مێژووی خۆیان و مێژووی ناوچەکە بەگشتی، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی وەردەگرین، هەرچەندە دوو کەسی خواناس و ناودار بوون، بەڵام زۆربەی باسەکانیان لاوازە، ئەویش جەنابی (ئەبو منصورە) کەناوی تەواوی (محەمەد کوڕی عبدالرزاقی طوسی)یە خاوەنی کتێبی (شاهنامە)یە کە ناسراوە بە شاهنامەی ئەبومەنصوری طوسی و پاشان کەسێکی تر بەناوی فیردەوسی کە ئەویش خەڵکی هەمان شارە کە ناسراوە بە حەکیمی طوسی لەساڵی ٣٢٩-٤١٦هیجری قەمەری لەسەردەمی سامانی و غەزنەوییەکاندا بوون، سەرچاوەی ئەم دوو شاهنامەیە دەستنووسە کۆنەکانی فارس و ئاڤێستای ئایینی زەردەشتی بووە.

هەروەها شاهنامەی کوردی بەهەمانشێوە باسی ڕووداوەکانی کردووە کە پێدەچێت هەر لە شاهنامەی فارسەکانەوە وەرگیرابێت کە بە هەورامی نووسراوە، گوایە کەسێک نووسیویەتی بەناوی (ئەڵماس خانی کەنولەیی)، بەڵام هیچ سەرچاوەیەک نییە بۆ ڕاست و دروستی، بەهەرحاڵ ڕای تریش هەیە کە شاهنامەی کوردی خەڵکی تریش نوسیوویەتی، بەڵام هیچ سەنەد و ڕاستییەکمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام هەموو ئەم وەرگیراوانە لە شاهنامەکاندا لەزمانی پەهلەوییەوە وەرگیراوە لە ئەدەبیاتی ئاڤێستایە و دوو زمانن لەیەکەوە نزیکن. لە ئاڤێستای زەردەشتیدا لە ئادەمەوە یەکەم مرۆڤ دەهێنێت کە بە پادشا ناوی بردووە، لە ئایینی زەردەشتی پادشاکان گرنگ بوون، ئادەم بە پادشا و شاهی گەورە ناسراوە بەناوی (تەخمور) لە شاهنامەدا بە (طهمورس)، هەرچەندە لە گێڕانەوەدا لەناوی پادشاکانیان تێکەڵوپێکەڵیەکی پێوە دیارە، دیارە بە هۆکاری وەزن و قافیەی شیعرەکانی شاهنامەیە.

لەدوای پادشایەتی (طهمورس) کەسێکی تر دێت بەناوی (جەمشید)، بە یەکێک لە پادشا دادپەروەرەکانی پارسیا دادەنرێت، گوایە ئاوەدانی زۆری کردۆتەوە، گرنگی زۆری داوە بە ڕستن و چنین و کەرەستەی سەربازی دروست کردووە، ئەم کەسە لە ئێران ژیاوە پێش لافاوەکەی نووح و باوکی ناوی (هوشەنگ) بووە، بە واتای تەلارساز یاخود دروستکەری بینای جوان.

هەروەکو ئاماژەمان پێدا لەناوچەکانی دۆڵی ڕافیدەین لافاو و طوفان لەوێدا بووە، ئێرانیش بەهۆکاری زوڵم و زۆری پادشاکان لە ناوچەی یەکتر دوور دەکەوتنەوە، خەریکی فراوان کردنی قەڵەمڕەوی خۆیان بوون، لەجەنگدا بوون هەر ماوەیە و دەورانی سەردەمی پادشایەک بووە کە پێناچێت لە باوان و نەسەبیاندا لە یەکەوە نزیک بووبن، لە کتێبە مێژوویەکاندا زۆر شتی خورافی باسکراوە لەسەریان، هەروەها ڕۆژمێری پارسیای کۆن بەهەمانشێوە ڕۆژمێری سێ هەفتە ساڵێک بووە، چونکە زۆرێک لە پادشاکانیان لە سەروو هەزار ساڵەوە ژیاون.

بەڵگەی نوێ لەبەردەستدایە کە نێوانی پادشاکان بە ڕۆژمێری هیجری قەمەری لێکدراوەتەوە، ٣٠-٤٠ ساڵ نێوان پادشاکانیان بووە، بۆ نموونە نێوان هوشەنگ و طەهمورس ٣٠ ساڵ حوکمڕانی بووە، هوشەنگ ٤٠ ساڵ حوکمڕانی کردووە!

پادشاکان لەو نێوەندەدا زۆر بوون لە سەردەمی ئادەم و نووح ئەوانەی کە ناویان هاتووە (پەردات، یوبونگان، کیومەرتن، یبوراسب...هتد) ئەمانە و زۆرێکی تر لە ئاڤێستادا هاتووە، هەندێکیش لە شاهنامەی ئێرانیدا یاخود کوردیدا.

## سەردەمی زوحاک ناسراو بە ئەژدەها[٦٨]

زوحاک بە خوێنڕێژترین پادشای ئێران دادەنرێت کەناوی زۆرە لە ئاڤێستادا بە یبوراسب هاتووە، کە واتای ئەژدەها دەدات، عەرەب پێی دەڵێن ضحاک وەکو ئیبن ئەثیر باسی دەکات کە لە طەبەریدا و ئیبن جەوزی لە ئەعالیبی وەریگرتووە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٨] ( ابن الأثير) مێژونووسی گەورەی کورد دەنووسێ: هەندێ دەڵێن: بیوراسب ئەژدیهاکە ( الضحاك).

( هشام الكلبي) بڕوای وایە: ئەژدیهاک ( نەمرود) بووبێ، کە لەسەردەمی ئەودا بڕیاری سوتاندنی ئیبراهیمی داوە. ( الكامل في التأريخ/ج١/: ٥٨-٥٩).

بێگومان لە ڕانیە/ بێتوین/ لە حاجیاوە شوێنەواری ئەشکەوتی ئیبراهیم هەیە، هەروەها دۆڵنادان هەیە، شوێنی مەنجەنیقی ئیبراهیم هەیە، وە گردی نەرمرودیشی لێیە.

دیسان ( ابن الأثير) باس دەکات: لە مێژووی فارسی وا باسکراوە ( فەرەیدون) هەمان ( زوڵقەرنەین)ە لە سەر ئایینی ئیبراهیم بووە و هاوڕێی ئەو بووە. ( الكامل في التأريخ/ج١/ل: ٦٤).

هەروەها لە شاهنامەدا بەناوی (مورداس) هاتووە، کەسێک بووە خوێنرێژ و زاڵم بووە، تەنانەت دەڵێن کە یەکەم فیرعەون بووە لە ئێرانەوە پەڕیوەتەوە بۆ ناوچەکانی یەمەن و لەوێ نیشتەجێ بووە، زۆربەی سەرزەوی خستۆتە ژێردەستی خۆی، لە طەبەریدا هاتووە کە شاری بابل ئەو دروستی کردووە، یان زۆرێکی تر لە شارەکانی تر هەر لەسەر دەستی ئەو دروست بووە.

وەکو (دیمەشق و شاری صور) لە پەڕینەوەیدا بۆ وڵاتی یەمەن خراپەکاری زۆری ئەنجام داوە.

هەرچەندە خورافاتی زۆری بەدەمەوە هەڵبەستراوە، بەڵام پێدەچێت کە خاوەنی دوو ماری گەورە بووبێت کە خۆی پەروەردەی کردبن و مۆخی سەری مرۆڤی دەرخوارد دابن وەکو پاسەوان بەکاری هێنابێتن، هاوشێوەی سەگی پاسەوان کە لەکاتی خەودا و لەکاتەکانی تردا خۆی مارەکانی ڕازی نەکردایە کەس نەیدەوێرا نزیک بێتەوە لێی، هەر ئەم هۆکارەیە نازناوی ئەژدیهای پێ لێنراوە، خۆی بە خوا زانیوە و بێئایینی و خوانەناسی بڵاوکردۆتەوە.

لەبەر ئەوەی زوحاک لەبنەماڵەو نەوەی هوشەنگ بووە، لای پارسییەکانیش لە کۆندا وابووە، نابێت پادشا بکوژرێت بەدەستی ڕەعیەت و خەڵکی ئاسایی، بەڵکو پادشا دەبێت بەدەستی پادشا بکوژرێت، بۆیە یەکێک لە کوڕە پادشاکانی سەردەم بەناوی (فەرەیدوون) لە نەوەی جەمشیدی پادشای پارسیا بووە، لەدوای زوڵم و زۆری زوحاک کەسێک بەناوی (کابی) یاخود (کاوە) کە لەمێژووە عەرەبییەکاندا بە (کابی) هاتووە و لە مێژووی فارس دا بە (کاوە) هاتووە و خەڵکی ناوچەی ئەصفەهان بووە دژی زوحاک وەستاوەتەوە و پشتگیری فەرەیدونی پادشای کردووە لە وڵاتی پارسیادا و لەدوای کوشتنی زوحاک فێستیڤاڵێک یاخود جەژنێکیان گرتووە بەناوی نەورۆز، لە مێژووە عەرەبیەکاندا بە (نیروز) هاتووە، یاخود دەڵێن زوحاک دەرکراوە و لەخاکی یەمەندا ماوەتەوە و قەڵەمڕەوی کەمبۆتەوە لەو وڵاتە لەناوچووە. نووسەر ئەم ڕایەی پێ پەسەندترە کە زوحاک لەخاکی یەمەن دا مابێتەوە و هەر لەوێش مردبێت، چونکە بەهۆکاری خراپەکاری زوحاک، خوای گەورە دوای نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ پێغەمبەرێک دەنێرێت بۆ ئەو ناوچەیە بۆ ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕی شێوێنراویان، هەروەها یەکێک لە دەورانی سەردەمی فیرعەونی گوایە لەنەوەکانی دەوڵەتی پارسیاوە بووە کە پێدەچێت ناوی (خەشیارشا) کە فیرعەونی پارسیایە لەنەوەی زوحاک بێت.

لەدوای زوحاک لەسەردەمی فەرەیدون کە پادشایەکی چاکەخواز و خواناس بووە، ئیبن ئەثیر لە مێژووەکەیدا باسی دەکات کە کوڕی ئەسفیان (اثفیان)[٦٩] بووە، لەناو خەڵکیدا دادپەروەری چەسپاندوە پادشایەکی دادپەروەر بووە.

لەسەردەمی فەرەیدون و دوای نووح عَلَيْهِ السَّلَام ئیتر شارستانییەت دەست پێدەکات، کە دەڵێین شارستانییەت واتا دروستبوونی کۆمەڵگەی گەورە لە شار و شارۆچکە و گوند، کە لەسەر سێ بنەما دادەمەزرێت ئەوانیش {بیروباوەڕ، پێشکەوتن و خوڕەوشت(مۆڕاڵ)} هەرچی شارستانییەت هەیە لە جیهاندا لەسەر بنەمای ئەم سێ چەمکە دامەزراوە کە یەکەم جێگای شارستانییەت لە وڵاتی عێراقی ئێستاوە دەرکەوتووە لە شاری بابل کە بنەڕەتی وشەکە (بابول ئیل)بووە، واتا دەرگای ماڵی خوا یاخود دەرگای خوا.

فەرەیدون لەشاری بابلەوە حوکمڕانی کردووە، دەڵێن یەکەم کەس بووە کە نازناوی (صۆفی) هەڵگرتووە و کاوەش سەرۆک سوپا بووە نازناوی دەروێش یاخود دەرڤیشی هەڵگرتووە، قسەیەک هەیە دەڵێن (نەمروود) یان (نیمروز) لە نەوەی فەرەیدونە، هەر فەرەیدونیشە کە دامەزرێنەری شارەکانی تر لە ڕێگای کوڕەکانییەوە لە یۆنان، میسر و شامدا، کوڕەکانی ناسراون بە (شەڕم) کوڕی گەورەی بووە، کوڕی ناوەنجی ناوی (توج) بووە، کوڕی بچووکی ناوی (ئیرەج) بووە، دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر هەر سێ کوڕەکەیدا دابەش کردووە ئەوانیش دوای مردنی باوکیان کەوتونەتە جەنگ و لەناوبردنی یەکتری لەسەر خاکی پارسیای کۆندا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٩] ناوی باوی فەرەیدون بووە پادشای پیشدادیەکان، لە شاهنامەدا بە ئابتین ناوی هاتووە بە واتای خاوەنی مانگای زۆر یاخود مانگای بەڵەک.

# مەملەکەتی پێنجەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ

پێش چوونە ناو باسی ژیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە پێویستە ئەوە بزانین کە مرۆڤایەتی لەسەر زەوی لە پەرەسەندندایە و ژیان لە چاخی سەرەتایی و بەرئاییەوە بەرەو دەستپێکی شارستانییەت هەنگاو دەنێت، لێرەدا باسی شارستانییەتی ناوچەی الأحقاف دەکەن، یاخود ناسراو بە (ئیرەم) یان (عاد)، هەموو ئەم ناوانە باسی جێگاو شاری ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە هاوکاتە لەگەڵ شارستانییەتی بابل و ئوور و شارستانییەتە سەرەتاییەکانی میزۆپۆتامیا، بەڵام ئیرەم بە ناوچە هەژمار کراوە، نەک شارستانییەت لە کاتێکدا زۆر بەهێز بوون لە بواری تەلارسازی، پێشکەوتوو بوون لەبواری بونیادناندا، لەهەمان کاتیشدا هەندێک شوێنەوارناسان بە شارستانییەت ناویان بردووە.

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم ناوچەیە ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەڵاتی پادشاکانی ئێران دا بووە، بەتایبەت زوحاک کە لە پێشتر ئاماژەمان پێداوە.

ئیبن خەلدوون دەڵێت: شارێک نەبووە بەناوی (ئیرەم)، بەڵکو ناونانی ئەم شارە لەلایەن ڕاڤەکارانی قورئان کە ئەزموونیان کەم بووە ئەم وتەیان داهێناوە و وشەی (ئیرەم) کە خوای گەورە ناوی بردووە لە قورئان دا مەبەستی خودی هۆزەکەیە نەک شار و وڵاتەکەیان.

ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هۆزی عادی یەکەم و عادی دووەم کە بە (ثەموود)[٧٠] ناسراوە، ئەم دوو هۆزە لە ناوچەی عەرەبستان دا ژیاون درێژکراوەی یەک بنەڕەتن هەموو ناوچەکەیان ئاوەدان کراوەتەوە، بەڵام لە شێوەی شار نا، بەڵکو لە شێوەی هۆز و لادێی بچووک بچووک دا، تا ئەمڕۆش شوێنەواری دیارە و ماوەتەوە، هەرچەندە ئاسەوارەکان بەربڵاون، بەڵام جۆر و بیناسازی و نەخشە و تەلارسازی هاوشێوەی یەکن، بەڵام زۆر بەربڵاون لە ناوچەکانی ئەحقاف-ەوە دەست پێ دەکات تا ناوچەکانی وڵاتی ئەردەنی ئەمڕۆ و بەشێکی سووریا و یەمەنیش دەگرێتەوە.

ئەم ناوچەیە و باسی پێغەمبەران لە کتێبە ئاسمانییەکانی تری وەکو تەورات نەهاتووە، هەرچەندە عەرەب یەهوود بەوە تاوانبار دەکات کە گوایە لە تەورات دا ناوی ئەو

---

[٧٠] لە بەشەکانی تردا بە تەواوی ئاماژەی پێ دەدەین.

پێغەمبەرانەیان لابردووە کە ئەمەش دوورە لە ڕاستییەوە لە تەوراتدا خوای گەورە باسی نەکردووە، چونکە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت زۆرن کە ناویان لە قورئان، تەورات، ئینجیل و کتێبەکانی تری وەکو صحوف و ناوەکانی تردا نەهاتووە. ئەمەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە هەندێک لە پێغەمبەران لە کتێبەکانی ڕابردوودا ناویان هاتووە، وەکو دانیال، حەزقیال، یوشەعی کوڕی نون و...هتد.

قورئان لەو ناوچەیەوە هاتووە چۆن زنجیرەی پێغەمبەرانی نەوەکانی یەعقوب بەیەکەوە گرێداوە تا ڕادەیەکی زۆر، لێرەش لە قورئان دا ناوی سێ پێغەمبەری عەرەبی هێناوە کە لە فەرموودەیەکی لاوازدا هاتووە، بەڵام واتا و تێگەیشتنی ڕاستە کە بەهۆکاری کەسێک فەرموودەکە لاوازکراوە، ئەویش کەسێکی وابووە شتی لێ وەرنەگیراوە (ئیبراهیم کوڕی هیشام کوڕی یەحیا)، ئیمامی زەهەبی دەفەرموێت (متروک)ە.

فەرموودەکە دەفەرموێت: ئەبو زەڕی غیفاری پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ : چەند پێغەمبەری کرد عەرەب هەبووە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چوار لەو پێغەمبەرانە عەرەب بوون کە بریتی بوون لە: (هوود، صالّح، شوعیب و خودی پێغەمبەری خوا، سەلامی خوای گەورە لەهەموو پێغەمبەران بێت) [٧١].

بۆ ئێمەی موسڵمان گرنگە باسی بکەین نەک لەبەر ئەوەی یەهوود بوو یان عەرەب بووە، یان کورد بووە بۆ ئێمەی موسڵمان گرنگە باسی ژیانی پێغەمبەران بکەین و بزانین و واقعی ژیانیان چۆن بووە لە چ سەردەمێک و شوێن و جێگایەکدا ژیاون، تا پەندو وانەی ژیانیان لێوە فێر ببین و مەشخەڵی ڕێگای تاریکمان بن تا ڕووناکی بکەنەوە بە ئەزموون و ڕووداوە موبارەکەکانی ژیانیان، لێرەدا کەباسی هۆز و نەتەوەیەک دەکەین لای ئێمە گرنگی تەنها بۆ باسە مێژووییەکان هەیە، کە زانیاری دەربارەیان بزانین و باشتر و چاکتر واقیعەکە بناسین.

---

[٧١] في صحيح ابن حبان عن ابى ذر في حديث طويل في ذكر الأنبياء و المرسلين قال فيه: (منهم) اربعة من العرب: هود، صالح، شعيب، و نبيک يا ابا ذر.

## هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ کێیە؟

هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکێکە لە پێغەمبەرە عەرەبەکان کە بۆ گەلی (عاد)[٧٢] نێردراوە، گەلی عادیش چەند بەشێکی لێ جیابۆتەوە، بڵاوبونەتەوە لە یەمەنەوە بەرەو ناوچەکانی عەرەبنشین و نەجد بەگشتی، کە ڕەچەڵەک و بنەڕەتیان عەرەبن.

عەرەبیش سێ جۆرن: عەرەبی لەناوچەی (بائدة) واتە نەماون و نەوەکانیان نەماوە.

عەرەبی ڕەسەن کە لە ناوچەکاندا بوونیان ماوە و ناسراون بە عەرەبی (عاربة).

کۆتا جۆریان بە عەرەب کراوەکانن وەکو نەوەکانی ئیسماعیل و خودی ئیسماعیل کە ڕەچەڵەکی بنەڕەتیان (قیبطی)یە، واتا خەڵکی میسرن.

ئەم سێ جۆرە عەرەبە کە بوونیان هەبووە، دوانیان ماوە و دانەیەکیان لەناوچوون کەوا لەم باسەی پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ باسی دەکەین، هۆزی عاد دوو بەشە بەشێکیان بە عادی یەکەم ناسراوە و عادی دووەم بە ثەموود ناسراوە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ۝٥٠ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبْقَىٰ۝٥١﴾ النجم

واتە: هەر خوای گەورە بوو کە عادی سەرەتای قەومی هوودی لەناوبرد کە ئیمانیان نەهێنا۝٥٠ قەومی ثەموودیشی لەناوبردو هیچ کەسێکی لێیان نەهێشتەوە۝٥١

لە مێژووەکاندا هاتووە هوود کوڕی شالغ-ی کوڕی سامی کوڕی نووح-ە یان دەڵێن: هوود خۆی ناوی عابری کوڕی شالغ-ی کوڕی ئەرفەخەشزی کوڕی سام-ی کوڕی نووح-ە یاخود دەڵێن: ناوی هوودی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ڕەباحی جارودی کوڕی عادی کوڕی عوصی کوڕی ئیرامی کوڕی سامی کوڕی نووح-ە.

هەموو مێژووەکانم پشکنی هیچ سەرچاوەیەکم دەست نەکەوت بۆ ڕاستی و دروستی ئەم ناو و باوانەی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە، هەموو مێژوونووسەکان لە ئەبو جەعفەری کوڕی

---

[٧٢] لە سەرەتاکانی (١٩٩٠) لە ڕۆژنامە جیهانییەکاندا بڵاوکرایەوە، کە شارێکی ئەفسانەیی عەرەبی دۆزراوەتەوە: (ئۆبار دوورگەی لماوی)، کە قورئان بەر لە (١٤) سەدە باسی کردووە.
شوێنەواری لاو ( نیکولاس کلاپ) ئەو شارەی دۆزییەوە، گوایە شوێنی گەلی عاد بووە.
( الأمم البائدة/ هارون یحیی/ل: ٨٣) سەیر بکە.

محەمەدی کوڕی جەریری طەبەرییان وەرگرتووە، لەناو مێژووی طەبەرییشدا هیچ سەرچاوەیەک باس نەکراوە!




کەواتە ڕاستی و دروستی جێگای گفتوگۆیە و هیچ بەڵگەی یەکلاکەرەوەمان لەبەردەستدا نییە، خوای پەروەردگار لە هەمووان زاناترە.

لەناوچەیەکی لماویدا ئەم گەلە ژیانیان بردۆتە سەر کە ناسراوە بە (الأحقاف) یاخود لەبەرزایی شاخەکانی نێوان وڵاتی یەمەنی ئێستا و سەڵتەنەتی عومان دا ژیاون کە ناوچەیەکی شاخاوی و لماوی بووە.

پێی وتراوە (ئەحقاف) لە دۆڵێکی فراوانی گەورەدا بوون بەناوی (مغيث) کە خاکەکەیان نزیک بووە یان ڕوانیویەتی بەسەر دەریای هیندی دا کە ئەو سەردەمە پێی وتراوە (الشحر)ە.

ئیرەم تەنها بە هۆزی عاد ناوترێت بەڵکو بە هەموو دانیشتوانی ئەو سەردەمە دەوترا کە بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ عاد واتا (ثەموود)یش دەگەڕێتەوە، بەو بەڵگەیەی ئیبن خەلدوون باسی کردووە لە مێژووەکەیدا و پێشتر ئاماژەمان پێدا.

ئەم هۆز و گەلە لە سەردەمی خۆیاندا هاوشێوەیان نەبووە لە توانا و دەست ڕەنگین و بەهێز و توانایان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ۝٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ۝٨﴾ الفجر

واتە: عامود و مێخی زۆریان هەبووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژمارەیان زۆر بووە، یاخود گەڕاون لە شوێنانداو مێخیان چەقاندووەو خێمەیان داکوتیوەو دواتر ڕۆیشتوون و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە، یاخود وتراوە: عامودی زۆر بەهێزیان هەبووە لەبەر ئەوەی خۆیان زۆر بەهێز بوون و پێکهاتەی لەشیان زۆر بەهێز بووە۝٧ کە خوای گەورە لە بەهێزیدا هاوشێوەی قەومی (عاد)ی دروست نەکردووە، واتە: زۆر زۆر بەهێز بوون و ئەیانوت کێ هەیە لە ئێمە بەهێزتر بێت و شانازییان ئەکرد بە بەهێزییانەوە، بەڵام کە ئیمانیان نەهێنا بەهێزییەکەیان سوودی پێ نەگەیاندن و خوای گەورە لەناوی بردن۝٨



توانا و هێزیان بێوێنە بووە و هاوشێوەیان نەبووە، بێگومان لە سەردەمی خۆیاندا. پێدەچێت گەلی عاد و ثەموود لەیەک کات و سەردەمدا ژیا بێتن، نەک دوای لەناوچوونی عاد و ثەموود هاتبێت. ئەم ڕایەش بەگوێرەی پاشماوە دێرینەکان کە هەردوو شوێنەوارەکان لەیەک دەچن

پێناچێت كاتی نێوانیان جیاواز بێت، خۆ ئەگەر جیاوازیش بێت بەچەند ساڵێكی كەم لێكدەدرێتەوە، دەستپێكی هۆزی عاد وتمان لەناوچەی (ئەحقاف)دا بووە بە بەڵگەی قورئان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ الأحقاف

واتە: ئەی محەمەد ﷺ تۆ باسی قەومی (عاد)یشیان بۆ بكە كە خوای گەورە هوود پێغەمبەر عليه السلام -ی بۆ ناردن كە لە خۆیان بوو یاخود لە نەسەبدا برایان بووە نەك لە دیندا برایان بێت، كاتێك كە ئاگاداری قەومەكەی كردەوە لە (ئەحقاف)، كە شاخی لم بووە كە شوێنی قەومی (عاد) بووە لە (حضرموت) كە پێی وتوون لە پێش ئێوەش پێغەمبەرانی تر هاتوون و ئاگاداری قەومی خۆیان كردووە لە پێش و لە دوای هوود پێغەمبەر عليه السلام هەموویان وتوویانە عیبادەتی هیچ كەسێك مەكەن تەنها زاتی پیرۆزی (اللّٰه) نەبێت، چوونكە تەنها ئەو شایانی پەرستنەو پەرستراوی جەقە بەڕاستی، ئەگەر عیبادەتی جگە لە خوای گەورە بكەن من لە سزای ڕۆژێكی زۆر گەورە لێتان دەترسێم كە خوای گەورە سزاتان دەدات كە ڕۆژی قیامەتە.

لە ناوچەكانی (حضرموت) دا بووە بە واتای شاخی لماوی دێت، لەسەر بنەمای ئەوەی كە ئیبن خەلدوون دەڵێت: شارێک نەبووە ناوی ئیرەم بێت، خوای گەورەش بە شار ناوی نەبردووە، بەڵكو ئێمەش دەچینە سەر ڕاكەی ئیبن خەلدوون كە ئیرەم شار نەبووە، بەڵكو شارستانییەتی نێوان عاد و ثەموود بووە كە خوای پەروەردگار هوود عليه السلام -ی ناردووە بۆ هۆزی عاد، پێغەمبەر صالح-یشی ناردووە بۆ هۆزی ثەموود و بەهەردووكیان وتراوە (ئیرەم).

دەگەڕێینەوە ناوجەرگەی هۆزی عاد كە خاوەنی سێ بتی خوایی بوون بەناوی (صداء، صمود و هباء) لە مێژووی تەبەریدا هاتووە، بەڵام لە مێژووی ئیبن كەثیردا بە (صمدا، صمودا و هرا) ئەم ناوانەش پێدەچێت هەر هەمان خوا دروست كراوەكانی سەردەمی نووح بێت لە سواع و ود و یەغوث...هتد كە كران بە عەشتار و مەردوخ لە یۆنان بوون بە ژووپیتەر و لە ڕۆم ڤینۆس و...هتد.

خوای گەورە هەمیشە بۆ ناسینی زاتی بەرزی و پەكتاپەرستی و گەڕانەوە بۆلای، پێغەمبەران دەنێرێت، بانگەوازی حەزرەتی هوود عليه السلام بۆ ناسینی خوا بۆ یەكتاپەرستی و گەڕانەوە بۆلای و خۆپارێزی لەتاوان و خراپەكاری.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ الأعراف

واتە: بۆ لای قەومی عاد کە هۆزێك بوون لە (ئەحقاف) لە (حضرموت) لە یەمەن ئەژیان خوای گەورە هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ -ی بۆ ناردن کە لە خۆیان بوو هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار مەدەن لەبەر ئەوەی جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێت بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن بەوەی کە ئیمان بێنن.

ئەمەش دەستپێکی کاری هەموو پێغەمبەرانە، بۆیە خوای گەورە باسی ژیانی هەموو پێغەمبەرانی نەکردووە، چونکە کاری پێغەمبەران هەمووی لەیەک دەچێت، ئەگەر نموونەی پیشەوەران بهێنینەوە لەهەر پیشەیەکدا بۆ ئەنجامدانی پیشەکەیان هەمووپێداویستی و کەرەستەکانیان هەمان شتە، بەڵام دەشێت دوکان و کار و جێگایان جیاواز بێت.

پاش ناساندنی خوای موتەعال ئاگاداریان دەکاتەوە و هۆشداری سزاو پاداشتیان پێ ئەدات و گەڕانەوە بۆ ڕۆژی قیامەت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴿٢١﴾﴾ الأحقاف

واتە: ئەی محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تۆ باسی قەومی (عاد)یشیان بۆ بکە کە خوای گەورە هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ ی بۆ ناردن کە لە خۆیان بوو یاخود لە نەسەب دا برایان بووە نەك لە دیندا برایان بێت، کاتێك کە ئاگاداری قەومەکەی کردەوە لە (ئەحقاف)، کە شاخی لم بووە کە شوێنی قەومی (عاد) بووە لە (حضرموت) کە پێی وتوون لە پێش ئێوەش پێغەمبەرانی تر هاتوونەو ئاگاداری قەومی خۆیان کردووە لە پێش و لە دوای هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ هەموویان وتوویانە عیبادەتی هیچ کەسێك مەکەن تەنها زاتی پیرۆزی (اللّه) نەبێت، چوونکە تەنها ئەو شایانی پەرستنەو پەرستراوی حەقە بەڕاستی ئەگەر عیبادەتی جگە لە خوای گەورە بکەن من لە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە لێتان دەترسێم کە خوای گەورە سزاتان دەدات کە ڕۆژی قیامەتە.

کاری هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕاستکردنەوەی چەمکە پەرستشیەکان بوو کە بەهەڵە و درۆ و هەڵبەستراوی شوێنی کەوتبوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ﴿٥٠﴾﴾ هود

واتە: هەر خوای گەورە بوو کە عادی سەرەتای قەومی هوودی لەناوبرد کە ئیمانیان نەهێنا.

هەرچەندە بانگەوازی پێغەمبەران زۆر واقعی و گونجاوە لەگەڵ بیروهۆش و سرووشتی مرۆڤەکان دا، بەڵام بەرژەوەندی خوازەکان و ئەوانەی کە شوێن هەواو ئارەزوو و نەفسی خۆیان کەوتوون، ئەگەر خەڵکی واقعی بوو خاوەن بیروباوەڕی پاک و جوان و باش بوو، ئەوان سوودمەند نابن، چونکە ئایینی خوا و پێغەمبەر کەرامەتی خەڵکی و ئەقڵی خەڵکی بە هەردوو ڕەگەزەکەیەوە دەپارێزێت، کە کۆمەڵگەش خاوەنی هۆشیاری و بیری پاک و جوان بوو ئەوا بەرژەوەندخواز و قۆرخچییەکان ناتوانن کاری خۆیان ئەنجام بدەن، هەمیشە کە ئەنجامی بە (کەر) کردنی خەڵکی دەسەڵاتدار سوود دەبینن.

ئایینی خوایی مرۆڤ لە ئاژەڵ بوون دەپارێزێت، هەر بە ناسینی یەکتاپەرستی مێشك و دڵ فراوان و چاو کراوە دەبێت، ئیتر زۆر ئاسایی دەبێت کە بەرژەوەندیخوازان و خاوەن کۆمپانیا گەورەکان دژی پێغەمبەران بن و دژی خوا دەبن، چونکە بەرژەوەندەییەکانی ئەوان دەخاتە مەترسییەوە و کۆمپانیاکانیان توانای پەیدا کردنی سوودی زۆری نامێنێت و خەڵکیان بۆ بەئاژەڵ ناکرێت.

جا ئەم جۆرە کەسانە لە شێوەی سەرمایەداری دەردەکەون، یان جیهانگیری یاخود وەکو بتی سیستەمەکانی ڕۆژئاوا و لاسایی کردنەوەیان لە وڵاتی موسڵمانانذا وەکو عەلمانیەت.

گەلی عادیش هەر لەو جۆرە پێوانانەی ئەمڕۆن، بۆیە خێرا کەوتنە دروستکردنی پڕوپاگەندە (سکانداڵ) و وتەی ناشرین بۆ پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ، خوای گەور دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف

واتە: دەسەڵاتدارو سەرکردەو ناودارەکانی قەومەکەی لە کافران پێیان وت ئەی هوود ئێمە وا ئەبینین کە تۆ کەسێکی گومڕاو گێل و کەم عەقڵی ئێمە گومانی ئەوەت پێ ئەبەین کە تۆ یەکێك بیت لە درۆزنان و درۆ بکەیت و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکەیت و پێغەمبەری خوا نەبی﴿٦٦﴾ هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم من گێل و کەم عەقڵ نیم، بەڵکو پەیامبەرو پێغەمبەری خوای گەورەم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە بۆ لای ئێوە نێردراوم﴿٦٧﴾ پەیامی خوای گەورەتان پێ ئەگەیەنم، من ئامۆژگاریکاری ئێوەم بەدڵسۆزی و ئەمینم بەوەی کە ناپاکی ناکەم لەو پەیامەی خوای گەورە﴿٦٨﴾

هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بەردەوام بوو لە ئامۆژگاری و بانگەوازەکەی و هەوڵی ئەدا تێیان بگەیەنێت لەدوای گەلی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئیتر ئێوە خەلیفەن لەسەر زەوی و پێغەمبەرتان لەناودایە و خوای گەورە هێز و توانا و ئەقڵی پێ بەخشیون، بۆیە لەم نیعمەتە جوانەی خوای گەورە سەر با ئەدەن و خۆتانی پێ ڕزگار و سەربەرز ناکەن لە دنیا و قیامەت دا؟

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾﴾ الأعراف

واتە: ئایا پێتان سەیرە یان بەدووری ئەزانن کە وەحی لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابەزێ بۆ سەر کەسێك لە خۆتان کە من لە خۆتانم و ئەمناسم بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکاتەوە یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە کە خوای گەورە ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەویدا لە دوای قەومی نووح کە ئەوانی لەناوبرد چوونکە سەرپێچیان کردو ئیمانیان پێ نەهێنا، ئێوەی هێنا لەناو خەڵکیشدا ئێوەی زیاتر بەهێز کردووە کە باڵاتان درێژو بەرزە و لاشەتان زۆر گەورەیە، ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە لەسەرتان بەڵکو سەرفراز بن بەهۆی بیر کردنەوە لەو نیعمەتانە بتانگەیەنێ بە ئیمان هێنان بە خوای گەورە.

پاشان هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بیری خستنەوە کە خوای گەورە چ توانا و هێزی پێبەخشیوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِىٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾﴾ الشعراء

واتە: ئایا ئێوە لە هەموو شوێنێکی بەرزو سەر ڕێگاو لە شاخە بەرزەکاندا کۆشك و تەلاری بەرزو پتەو گەورەو سەرەنجڕاکێش دروست ئەکەن لە کاتێکدا پێویستتان پێ نییەو تەنها بۆ فەخرو شانازی و دەرخستنی تواناتانەو تەنها کات بەسەر بردن و خۆماندوو کردن و بەفیڕۆدانی تواناتانە﴿١٢٨﴾ کۆشك و تەلاری بەرزو قەڵاو شورای پتەو دروست دەکەن وەکو ئەوەی کە ئێوە نەمرن و بەهەمیشەیی بمێننەوە﴿١٢٩﴾ کاتێك کە بتانەوێ بەسەر کەسێکدا زاڵ بن زۆر بە توندوتیژی زاڵ ئەبن بەسەریدا لە ناحەقی و ستەمدا﴿١٣٠﴾ دەی ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن و لە خوا بترسێن و گوێڕایەڵی من بکەن﴿١٣١﴾ تەقوای ئەو خوایە بکەن کە یارمەتی داون بەو هەموو شتەی

کە خۆتان ئەزانن لە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان﴿١٣٢﴾ یارمەتی داون و پشتیوانی کردوون بە جۆرەها ئاژەڵ و بە منداڵ﴿١٣٣﴾ باخ و باخات و سەرچاوەی ئاو و کانی و ڕووبارو بیرەکان﴿١٣٤﴾ ئەگەر ئیمان نەهێنن و بەردەوام بن لەسەر کوفرتان ئەوە من لەوە ئەترسێم کە خوای گەورە سزاتان بدات لە ڕۆژێکی زۆر گەورەدا کە ڕۆژی قیامەتە﴿١٣٥﴾

پاشان کەوتنە گفتوگۆ و دەمەدەمێ لەگەڵ حەزرەتی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دا کاتێک پێغەمبەران بانگەوازیان دەست پێ دەکەن بەرانبەریشیان بەدوای بەڵگەو دەلیلی خۆیدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی دژی بەکاری بهێنێننەوە، خوای گەورە ئەو دیمەنانەمان بۆ دەگوازێتەوە لە قورئان دا و دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَيَسۡتَخۡلِفُ رَبِّي قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ﴿٥٧﴾﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی هوود بەڕاستی تۆ هیچ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرات بۆ ئێمە نەهێناوە لەسەر ئەوەی کە تۆ پێغەمبەری خوایت، لەبەر قسەی تۆ ئێمە واز لە خوایەکانی خۆمان ناهێنین ئێمە ئیمان بە تۆ ناهێنین﴿٥٣﴾ ئێمە ئەڵێین هەندێك لە خوایەکانی ئێمە کە تۆ قسەیان پێ ئەڵێی ئەوان دەستیان لێ وەشاندوویت و شێتیان کردوویت. هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: من خوای گەورە ئەکەم بە شایەت و ئێوەش شایەت بن کە من بەریم لە هەموو ئەو خوایانەی کە ئێوە کردوتانە بە شەریك بۆ خوای گەورەو لە غەیری خوای گەورە ئەیانپەرستن﴿٥٤﴾ جگە لە خوای گەورە، خۆتان و خوایەکانتان چیتان بۆ ئەکرێ بۆ ئەوەی زەرەرو زیان لە من بدەن بیکەن و پاشانیش هیچ مۆڵەتم پێ مەدەن و پەلە بکەن لەوەی کە چ زەرەرو زیانێکم پێ ئەگەیەنن بیگەیەنن﴿٥٥﴾ من تەنها پشتم بە خوای گەورە بەستووە، الله کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە هەر ئەوە من ئەپارێزێ لە نەخشەو پیلان و زەرەرو زیانی ئێوە، هیچ ئاژەڵ و گیانلەبەرێك نییە لەسەر ڕووی زەوی ئیلا خوای گەورە پێشەسەری گرتووە، واتە لە ژێر دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگای ڕاست و دادپەروەرییەو ئێوەی کافر زاڵ ناکات بەسەر منی باوەڕداردا﴿٥٦﴾ ئەگەر پشتیان هەڵکرد لەوەی کە ئیمانت پێ بێنن ئەوا پێیان بڵێ: ئەوەی کە خوای گەورە منی لە پێناویدا بۆ لای ئێوە ناردووە ئەوە من بە ئێوەم ڕاگەیاندو بەڵگەم بەسەرتاندا جێگیر کرد ئەگەر ئیمان نەهێنن خوای گەورە ئێوە لەناو ئەبات و کەسانێکی تر لە جێی ئێوە

جێنشین دەکات و ئەبن بەجێگرەوەی ئێوە کە بە تاك و تەنها خوا دەپەرستن و شەریکی بۆ دانانێن، ناتوانن هیچ زیانێك بەخوای گەورە بگەیەنن بەڕاستی پەروەردگارم هەموو وتەو کردەوەی ئێوە ئەپارێزێ و چاودێرو بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکداو سزاتان دەداتەوە لەسەری﴿٥٧﴾

پاشان دووبارەبوونەوەی مێژوو کە هەمان قەوانە لەسەردەمی کۆن و چاخی بەرئاییەنەوە ئەم وتەیە بەردەوامە، ئەتەوێت واز لەئایینی باووباپیرانمان بهێنین و شوێنی بکەوین، وەکو ئەوەی باووباپیران خاوەنی توانا و ژیر و ئەقڵ بن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ﴿٧١﴾﴾ الأعراف

واتە: وتیان: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتووی کە ئێمە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستین، داوای ئەوەمان لێ ئەکەی واز بێنین لەو خوایانەی کە باوك و باپیرانمان پەرستوویانە، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی ئەو هەڕەشانەی کە لێمانی ئەکەی بیهێنە، واتە: ئەگەر ئیمان نەهێنین خوای گەورە سزامان ئەدات، با سزای خوای گەورە بێت، پەلەیان کرد لە هاتنی سزای خوای گەورە﴿٧٠﴾ فەرمووی: دەی دڵنیابن لە لایەن پەروەردگارەوە سزاو تووڕەبوونتان بۆ دائەبەزێنێ و غەزەبتان لێ ئەگرێ، ئایا ئێوە مشتومڕو دەمەقاڵێ لەگەڵ مندا ئەکەن دەربارەی چەند ناوێك لەو خوایانەی کە خۆتان و باوك و باپیرانتان ناوتان لێ ناون کە خوای گەورە هیچ بەڵگەی لەسەر ئەو خوایانەی ئێوە نەناردۆتە خوارەوە دەی چاوەڕێی سزا بن منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕێ ئەکەم، بزانن خوای گەورە چۆن سزاتان ئەدات، کە ئەمە هەڕەشەیەکی سەختە﴿٧١﴾

پاشان پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بانگی کردن بۆ تەوبە و گەڕانەوە تا خوای گەورە ڕەحمیان پێبکات و ڕزقیان زیاد بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ﴿٥٢﴾﴾ هود

واتە: ئەی قەومی خۆم داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لە تاوانەکانی پێشوتان، پاشان تەوبە بکەن و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوەو لە داهاتوو خۆتان بپارێزن لە تاوان، خوای گەورە

بارانتان بۆ ئەبارێنێ بە لێزمە یەك لە دوای یەك سەرەڕای هێزو توانای خۆتان خوای گەورە زیاتر بەهێزو بەعیززەتتان دەكات بەهۆی تەوبەو داوای لێخۆشبوونەوە پشت هەڵمەكەن و خراپەكاری مەكەن لەسەر ڕووی زەوی.

كە بەردەوام دەبن لە سەركەشی و خراپەكاری، خوای پەروەردگار پێغەمبەرو باوەڕداران لە خوانەناسان جیادەكاتەوە و پاشان سزا و ئازاری خراپەكاران دەست پێ دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هودا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٥٨﴾﴾ هود

واتە: كاتێك كە فەرمان و سزای ئێمە هات هوودو ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون هەموومان بەڕەحمەتی خۆمان ڕزگار كرد، ئەوانمان پاراست لە سزایەكی زۆر ئەستوور كە ئەو بایە بوو كە خۆیان و ماڵیانی هەمووی وێران كرد و كەسیان نەما.

ئینجا دەستپێكی لەناوچوونی هۆزی عاد خوای گەورە بۆمان باس دەكات دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾﴾ الحاقة

واتە: قەومی عادیش كە هوود پێغەمبەر عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ ی بۆ ناردن خوای گەورە لەناوی بردن بە بایەك كە لەوپەڕی ساردیدا بوو ساردییەكی زۆر سەخت و هەڵكردنەكەیشی هەر زۆر سەخت بوو كاتەكەیشی زۆر درێژ بوو.﴿٦﴾ خوای گەورە ئەو بایەی ناردە سەریان ماوەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام یەك لە دوای یەك ئەو بایە هیچ كات هێمن و ئارام نەدەبووەوە، ئەو قەومە كە ئەو بایەیان بەسەردا هات ئەبینی هەر هەموویان مردوونەو لە زەوییەكە كەوتوونە وەكو قەدی دارخورمایەكیان لێهات كە لە زەویدا كەوتبێت و ڕزا بێت، بایەكە لێیدەدان و دەیدان بە زەویداو دەیكوشتن.﴿٧﴾

هەروەها زیاتر لە ئایەتی (٤١و٤٢) لە سورەتی (الذاريات) دا بۆمان ڕوون دەكاتەوە دەفەرموێت: ﴿وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾﴾ الذاريات

واتە: قەومی (عاد)یش بەهەمان شێوە لەوانیش بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە کاتێك کە بایەکی نەزۆکمان نارده سەریان کە هیچ خێرێکی تیادا نەبووە، بایەك نەبووە کە باران هەڵگرێ، بەڵکو بۆ سزادان بووە﴿٤١﴾ بەسەر هیچ شتێکدا تێ نەئەپەڕی ئیلا لەناوی ئەبردو تێکی ئەشکاندو وەکو شتێکی ڕزیوی لێ ئەکرد﴿٤٢﴾

## کۆی گشتی لەباسی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دا

ئەوەی لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە، هەموو لە نێوانی سێ وڵاتی ئێستادا ڕووی داوە کە سعودیە و یەمەن و وڵاتی عومانە، لەناوچەیەک ناسراوە بە (الربع الخالي) و لە قورئاندا بە (الأحقاف) هاتووە.

ئەم ناوچەیە لە سەردەمی هۆزی عاد دا پڕ باخ و باخات و سەوزایی بووە، سەرچاوەی ئاوی سازگار و چەم و کانی بووە، بەڵام هۆکاری تاوان و سەرکەشی ئەو هۆزە خوای پەروەردگار بە باو خۆڵ ئەو ناوچەیە گۆڕانکاری ژینگەی بەسەردا هاتووە، بوو بە ناوچەیەکی بیابانی و وشک و بێ ئاو کە دەست نادات بۆ ژیان. لە کاتێکدا هۆزی عاد لەدوای کۆمەڵگەی حەزرەتی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ گەورەترین هۆز و کۆمەڵگە بوون، لە سەرچاوە مێژوویەکاندا هاتووە. هۆزی عاد لە وشەی (العود) هاتووە بە واتای لە دوای نغرۆ بوونی هۆزی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەمان زۆرترین کەس و کۆمەڵگە بوون، ئەمەش بەواتای گەڕانەوە دێت، عاد واتا گەڕانەوەی کۆمەڵگەی بەشەری دوای نووح و لافاوەکەی.

هەروەها پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکەم پێغەمبەری عەرەب بوو، کە بۆ عەرەب هاتووە لەو ناوچەیە، هۆکاری هاتنی پێغەمبەرانێک لەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ خراپی خەڵکەکەی و دەست تێکەڵ کردنیان لەگەڵ تاوان و خراپەکاری و کاری ناپەسەند، لەڕێگای خوای پەروەردگار دەرچوون، بۆ ڕێگای شەیتان ملی ڕێگایان گرتووە، هەمیشە کاری پێغەمبەران ئەوە بووە کە خۆپارێزی بکەن و شەیتان بە دوژمنی خۆیان بزانن. لەدوای ڕزگار بوونی بەشێک لە ئیمانداران و گەڕانیان بەسەر زەویدا بۆ بانگەوازی خوایی، هەرچەندە خەڵکی باش و چاک هەبن گومان لەوەدا نییە شەیتان لایەنگر و تەرەفدار بۆ خۆی پەیدا دەکات لە ڕێگای خۆشی ژیان و شەهوەت و هەواو ئارەزو و نەفسەوە.

چەند ڕەوەند و جیلێک لەدوای لافاوەکەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بەباشی ژیان لە ناوچەکەدا، بەڵام پاشان گەڕانەوە بۆ بت پەرستی و خراپەکاری، خوای پەروەردگاریش هەرگیز زوڵم ناکات، بۆیە پێغەمبەر دەنێرێت تا پەیامی خوای گەورەیان پێ ڕابگەیەنێت. لەبەرانبەریدا شەیتانیش پەیامی

واتە: قەومی (عاد)یش بەهەمان شێوە لەوانیش بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە کاتێك کە بایەکی نەزۆکمان نارده سەریان کە هیچ خێرێکی تیادا نەبووە، بایەك نەبووە کە باران هەڵگرێ، بەڵکو بۆ سزادان بووە﴿٤١﴾ بەسەر هیچ شتێکدا تێ نەئەپەڕی ئیلا لەناوی ئەبردو تێکی ئەشکاندو وەکو شتێکی ڕزیوی لێ ئەکرد﴿٤٢﴾

## کۆی گشتی لەباسی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دا

ئەوەی لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە، هەموو لە نێوانی سێ وڵاتی ئێستادا ڕووی داوە کە سعودیە و یەمەن و وڵاتی عومانە، لەناوچەیەک ناسراوە بە (الربع الخالي) و لە قورئاندا بە (الأحقاف) هاتووە.

ئەم ناوچەیە لە سەردەمی هۆزی عاد دا پڕ باخ و باخات و سەوزایی بووە، سەرچاوەی ئاوی سازگار و چەم و کانی بووە، بەڵام هۆکاری تاوان و سەرکەشی ئەو هۆزە خوای پەروەردگار بە باو خۆڵ ئەو ناوچەیە گۆڕانکاری ژینگەی بەسەردا هاتووە، بوو بە ناوچەیەکی بیابانی و وشک و بێ ئاو کە دەست نادات بۆ ژیان. لە کاتێکدا هۆزی عاد لەدوای کۆمەڵگەی حەزرەتی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ گەورەترین هۆز و کۆمەڵگە بوون، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە. هۆزی عاد لە وشەی (العود) هاتووە بە واتای لە دوای نغرۆ بوونی هۆزی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەمان زۆرترین کەس و کۆمەڵگە بوون، ئەمەش بەواتای گەڕانەوە دێت، عاد واتا گەڕانەوەی کۆمەڵگەی بەشەری دوای نووح و لافاوەکەی.

هەروەها پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکەم پێغەمبەری عەرەب بوو، کە بۆ عەرەب هاتووە لەو ناوچەیە، هۆکاری هاتنی پێغەمبەرانێک لەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ خراپی خەڵکەکەی و دەست تێکەڵ کردنیان لەگەڵ تاوان و خراپەکاری و کاری ناپەسەند، لەڕێگای خوای پەروەردگار دەرچوون، بۆ ڕێگای شەیتان ملی ڕێگایان گرتووە، هەمیشە کاری پێغەمبەران ئەوە بووە کە خۆپارێزی بکەن و شەیتان بە دوژمنی خۆیان بزانن. لەدوای ڕزگار بوونی بەشێک لە ئیمانداران و گەڕانیان بەسەر زەویدا بۆ بانگەوازی خوایی، هەرچەندە خەڵکی باش و چاک هەبن گومان لەوەدا نییە شەیتان لایەنگر و تەرەفدار بۆ خۆی پەیدا دەکات لە ڕێگای خۆشی ژیان و شەهوەت و هەواو ئارەزو و نەفسەوە.

چەند ڕەوەند و جیلێک لەدوای لافاوەکەی نووح عَلَيْهِ السَّلَامُ بەباشی ژیان لە ناوچەکەدا، بەڵام پاشان گەڕانەوە بۆ بت پەرستی و خراپەکاری، خوای پەروەردگاریش هەرگیز زوڵم ناکات، بۆیە پێغەمبەر دەنێرێت تا پەیامی خوای گەورەیان پێ ڕابگەیەنێت. لەبەرانبەریدا شەیتانیش پەیامی

بە شوێنکەوتووەکانی بڵاودەکاتەوە بە چەند ڕێگایەک، یان دەتوانێت لە چەند وێستگەیەکدا شی بکەینەوە.

وێستگەی یەکەم: کافر بوون و بانگەواز بۆ کافربوونەکەت و لەگەڵیدا خراپەکار بیت، دەشێت مرۆڤ کافر بێت، بەڵام شەیتان واز ناهێنێت بەکافر بوون. لەگەڵیشیدا فەرمانت پێ دەکات بە خراپەکاری و کاری نادروست.

وێستگەی دووەم: ئەگەر لە وێستگەی یەکەمدا فریات نەکەوت، ئەو لەم وێستگەیەدا ئەجندای تایبەتی هەیە، دەڵێت خوا بپەرستە بەڵام هاوبەشی بۆ بڕیار بدە، گرنگە لای شەیتان لە مەقامی خوای پەروەردگار کەم بکرێتەوە، ناڵێت دینداری واتا ژیانمانە بەڵکو دەڵێت شێخ فڵان و سەرکردە و دانشمەند و فەیلەسوفەکان خوان، لە ژێر ناوی بریقەدار و پێشکەوتندایە حیزبایەتی، عەلمانیەت و یاری قومار و ئەفکاری جۆراوجۆر و هەموو جۆرە بتێکی نوێ و مۆدێرنە بە بەرگی جاهیلی، جا لە شێوەی بیروباوەڕدا یان فەلسەفە و پەیکەر و لە پێش دانانی هەر شتێک لەگەڵ ئایینی خوای گەورەدا، گرنگە لای شەیتان کە ئیمتیازی زیاتر بدرێت بە حەز و ئارەزوو و پەرستنی هەوا و نەفس، پێش پەرستنی خوای پەروەردگار.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾﴾ البقرة

واتە: لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن جگە لە خوای گەورە ئەکەنە شەریك و هاوشێوە بۆ خوای گەورە، ئەو شەریکانەیان خۆش ئەوێ وەکو خۆشەویستی خوا، چەندێك خوای گەورەیان خۆش ئەوێ ئەوانیشیان بەئەندازەی خوای گەورە خۆش ئەوێ، یاخود بتەکانیان خۆش ئەوێ بەئەندازەی ئەوەی کە ئیمانداران خوایان خۆش ئەوێ، بەڵام باوەڕداران خوای گەورەیان لەوان خۆشتر ئەوێ، یان ئیمانداران خوای گەورەیان زیاتر خۆش ئەوێ لە خۆشەویستی ئەوان بۆ بتەکانیان، ئەو دوو تەفسیرەی هەیە، ئای لەو ستەمکارانە کە کەسانێکیان کردووە بە شەریك و وەکو خوای گەورە خۆشیانیان ئەوێ، کاتێك کە لە ڕۆژی قیامەت سزای خوای گەورە ئەبینن ئەوکاتە ئەزانن کە هێز و توانا تەنها بۆ خوای گەورەیەو خوایەکانی ئەوان بێ دەسەڵاتن و ناتوانن سزای خوای گەورەیان لەسەر لابدەن، سزای خوای گەورە یەکجار سەختە.

هەروەها پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: { تَعِس عبدُ الدرهمِ}/صحیح البخاري هەندێکی ناو نراون بە بەندەی پارە.

وێستگەی سێیەم: ئەگەر لە دوو وێستگەدا لەگەڵ توانای وەستاندنی نەبوو، دەڕوات بۆ وێستگەی تاوانە گەورەکان، جا زینا بێت یاخود ڕیبا یان مەی خواردنەوە...هتد.

هەموو ئەو وێستگانە پێویستیان بە گەڕانەوەیە بۆلای پەروەردگار و تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوەیە.

وێستگەی چوارەم: ئەگەر شکست خواردو و بوو لە کافر بوون و هاوبەش دانان و تاوانە گەورەکان ئەوا هەوڵی تاوانی بچووکت پێ دەدات و لەسەرت کۆ دەبێتەوە وەکو شاخ و خاوەنەکەی لەناو دەبات، تاوانە بچووکەکانت لەبەرچاو کەم دەکاتەوە، جا بە تەماشا و نەزەر کردن بێت، یان فێرت دەکات خۆتت لەهەموو کەس پێ باشتر بێت، پێت دەڵێت تۆ باشتریت لە فڵانە کەس، ئەو تاوانی گەورە دەکات تۆ تاوانێکی بچووک دەکەیت و بە تۆبە پاک دەبیتەوە، لە کۆتاییدا ئەوەندە تاوانت پێ دەکات مرۆڤ شەرمن و تەمبەڵیش دەکات لە تۆبە کردن.

ویستگەی پێنجەم: لەم وێستگەیەدا پێت دەڵێت باشە ئەگەر تاوان ناکەیت تۆ کەسێکی پاکیت، پێویست ناکات بەندایەتی بکەیت، تۆ کەسێکی پاک و خاوەن دڵێکی سافی، پێویستت بە بەندایەتی نییە، خۆت سەرقاڵ بکە بە یاری و گاڵتە و گەپ و تۆڕی کۆمەڵایەتی و یاری تۆپی پێت لە کیس نەچێت. کەسێکی کۆمەڵایەتی بە، بەڵام خۆت پیاوخراپ مەکە و باسی دین و ئەو شتانە مەکە، کاری تۆ نییە و تۆ کەسێکی سەربەخۆیت با جێگا و شوێنت لەناو کۆمەڵگەدا بەهێز بێت و بەچاوی بانگخواز و موسڵمانی ڕادیکاڵ تەماشا نەکرێیت، سەرقاڵی ژیانی خۆت بە، چونکە ژیان کەمە تا دەتوانی بەخۆشی بیبەرە سەر و مەچۆ مزگەوت و گوێ بۆ دەرس و وانەی ئایینی مەگرە، با بەچاوی تیرۆریست تەماشات نەکەن.

وێستگەی شەشەم: لەم جێگایەدا ئەگەر نەیتوانی زەفەرت پێ بەرێ، ئەوا سەرقاڵت دەکات بەشتی لاوەکییەوە. لەهەمووی بە کێشەتر ئەوەیە سەرسام بوون بە خۆتت بۆ دروست دەکات، ڕای جیاوازی تری مەزهەب و فیکری بەرانبەر قبوڵ ناکەیت و ڕێز لە موسڵمانان ناگریت و دەمارگیریت بۆ دروست دەکات، پێت دەڵێت: تەنها تۆ ڕاستی و بە قسەی کەس مەکە، مەنهەجی تۆ ڕاستە و ئەوانی تر هەمووی هەڵە و سەرلێشێواوییە. خاوەنەکەی سەرقاڵ دەکات بە دەمەقاڵە و دەمە دەمە و موناقەشەی بێ بەرهەم، زۆرجار سەردەکێشێت بۆ بواری کەسایەتی و تانە و تەشەر دروست کردن.

وێستگەی حەوتەم: وەسوەسە دروست کردن لەدڵ و دەروونندا، جا لە بواری بەندایەتییدا بێت یاخود بوارەکانی هاوڕێیەتی و دروست کردنی گومان لە براکانت و ناوزەدیان دەکات بە جاسوس و یاخود مونافیق یان بەچاوی سووک تەماشاکردنیان، ڕەخنەگرتن لە گەورە و بچووک،

پاشان تەداخول کردن و ڕۆچوون لە بواری دڵودەروونیدا تا وات لێدەکات کە لەسەر بنەمای ناخ و بیرکردنەوەی خۆت بڕیار بدەیت.

وێستگەی هەشتەم: ئەگەر ئەمانەی پێنەکرا لەگەڵتدا، ئینجا خەڵکی ترت لێ هان ئەدات، کە قسەت پێ بڵێن یان گاڵتەت پێ بکەن و ئیش و کارەکانت بەکەم بزانن، خەڵکی بەچاوی کەم تەماشات بکەن و لە ورد و درشتی ژیانت بکۆڵنەوە (کورد وتەنی کێچێکت لێ بکەن بە گایەک).

بەگشتی شەیتان لەم وێستەگەیاندا کار دەکات و لەگەڵ هەموو هۆز و گەل و کەسێکدا هەمان شێوە بەکار دەهێنێت، لەگەڵ هۆزی عاد-یش هەمان کاری ئەنجام داوە. شەیتان بۆ کاری خۆی تووشی تەمەڵی و دانیشتن هەرگیز نازانێت، هەمیشە لەکاردایە بۆ پڕۆژەکەی خۆی کە بردنی مرۆڤەکانە بەرەو دۆزەخ.

پەیوەندی نییە بە پێشکەوتن و هێزی گەلان، بەڵکو پەیوەندی شەیتان بە دڵ و دەروون و ئەقڵەوە هەیە، گەلی پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ گەلێکی زۆر بەهێز و بەتوانا بوون، خاوەنی زیرەکی و دەست ڕەنگینی بوون، هاوشێوەیان نەبووە لە سەردەمی خۆیاندا، بە دروستکردنی ستوونی گەورە و پایەی بەهێز ناویان دەرکردبوو.

خوای پەروەردگار پێناسەیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ۝٧ ٱلَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي ٱلْبِلَٰدِ ۝٨﴾ الفجر

واتە: ئەی محەمەد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئایا نابینی خوای گەورە چی لە قەومی (عاد) کرد کە خوای گەورە (هوود) پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ -ی بۆ ناردن۝٦ عامود و مێخی زۆریان هەبووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژمارەیان زۆر بووە، یاخود گەڕاون لە شوێنانداو مێخیان چەقاندووەو خێمەیان داکوتیوەو دواتر ڕۆیشتوون و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە، یاخود وتراوە: عامودی زۆر بەهێزیان هەبووە لەبەر ئەوەی خۆیان زۆر بەهێز بوونەو پێکهاتەی لەشیان زۆر بەهێز بووە۝٧ کە خوای گەورە لە بەهێزیدا هاوشێوەی قەومی (عاد)ی دروست نەکردووە، واتە: زۆر زۆر بەهێز بوونەو ئەیانوت کێ هەیە لە ئێمە بەهێزتر بێت و شانازییان ئەکرد بە بەهێزییانەوە، بەڵام کە ئیمانیان نەهێنا بەهێزییەکەیان سوودی پێ نەگەیاندن و خوای گەورە لەناوی بردن۝٨

بێجگە لەو بونیادی کۆمەڵگەیە کە ڕووەو شارستانییەت هەنگاوی دەنا خاوەنی لاشەی بەهێز و توانا و ئالەتی کارکردنی بەهێزبوون چ لە ڕووی لاشەییەوە تەندروست باشبوون و لە ڕووی

کەرەستەوە خاوەنی کەرەستەی باش و پێشکەوتووی ئەو سەردەمە بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾﴾ الأعراف

واتە: ئایا پێتان سەیرە یان بەدووری ئەزانن کە وەحی لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابەزێ بۆ سەر کەسێك لە خۆتان کە من لە خۆتانم و ئەمناسن بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکاتەوە ادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە کە خوای گەورە ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەویدا لە دوای قەومی نوح کە ئەوانی لەناوبرد چونکە سەرپێچیان کردو ئیمانیان پێ نەهێنا، وە ئێوەی هێنا لەناو خەڵکیشدا ئێوەی زیاتر بەهێز کردووە کە باڵاتان درێژو بەرزە و لاشەتان زۆر گەورەیە، ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە لەسەرتان بەڵکو سەرفراز بن بەهۆی بیر کردنەوە لەو نیعمەتانە بتانگەیەنێ بە ئیمان هێنان بە خوای گەورە.

لەگەڵ ئەوەی کە زۆر لە سنووری خۆیان باس دەکرێن و گوایە گەورە و بەهێز و لاشە و باڵایان بەرز بووە لە مرۆڤی ئاسایی نەچوون، ئەوانە هەمووو ڕاست نین، بەڵکو سەرچاوەکەی لە گەلێکەوە هاتووە کە ناویان گەلی (ئیملاق) بووە، ئەمەش تەنها ناوە، نەوەک خەڵکەکەی زەبەلاح بووبن، ناوی هۆز و گەلێک لەو ناوچەیەدا هەبوون ناویان زەبەلاح بووە بە عەرەبی (الإملاق)یان پێ وتراوە. هەر ئەم ناوەشە وای کردووە زۆرێک لە مێژوونوسان ئەو جۆرە ڕاڤەیان بۆ بکەن.

لە شاخ و گردەکانداماڵیان دروست دەکرد، نەخش و نیگاری جوانیان تێدا هەڵدەکەند، خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾﴾الشعراء

واتە: ئایا ئێوە لە هەموو شوێنێکی بەرز و سەر ڕێگاو لە شاخە بەرزەکاندا کۆشك و تەلاری بەرزو پتەو و گەورەو سەرەنجڕاکێش دروست ئەکەن لە کاتێکدا پێویستتان پێ نییەو تەنها بۆ فەخرو شانازی و دەرخستنی تواناتانە و تەنها کات بەسەر بردن و خۆماندوو کردن و بەفیڕۆدانی تواناتانە کۆشك و تەلاری بەرزو قەڵاو شورای پتەو دروست دەکەن وەکو ئەوەی کە ئێوە نەمرن و بەهەمیشەیی بمێننەوە، کاتێك کە بتانەوێ بەسەر کەسێکدا زاڵ بن زۆر بە توندوتیژی زاڵ ئەبن بەسەریدا لە ناحەقی و ستەمدا دەی ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن و لە خوا بترسێن و گوێڕایەڵی من بکەن تەقوای ئەو خوایە بکەن کە یارمەتی داون بەو هەموو شتەی کە خۆتان ئەزانن لە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان یارمەتی داون و پشتیوانی کردوون بە جۆرەها ئاژەڵ و بە منداڵ و باخ و باخات و سەرچاوەی ئاو و کانی و ڕووبارو بیرەکان، ئەگەر ئیمان

نەهێنن و بەردەوام بن لەسەر کوفرتان ئەوە من لەوە ئەترسێم کە خوای گەورە سزاتان بدات لە ڕۆژێکی زۆر گەورەدا کە ڕۆژی قیامەتە، وتیان: ئەی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکسانە ئەگەر تۆ ئامۆژگاریمان بکەی یان نەیکەی ئێمە گوێ بە ئامۆژگاری تۆ نادەین، بە قسەت ناکەین و دەستبەرداری دین و خواکانمان نابین.

ئەو ناوچەیە هەمووی باخوباخات بوو، بەڵام بەهۆکاری تاوان و هاوبەش دانانیان خوای گەورە سزای دان، هەمووی کردە بیابانی وشک، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: ڕۆژێک دێت کە ئەو ناوچەیە ناسراوە بەخاکی عەرەب، دەبێتە باخ و باخات و سەوزایی و ڕووبار، ئەمەش پێش هاتنی ڕۆژی قیامەتە و نیشانەی ڕۆژی دواییە[٧٣].

## بانگەوازی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ گەلەکەیدا

چۆنیەتی بانگەوازی پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ لەگەڵ گەلەکەیدا لەوپەڕی نەرم و نیانی و هێمنی دا بوو، خوای گەورە دیمەنی ئەو بانگەوازەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هوداً...۞﴾ الأعراف

واتە: بۆ لای قەومی عاد کە هۆزێك بوون لە (ئەحقاف) لە (حضرموت) خوای گەورە هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ ی بۆ ناردن کە لە خۆیان بوو.

بەوپەڕی گیانی برایەتی و خۆشەویستی بانگی دەکردن بۆ ئایینی خوای گەورە، بەو پێیەی برا و پشتیوانی براکەیەتی، پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دەترسا لەوەی تووشی سزا بن و بڕۆنە ناو ئاگری دۆزەخ، هیچ جۆرە دەمارگیری و توندوتیژی لە دژیان بەکار نەهێنا، بەڵکو تەنها بە گیانی برایەتی هەڵسووکەتی لەگەڵدا دەکردن، هەر بەم هۆکارەشە ناوی هوودی وەرگرتووە بەواتای هێمنی و لەسەرخۆیی و ئارامگری هەروەکو چۆن ناوی پێغەمبەر و هەموو پێغەمبەران مەدلولاتی تایبەتی و واتای جوان و ماناداری هەیە، بۆ نموونە ناوی محەمەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە سوپاسکراوەوە هاتووە، ناوی نووح لە سۆز و میهرەبانی فرمێسک لە چاویان هاتووە، ناوی صاڵح لە چاکسازی و چاکەخوازییەوە هاتووە، ئادەم لە خۆشکراوی خاک و...هتد.

[٧٣] لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتَّى تَعُودَ أرْضُ العَرَبِ مُرُوجًا وأنْهارًا/صحيح المسلم.

ناوی هوود لە (الهود) هاتووە، پێشتر ئاماژەمان پێداوە واتای چییە لەزمانی کوردیدا، پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ دەیوسیت لەتام و چێژی بەندایەتی خۆشی بەندایەتی ڕاستەقینە بزانن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ...﴾ الأعراف

واتە: هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار مەدەن لەبەر ئەوەی جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێت.

خۆشترین تام و چێژ لەم ژیانەدا ئەوە کە مرۆڤ هەست بکات بەندەی خوای میهرەبانە، بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە و باشترین پلەیە، کە مرۆڤ پێی بگات و هەستی عبودیەتی بۆ دروست بێت، بەندایەتی واتای ئەوەیە کە خوای پەروەردگار من موڵکتم و لەزاتی بەرزت کەس خاوەنم نییە، زاتی بەرزت فەرمانم پێ بکەو من جێبەجێی بکەم...

بەندایەتی تام و چێژی خۆی هەیە و مرۆڤ کە پێیگەیشت و تامی کرد ئەستەمە بتوانێت وازی لێ بهێنێت.

هەست بە سەر نەوی کردن دەکەیت لای خوای خۆت و سەربەرزی لای هەرچی مرۆڤ و مەخلوقی تر هەیە، واتای خۆشەویستییە هەموو خۆشەویستییەک گوێڕایەڵ و (مطیع) بێت بۆ خۆشەویستەکەی.

زۆرجار کەسانێک هەن نوێژو ڕۆژوو و بەندایەتی و دروشمەکان ئەنجام ئەدەن، بەڵام هەستی بەندایەتیان نییە بۆ خوا تا بگەنە پلە و ئاستی بەندایەتی، پێویستە پێبگەین زۆر لەخۆمان بکەین تا ڕزگار بین لە ئاگری دۆزەخ، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: من بەندەی تۆم پەروەردگار، کوڕی بەندەی تۆم و دایکیشم هەر بەندەی تۆیە[٧٤].

کەواتە کە مرۆڤ بووە بەندەی خوای گەورە واز لەهەرچی پەرستشی ترە دەهێنێت لەپێناوی خوای میهرەبان دا هەر بۆیە خوای پەروەردگار بەوە ئایەتەکەمان بۆ تەواو دەکات و دەفەرموێت: ﴿...مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ...﴾ الأعراف

واتە: ...لەبەر ئەوەی جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێ.

---

[٧٤] اللهم إني عبدُك ، وابنُ عبدِك وابنُ أمتِك/احمد.

بۆیە یەکێک لە پیاوچاکان دەڵێت: خوای پەروەردگار ئەوەی زاتی بەرزت بدۆزێتەوە چی لەدەست دەدات، ئەوەی زاتی بەرزت بدۆزێتەوە هەموو شتێکی دۆزیوەتەوە، ئەوەی زاتی بەرزت لەدەست بدات هەموو شتێکی لەدەست داوە.

بەواتایەکی تر ئەوەی هەژارەو بەندەیە خواناس بوو نەترسێت هەموو شتێکی دەست کەوتووە، ئەو کەسەی کێشەی لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی هەیە، خوای پەروەردگاری ناسی، بە دڵنیاییەوە خوای موتەعال هەرگیز دەست بەرداری نابێت، هەرچی لەدەست بدەیت، بەڵام خوای گەورە بناسیت و خۆت بە بەندەی بزانیت براوەیت و هەرگیز خەسارەتمەند نابیت.

پاشان خوای گەورە کۆتایی ئایەتەکە بە بڕگەیەکی وەحی زۆر گرنگ کۆتایی پێدەهێنێت لەسەر زمانی هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَام دەفەرموێت: ﴿... أَفَلَا تَتَّقُونَ ۝٦٥﴾ الأعراف

واتە: بۆ تەقوای خوای گەورە ناکەن بەوەی کە ئیمان بێنن.

بۆ ئێمەش لەم سەردەمەدا و لەداهاتوودا بۆ نەوەکانمان هەر هەمان کرداری پێغەمبەرانە کە دەبێت شوێن بکەوین و بانگەوازی بۆ بکەین، مانای { أَفَلَا تَتَّقُونَ} بۆ ئێمەیشە، دراوسێکەت دەمرێ بەڵام تۆ هەستت ناجوڵێت بۆ مردنی خۆت، کەواتە خۆت بپارێزە لە هاوبەش دانان و خراپەکاری تاوان و دوورکەوتنەوە لە بەندایەتی، کێشەکە لەوەدایە ئەزموونی گەلی نووح عَلَيْهِ السَّلَام لەبەرچاودا بوو، بەڵام ئێمەش سەدان ئەزموونی ترمان لەبەرچاودایە، کەچی هەر بەخەیاڵیشماندا نایەت، ڕۆژانە حەرام و کاری ناپەسەند دووبارە دەکەینەوە، لێرەدا دوو ئەنجام هەیە. ئەوەی دەگەڕێتەوە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێت، ئەوا شوێنکەوتووی پێغەمبەرانە، بەڵام ئەوەی گوێی پێنەداو وتەکانی وەکو گەلی عادە، ئەوا بەدڵنیاییەوە تووشی سزا دەبێت، بزانین وەڵامەکەیان چییە؟

لەکاتێکدا بەو شێوە جوانە بانگەوازی کردن، لەوەڵامدا هۆزەکەی وتیان وا هەست دەکەین ئەی هوود تۆ کەسێکی بێ نرخی لەناوماندا و لە درۆزنەکانی! ئەمە وەڵامی خوانەناس و کافرەکان بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٦٦﴾ الأعراف

واتە: دەسەڵاتدار و سەركردە و ناودارەكانی قەومەكەی لە كافران پێیان وت ئەی هوود؛ ئێمە وا ئەبینین كە تۆ كەسێكی گومڕا و گێل و كەم عەقڵی، ئێمە گومانی ئەوەت پێ ئەبەین كە تۆ یەكێك بیت لە درۆزنان و درۆ بكەیت و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بكەیت و پێغەمبەری خوا نەبی.

لەوەڵامدا پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَام زۆر بە شێوەیەكی نەرم و نیانی و پڕ سۆزییەوە پێیان دەڵێت: ئەی گەلەكەم من بێ ئەرزش نیم، بەڵام نێردراوی خوام، پەیامی خواتان پێدەگەیەنم و ئامۆژگاریتان دەكەم، ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٧ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ٦٨﴾ الأعراف

واتە: هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَام فەرمووی: ئەی قەومی خۆم من گێل و كەم عەقڵ نیم بەڵكو پەیامبەرو پێغەمبەری خوای گەورەم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە بۆ لای ئێوە نێردراوم(٦٧) پەیامی خوای گەورەتان پێ ئەگەیەنم و من ئامۆژگاریكاری ئێوەم بەدڵسۆزی و ئەمینم بەوەی كە ناپاكی ناكەم لەو پەیامەی خوای گەورە(٦٨)

پاشان ڕاستەوخۆ لەدوای ئەم ئایەتانە بەدواییدا باسێكی سەر سوڕهێنەر و ناساندنی خۆی و ئێستا زوو بەرز كردنەوەیان لەدوای گەلی نووح دەخاتە بەرچاویان پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَام، ﴿قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٧٠ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ٧١ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ٧٢﴾ الأعراف

واتە: وتیان: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتووی كە ئێمە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستین داوای ئەوەمان لێ ئەكەی واز بێنین لەو خوایانەی كە باوك و باپیرانمان پەرستوویانە، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی ئەو هەڕەشانەی كە لێمانی ئەكەی بیهێنە، واتە: ئەگەر ئیمان نەهێنین خوای گەورە سزامان ئەدات با سزای خوای گەورە بێت، پەلەیان كرد لە هاتنی سزای خوای گەورە(٧٠) فەرمووی: دەی دڵنیابن لە لایەن پەروەردگارەوە سزاو تووڕەبوونتان بۆ دائەبەزێنێ و غەزەبتان لێ ئەگرێ، ئایا ئێوە مشتومڕ و دەمەقاڵێ لەگەڵ مندا ئەكەن دەربارەی چەند ناوێك لەو خوایانەی كە خۆتان و باوك و باپیرانتان ناوتان لێ ناون، كە خوای گەورە هیچ بەڵگەی لەسەر ئەو خوایانەی ئێوە نەناردۆتە خوارەوە، دەی چاوەڕێی سزا بن، منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕێ ئەكەم، بزانن خوای

گەورە چۆن سزاتان ئەدات، کە ئەمە هەڕەشەیەکی سەختە﴿٧١﴾ خوای گەورە ئەفەرموێت: هوود پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ و ئەو باوەڕدارانەی کە لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن بە ڕەحمەت و سۆزو میهرەبانی خۆمان دوای ئەو کەسانەمان بڕی و ڕیشەکێشمان کردن و کۆتاییمان پێ هێنان کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ ئەزانی، خوای گەورە باو گەردەلولێکی بەهێزی زۆر ساردی نارد کە شاریانی هەمووی وێران و کاول کرد و بەردی هەڵئەگرت و ئەیکێشا پیایاندا بە بایەکی زۆر سەخت کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام بەسەریانەوە بوو، هەڵی ئەگرتن و بەرزی ئەکردنەوە و دەیدان بە زەویدا تا هەمووی کوشتن ئەمانە ئیمانیان نەهێنا بۆیە خوای گەورە لەناوی بردن﴿٧٢﴾

پاشان باسێکی زۆر گرنگ لەژیانی ئەم پێغەمبەرەدا بۆ ئێمە بەدی دەکرێت کە هەوڵبدەین خۆمانی لێ دووربخەینەوە بۆ ئەوەی تووشی سزای خوایی نەبین، ئەویش بە پێزانینمان بۆ نیعمەتەکانی پەروەردگار و سوپاسگوزاری خوای گەورە بین.

هەربۆیە عومەری کوڕی خەتاب ڕۆژێک لە ڕێگادا بەرەو بازاڕی مەئاپینە تەشریفی دەبرد پیاوێکی بینی فەرمووی: ئەمڕۆ چۆن هەڵسایت و ڕۆژی نوێت چۆن دەست پێکرد، ئەویش وتی: بەچاکەو خێر، پاشان پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، چۆن ئەمڕۆت دەست پێکرد؟ دیسان کەسەکە وتی: بەخێروچاکە، ئینجا عومەر بە توڕەییەوە هەمان پرسیاری کردەوە کەسەکە وتی: سوپاس بۆ خوا بەخێر و چاکە، عومەر فەرمووی: ئەوەم دەویست[٧٥].

پێویستە سوپاسگوزار بین تا خوای پەروەردگار نیعمەتەکانیمان بۆ زیاد بکات، چونکە پێچەوانەی سوپاسگوزاری کوفر کردنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴿٣﴾﴾ الإنسان

واتە: ئێمە هەردوو ڕێگای خێرو شەڕمان بۆ مرۆڤ ڕوون کردۆتەوەو پێی ناساندووە، ئیتر بە ویستی خۆی یان ئەوەتا شوکرانەبژێری خوای گەورە ئەکات، یان ئەوەتا کوفرانەی خوای گەورە ئەکات و سەرپشکەو توانای هەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٥] قال له عمر: كيف اصبحت؟ فقال: بخير فقال: له عمر كيف اصبحت؟ قال: بخير! قال له عمر: اقول لک كيف اصبحت فقال بخير الحمد لله، قال عمر هذا ما أردت.

﴿قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ النمل

واتە: بەڵام کەسێکی تر کە وتراوە وەزیرێکی بووە، یان نووسەرێکی بووە، کە زانیاری لە کتێبدا هەبووە ئەو وتوویەتی: من عەرشی ئەو ئافرەتەت بۆ دێنمە پێش ئەوەی کە پێڵووی چاوت بجووڵێتەوە، واتە: پێش ئەوەی چاو بتروکێنی، بینوقێنیت و چاو بکەیتەوە لە ماوەیەکی ئەوەندەدا عەرشەکەیت بۆ دێنم، هەر ئەوەندە چاوی تروکاند یەکسەر عەرشەکەی ئەو ئافرەتە پاشایەی هێناو لەبەر دەستی سولەیماندا دایناو جێگیری کرد، سولەیمان عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەمە فەزڵی خوای گەورەیە بەسەر منەوە تا تاقیم بکاتەوە ئایا شوکرانەبژێری خوای گەورە ئەکەم یان کوفری نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەکەم، هەر کەسێك شوکرانەبژێری خوای گەورە بکات ئەوا شوکری خوای کردووەو بۆ خۆی باشەو سوودەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە هەر کەسێکیش شوکرانەبژێری خوا نەکات و کوفرانەی نیعمەتی خوای گەورە بکات ئەوا بە دڵنیایی پەروەردگارم زۆر دەوڵەمەندەو بێ پێویستە و پێویستی بەوە نییە کە کەس شوکرانەبژێری بکات و بیپەرستێت و زۆر بەڕێزە.

یەکێک لە کارەکانی تر ئەم هۆز و گەلە بە فیرۆدانی سەروەت و سامان بوو لە دروستکردنی باڵەخانە و بورجی بەرز تەنها بۆ ناو و ناوبانگ واتا لەناویدا نەدەژیان، بەڵکو بۆ ئەوەی بڵێن فلان خانەوادە و خێزان بۆ دروستکردنی خانو و باڵەخانەکەیان پارەی زۆریان بەکار هێناوە. هۆزی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ پارەو سەروەت و سامانیان زۆر بەکار دەهێنا بۆ مانەوەی ناو و ناوبانگی خانەوادەکانیان، بەڵام بێجگە ناوی پێغەمبەرەکەیان ناوی خانەوادەکانیان و خۆشیان لەناوچوون، ئەوەی ماوەتەوە مێژوویەکی پڕ وانە بۆ خەڵکی دوای خۆیان بەجێماوە، خوای پەروەردگار ئەو دیمەنەمان نیشان ئەدات لە قورئاندا و دەفەرموێت: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾﴾ الشعراء

واتە: ئایا ئێوە لە هەموو شوێنێکی بەرزو سەر ڕێگاو لە شاخە بەرزەکاندا کۆشك و تەلاری بەرزو پتەو و گەورەو سەرنجڕاکێش دروست ئەکەن لە کاتێکدا پێویستتان پێ نییەو تەنها بۆ فەخرو شانازی و دەرخستنی تواناتانەو تەنها کات بەسەر بردن و خۆماندوو کردن و بەفیرۆدانی تواناتانە، کۆشك و تەلاری بەرزو قەڵاو شورای پتەو دروست دەکەن وەکو ئەوەی کە ئێوە نەمرن و بەهەمیشەیی بمێننەوە کاتێك کە بتانەوێ بەسەر کەسێکدا زاڵ بن زۆر بە توندوتیژی زاڵ ئەبن بەسەریدا لە ناحەقی و ستەمدا دەی ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن و لە خوا بترسێن و گوێڕایەڵی من بکەن تەقوای ئەو خوایە بکەن کە یارمەتی داون بەو هەموو شتەی کە خۆتان

ئەزانن لە ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان یارمەتی داون و پشتیوانی کردوون بە جۆرەها ئاژەڵ و بە منداڵ و باخ و باخات و سەرچاوەی ئاو و کانی و ڕووبارو بیرەکان، ئەگەر ئیمان نەهێنن و بەردەوام بن لەسەر کوفرتان ئەوە من لەوە ئەترسێم کە خوای گەورە سزاتان بدات لە ڕۆژێکی زۆر گەورەدا کە ڕۆژی قیامەتە وتیان: ئەی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ یەکسانە ئەگەر تۆ ئامۆژگاریمان بکەی یان نەیکەی ئێمە گوێ بە ئامۆژگاری تۆ نادەین، بە قسەت ناکەین و دەستبەرداری دین و خواکانمان نابین.



لەکاتێکدا زۆرێک لە کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆ لاسایی گەلی عاد دەکەنەوە، بنەماڵە و هۆزەکان مۆنۆمێنت و باڵەخانە و خاکی زۆر گەورە لە خەڵکی هەژار داگیر دەکەن ناوی خۆیانی لێ دەنێن، بۆ فەخر و شانازی لە وڵاتی ئێمەش ئەوە زۆرە، گرد و خاک دەکەن بە کۆمپانیا و جێگای قەڵا و ژوانی سیاسییەکان بۆ مانەوەی ناوی هۆز و خانەوادە، زیادەیەکیش لەمانە بۆ ناوی حیزبەکانیان بۆ ئەوەی ناوی خانەوادە و کەسەکان بە نەمری(خلودی) بمێنێتەوە، خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾﴾ الشعراء

واتە: کۆشك و تەلاری بەرزو قەڵاو شورای پتەو دروست دەکەن وەکو ئەوەی کە ئێوە نەمرن و بەهەمیشەیی بمێننەوە.

خۆ دەیانزانی هەموو دەمرن، بەڵام مانای خلود و مانەوەی ناو و ناوبانگیان هەر بمێنێت، هەرچەندە ئەم کارە خراپ نییە، ئەگەر لە ڕێگای کاری تەندروست و باشەوە بێت، مرۆڤ ناو و ناوبانگ پەیدا بکات و ناوی بە خلودی بمێنێتەوە، وەکو ئەو هەموو زانا و سەرکردە موجاهیدانەی ناویان بەخلودی ماوەتەوە، هەزارانی وەکو شافعی، عزی کوڕی عەبدلسەلام، ئبن تەیمیە، سەلاحەئایینی ئەیوبی، عوقبەی کوڕی نافع و...هتد.

بەڵام کێشەی هۆزی عاد لەوەدا بوو زوڵمیان دەکرد، خۆ ناوبانگی ئەوانەش زۆرە کە زوڵمیان کردووە، وەکو فرعەون، ئەبوجەهل و هەزارەها کەسی تری خوێنرێژ و دیکتاتۆر، بەڵام بەچی دەچێت کە بوونەتە ڕەمز و سیمبولی زوڵم، ئەوانیش زوڵمیان دەکرد خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ۝١٣٠﴾ الشعراء

واتە: کاتێك کە بتانەوێ بەسەر کەسێکدا زاڵ بن، زۆر بە توندوتیژی زاڵ ئەبن بەسەریدا لە ناحەقی و ستەمدا.

لەگەڵ ئەوەی کە ئامۆژگاری زۆری کردن پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ، بەڵام ئەوان دەیانوت ئامۆژگارییەکانت هیچ کاریگەری نییە، ئێمە لەسەر ڕێگا و شوێنی باووباپیرانمان دەڕۆین، پێشینانمان چییان کردووە ئێمەش وا دەکەین! خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ۝١٣٦ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ۝١٣٧﴾ الشعراء

واتە: وتیان: ئەی هوود یەکسانە ئەگەر تۆ ئامۆژگاریمان بکەی یان نەیکەی ئێمە گوێ بە ئامۆژگاری تۆ نادەین و بە قسەت ناکەین و دەستبەرداری دین و خواکانمان نابین۝١٣٦ ئەم بیروباوەڕەی کە ئێمەی لەسەرین ئەمە ڕەوشت و دابونەریت و دینی باوك و باپیرانمانە و بۆمان ماوەتەوەو لاسایی ئەوان دەکەینەوە و لەسەری دەڕۆین، یاخود ئەم ئایینەی تۆ بۆت هێناوین هیچ شتێك نییە تەنها بەسەرهات و سەرگوزشتەی ئوممەتانی پێشترەو تۆ لەلایەن خواوە نەنێردراوی، یاخود خوای گەورە دەفەرموێت: ئەم بەدرۆزانینەی ئەوان وەکو بەدرۆزانینی سەرجەم ئوممەتانی پێشتر وایە۝١٣٧

لەهەموو سەردەمێک دا ئەم وتەیە دووبارە دەکرێتەوە، خەڵکی کە زانیاری لەسەر ئایین پێیدەڵێت و پێشتر نەیبیستوە یاخود نەیخوێندوەتەوە کە زانیاریەکەی ئەیدەیتێ، لای تۆ نییە،

كەچی دەڵێت ئەم بانگخوازێكی نوێی هێناوە، چەند ساڵە باووباپیرانمان وا ژیاون، تۆ بڵێی ئەوان هەڵە بووبن و ئێستا تۆ ڕاست بیت؟

ژیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە هوود عَلَيْهِ السَّلَام پەند و ئامۆژگاری یەكجار زۆری لێ وەردەگیرێت، خوای گەورە سورەتێكی ناوناوە بەناوی هوود، لەبەر گرنگی باسەكانی و پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: هوود و خوشەكەكانی پیریان كردم،[٧٦] هەڵبەت مەبەستی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سورەتی هوود و براكانی واتا سورەتەكانی تر.

هەرچەندە پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَام داوای لێكردن كە تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەزموونی نووح عَلَيْهِ السَّلَام دووبارە نەبێتەوە لە ناویاندا و سەرەڕۆ و تاوانبار نەبن، بەڵام چار نەبوو، ئەوان بە ڕاشكاوانە وتیان: ئێمە واز لە خوا و ئایینەكەمان ناهێنین، بڕواشمان بە تۆ نییە. هەست دەكەین خواكانمان دەستیان لە تۆ وەشاندوە و ئەقڵت تێكچووە، جا كوشتنت زۆر ئاسانە لامان و تۆ موستەحەقیت بە كوشتن ئەی هوود.

هوود عَلَيْهِ السَّلَام بە ڕاشكاوانە وەڵامی دانەوە، لەبەردەم هەموویاندا فەرمووی: من لە ئێوە خۆم بێ بەری دەكەم، خوایە تۆش شاهید بە ئەگەر ڕاست دەكەن و خاوەنی هێز و توانا و پلانن دە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٦] روى الترمذي عَنْ عِكْرِمَةَ عن ابنِ عبّاسٍ قالَ: قالَ: أَبُو بَكْر رضي الله عنه يَا رَسُولَ الله قَدْ شِبْتَ. قالَ: شَيَّبَتْنِي هُودٌ وأخواتها.

وەرن من بکوژن، من تەوەکولم بە خوایە ئێوە ناتوانن هەنگاوێکیش لێم نزیک ببنەوە، ئەمەش بیروباوەڕ و تەوەکولی پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ۝٥٣ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ۝٥٤ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ۝٥٥ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٥٦﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی هوود بەڕاستی تۆ هیچ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرات بۆ ئێمە نەهێناوە لەسەر ئەوەی کە تۆ پێغەمبەری خوایت، لەبەر قسەی تۆ ئێمە واز لە خوایەکانی خۆمان ناهێنین، ئێمە ئیمان بە تۆ ناهێنین۝٥٣ ئێمە ئەڵێین: هەندێك لە خوایەکانی ئێمە کە تۆ قسەیان پێ ئەڵێی ئەوان دەستیان لێ وەشاندوویت و شێتیان کردوویت هوود فەرمووی: من خوای گەورە ئەکەم بە شایەت و ئێوەش شایەت بن کە من بەریم لە هەموو ئەو خوایانەی کە ئێوە کردوتانە بە شەریك بۆ خوای گەورەو لە غەیری خوای گەورە ئەیانپەرستن۝٥٤ جگە لە خوای گەورە، خۆتان و خوایەکانتان چیتان بۆ ئەکرێ بۆ ئەوەی زەرەرو زیان لە من بدەن بیکەن و پاشانیش هیچ مۆڵەتم پێ مەدەن و پەلە بکەن لەوەی کە چ زەرەرو زیانێکم پێ ئەگەیەنن بیگەیەنن۝٥٥ من تەنها پشتم بە خوای گەورە بەستووە الله کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە هەر ئەوە من ئەپارێزێ لە نەخشەو پیلان و زەرەرو زیانی ئێوە، هیچ ئاژەڵ و گیانلەبەرێك نییە لەسەر ڕووی زەوی ئیلا خوای گەورە پێشەسەری گرتووە، بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگای ڕاست و دادپەروەرییەو ئێوەی کافر زاڵ ناکات بەسەر منی باوەڕدارا۝٥٦

لەوانەیە پرسیاری ئەوە بکرێت ئەی موعجیزەی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ چی بووە؟ ئەگەر صاڵح موعجیزەی وشترێک بووە، نووح دیزاین و پیشەوەری بووە کە خوای گەورە فێری کردووە، ئەی هوود عَلَيْهِ السَّلَام موعجیزەکەی چییە؟

موعجیزەی هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ تەوەکولی بوو، کە ئەو هۆزە هەرچی دەیانوویست بیکوژن نەیاندەتوانی، ئایەتی ٥٥ و ٥٦ی سورەتی هوود کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە بەجوانی ئەوە نیشان دەدات.

خوای گەورە وەکیلە وسیفەتی (الوکیل)ی هەیە، واتا کاروباری ئەم گەردوونە بەڕێوەدەبات، کە مرۆڤیش یەقینی هەبوو بە وەکیلی خوای پەروەردگار ئەستەمە پشتی بدرێت لە زەوی.

بەو مەرجەی بەڕاستی وەکالەت بۆ خوای موتەعال بگەڕێنینەوە، بەڵام ئەگەر لەسەر بنەمای شک و گومان بێت، وەکالەتەکەت سەرکەوتوو نابێت، چونکە ئەو خوایە ناخ و دڵ و دەروون دەزانێت و زانستی بەسەردا هەیە. لەژیانی ئێستادا مرۆڤ وەکالەتێکی گشتی دەکاتەوە بۆ پارێزەرێک یاخود مرۆڤێکی تر دەتوانێت دەسەڵاتی ڕەهای هەبێت لە موڵکی بەرانبەریدا.

ئەی ئەگەر ئەو زاتە خوای پەروەردگار بێت و خۆی زاتی بەرزی وەکیل بێت، داخۆ چۆن پارێزگاریت لێدەکات.

هۆکاری لەناوچوونی ئەم میللەتە بەهۆکاری زۆر مەغروریان بوو بە هێز و توانا و پارەو سەروەتیان.

خوای گەورە لە قورئاندا ئەو دیمەنەمان بۆ دەگوازێتەوە و وێنای دەکات لە ڕێگای وەحییەوە و دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُواْ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾﴾ فصلت

واتە: قەومی عاد خۆیان بەگەورەزانی لە ئیمان هێنان لەسەر زەویدا، بەبێ حەق شانازییان ئەکرد بەهێزو توانای خۆیان و ئەیانوت کێ هەیە لە ئێمە بەهێزتر بێت، وایانئەزانی هێزو توانایان دەیانپارێزێت لە سزای خوای گەورە، ئایا نابینن ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کردووە زۆر لەوان بەهێزترە، توانای بەسەریاندا هەیە ئەوان نکوڵی و ئینکاریان لە موعجیزەو نیشانەکانی ئێمە دەکرد.

پێیان وابوو کەس لەوان بەهێزتر نییە، تا خوای گەورە بە ڕەشەباو بۆران لەناوی بردن، ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَـٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَـٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾﴾ فصلت

واتە: ئێمەش بایەکی وشك و ساردو سەخت و دەنگ بەرزمان بۆ ناردن لە چەند ڕۆژێکی یەك لە دوای یەکدا کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو، هیچ خێرێکی تیا نەبووە سەبارەت بەوان بەڵکو تەنها سزا بوو دوای بڕینەوە و کۆتایی پێ هێنان، تا سزایەکیان پێ بچێژین کە ڕیسواو سەرشۆڕیان بکات لە ژیانی دونیادا، بەڵام سزای ڕۆژی دوایی زیاتر ڕیسواو زەلیل و سەرشۆڕیان ئەکات، کەس نییە ئەوان سەر بخات و سزای سەختی خوای گەورەیان لەسەر

لابدات﴿١٦﴾ قەومی ثەموودیش ئێمە ڕێگای ڕاستمان پێ ناساندن و بۆمان ڕوون کردنەوەو بانگمان کردن بۆی لەسەر زمانی صاڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بەڵام ئەوان ڕێگای کوێری و کوفرو گومڕاییان هەڵبژارد بەسەر ڕێگای هیدایەت و گوێڕایەڵی و ئیماندا، ئەمانیش خوای گەورە سزای دان و زەوی لە ژێریاندا هەژاندو بە دەنگێکی گەورە لە ئاسمانەوە لە ناوی بردن و سەرشۆڕو زەلیل و ڕیسوای کردن بەهۆی کوفرو کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە کە حوشترەکەیان سەربڕی﴿١٧﴾

زۆربوون ئەوانەی لەم سەرزەوییەدا بەهەمان قسەی عادیان کرد وەکو نەمروود و فیرعەون، کوان؟

دەوڵەتی فارس و ڕۆم کوان؟

دەوڵەتی تەتار و مەغۆل و صەلیبی کوان؟

دەوڵەتی کۆمەنیستی لینینی و ستالین و نازیی هیتلەری کوان؟

لەکاتێکدا ئەڵمانییەکان دەیانوت: ئەڵمانیا لەسەروو هەموو شتێکەوەیە، کوا دەوڵەتی بەریتانیا کە دەیانوت: ڕۆژی لێ ئاوا نابێت؟

ئێستا ئەمەریکا بوونی هەیە، ئەویش هاکا زەلیل و بەچۆکدا هات، ﴿...وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ...﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران

واتە:... ئەم ڕۆژگارو ڕووداوانە لە سەرکەوتن و تێکشکاندن خوای گەورە دابەشی کردووە لە نێوان خەڵکیدا...

خوای گەورە بە سەربازێکی زۆر ناسکی خۆی کە هەواو بایە هەموویانی لەناوبردو لە ڕیشە هەڵیکێشان، سەرەتا بە هەورێکی ڕەش دەستی پێکرد و باوبۆرانەکە، دڵیان خۆش بوو وایان زانی بارانە، بەڵام ڕۆژی لەناوچوونیان بوو، ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا۟ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا۟ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴿٢٥﴾﴾ الأحقاف

واتە: کاتێك کە هەورێکیان بینی لە ئاسۆوە بۆیان دەرکەوت و بەرەو ڕووی ئەمان و دۆڵ و شیوەکانیان هات کە کشتوکاڵ و دانەوێڵەو باخیان لەوێ بوو، چەند ساڵێك بوو خوای گەورە

بارانی لێیان گرتبووەوەو باران نباری، کاتێك کە هەورێك هات وایان زانی ئەمە هەورێکەو بۆ ئەوان بارانی تیایە، بۆیە پێی دڵخۆش بوون، هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: بەڵکو ئەمە ئەو سزایەیە کە خۆتان پەلەتان دەکردو داواتان ئەکرد، ئەمە بایەکە لەلایەن خوای گەورەوە سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاری تیادایە بۆتان﴿٢٤﴾ هەموو شتێك لەناو ئەدات و تێکئەشکێنێ بە فەرمانی خوای گەورە، کاتێك کە ئەو بایە هات و خۆیان و سەروەت و سامانی لەناو بردن و هیچ شتێکیان نەماو دوای بڕین، تەنها خانوو ماڵەکانیان نەبێت، بەم شێوازە ئێمە سزای کەسانێکی تاوانبارو موشریك ئەدەینەوە کە پێغەمبەرانمان بە درۆ بزانن و شوێنیان نەکەون﴿٢٥﴾

لەبەر خراپەکارییان خوای گەورە ویستی لەسەر بوو کەوا لەو ناوچەیەدا گۆڕانکاری بنەڕەتی بکات، باکەی وشک و سوتێنەر و لەناوبەر بوو، هەموو شتەکانی کرد بە خۆڵ و بەرد و بیابان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ﴿٤١﴾مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾﴾ الذاريات

واتە: قەومی (عاد)یش بەهەمان شێوە لەوانیش بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە کاتێك کە بایەکی نەزۆکمان ناردە سەریان کە هیچ خێرێکی تیادا نەبووە، بایەك نەبووە کە باران هەڵگرێ، بەڵکو بۆ سزادان بووە﴿٤١﴾ بەسەر هیچ شتێکدا تێ نەئەپەڕی ئیلا لەناوی ئەبردو تێکی ئەشکاندو وەکو شتێکی ڕزیوی لێ ئەکرد﴿٤٢﴾

خوای گەورە لە قورئاندا سەرنجمان بۆ ئەوە ڕادەکێشێت و پێمان دەفەرموێت: کە مادام ئاوا سەرەڕۆ بوون، پاشماوەیەکی کەم دەهێڵمەوە بۆ ئەوەی بیناسن و وانەی لێوە فێربن، ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴿١٥﴾فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴿١٦﴾وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴿١٨﴾إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴿١٩﴾تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ﴿٢٠﴾فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴿٢١﴾﴾ القمر

واتە: ئەم کەشتییەمان تا ماوەیەك هێشتەوەو خەڵك بینیان تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسانێك کە پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن و دەست لە خراپەو تاوان هەڵگرن، یاخود کەشتیمان لەناو ئێوەدا هێشتەوە کە بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە ئایا کەس هەیە پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت﴿١٥﴾ بزانە سزاو ئاگادارکردنەوەی من چۆنەو چەند سەخت و قورسە بۆ کافران﴿١٦﴾ بە دڵنیایی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ زیکرو یادکردن و

پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن، لەفزو ماناو خوێندنەوەو لەبەرکردنیمان ئاسان کردووە بۆ ئەوەی کە پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن، ئەگەر خوای گەورە ئاسانی نەکردایە کەس نەیدەتوانی قسەو فەرموودەی خوای گەورە، بخوێنێتەوە، ئایا کەس هەیە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێ و لە تاوان خۆی پێ بپارێزێت﴿١٧﴾ قەومی عادیش پێغەمبەرەکەیان بەدرۆیان زانی کە هوود عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو، بزانە سزاو ئاگادارکردنەوەی من چۆن بوو، چەند سەخت بوو بۆیان﴿١٨﴾ ئێمە بایەکی زۆر ساردی سەخت و دەنگێکی زۆر گەورەمان بۆ ناردن لە ڕۆژێکی زۆر خراپ سەبارەت بەوان، ئەو خراپی و سزایە بەردەوام بوو لەسەریان تا لەناوی بردن﴿١٩﴾ خەڵکی هەڵتەکۆڵی لە ماڵەکانیان و دەری ئەکردن و هەڵی ئەدانە ئاسماندا تا لە چاو دیار نامان پاشان بەری ئەدانەوە سەر زەوی و سەری لێ ئەکردنەوەو دەبوونە لاشەی بێ سەر وەکو قەدی دار خورمایان لێهات کە لە زەویدا کەوتبێ﴿٢٠﴾ بزانە سزاو ئاگادارکردنەوەی من چەند سەخت بوو بۆیان﴿٢١﴾

هەندێک لە زانایانی جیۆلۆجی ئەمریکی لەو ناوچەیەدا بەدوای شوێنەواردا گەڕاون، دەڵێن ژێر خۆڵی بیابانەکە چەندین ستوون و پایەی گەورەی لەهەناودا هەڵگرتووە، زانایانی ئیعجازی قورئانی ئەوەیان بۆمان ئاشکرا کردووە، ﴿إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ﴿٧﴾﴾ الفجر.

واتە: عامود و مێخی زۆریان هەبووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژمارەیان زۆر بووە، یاخود گەڕاون لە شوێنانداو مێخیان چەقاندووەو خێمەیان داکوتیوەو دواتر ڕۆیشتوون و ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە، یاخود وتراوە: عامودی زۆر بەهێزیان هەبووە لەبەر ئەوەی خۆیان زۆر بەهێز بوونەو پێکهاتەی لەشیان زۆر بەهێز بووە.

لەکۆتایی ئەم باسەدا پێویستە ئەوە بڵێم کە ترسمان هەبێت لە سزای خوای و هەمیشە خۆمان دووربخەینەوە لە هاوبەش دانان و زیادە ڕۆیی لەسەروەت و سامان و سەرپێچی نەکەین لە فەرمانی خوایی، کەناوی ئەم گەل و میللەتە هات بترسین و ڕەنگمان زەرد بێت. خاتوو عائیشە ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت دەڵێت: پێغەمبەرصَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە هەورێکی ڕەشی دەبینی دەترسا و ڕەنگی تێک دەچوو تا دەبووە باران و ئینجا خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی و سوپاسی خوای دەکرد، خاتوو عائیشە دەڵێت: پرسیم بۆ وا تێکچوویت ئەی ڕەسولی خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە چ بڕوایەک و چ شتێک هەیە کە تووشی سزا و ناڕەحەتی هۆزی عاد نەبین؟[٧٧]

گەورەترین وانە کە فێربووین لەم مێژووە کە ژیانی پڕ نووری پێغەمبەرێکی ئازیزە، ئەوەیش تەوەکول کردنە بە خوای گەورە. هەر گەل و میللەتێک تەوەکولی بەهێز بوو خوای گەورە دەیپارێزێت، ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا... ﴿٧٢﴾﴾ الأعراف

واتە: هوود پێغەمبەر عليه السلام وئەو باوەڕدارانەی کە لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن بە ڕەحمەت و سۆزو میهرەبانی خۆمان....

وا ئەم جارەش کۆتایی هات بە نێوانی حەق و باطڵ لەناو ئەم هۆزەدا، بەڵام ململانێکە بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت ململانێی کوفر و ئیمان بەردەوامە، پێدەچێت لەدوای کارەساتی باوبۆران هۆزەکەی لەناوچەکە دەرچووبن بەرەو ناوچەیەکی کەم ئاو بەڕێکەوت کە لە دواییدا دەناسرێت بە ثەموود، واتا جێگایەکی کەم ئاو یاخود یەکێک لەناوچەکانی ناوی ثەموود دەبێت و دەچێتە خاکی (الحیجر)[٧٨] لەوێ دەژی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٧] و من يؤمنني يا عائشة أن يصبنا عذاب كعذاب قوم عاد/ مسلم.

[٧٨] هەندێ بڕوایان وایە ئەوانە بە ( اصحاب الحجر)یش ناسراون، چونکە یەکێکە لەو شارانەی ئەوان، کە جوگرافی گریکی _ بلینی) دەیدۆزێتەوە، ( بلینی) نووسیویەتی: ( دوماثا) و ( هجرا) نیشتمانی ( ثمود) بوون، ئەوەی دوایان شاری ( حجر) دروست دەکات.

( سێرجوونی دووەم) شای بابل لە تۆمارگەکەیدا نووسیویەتی لە یەکێ لە شەڕەکاندا بەسەر ئەو گەلەی دوورگەی عەرەبیدا زاڵ بووە، وەکو لە نووسراوی ( ئەرستۆ) و ( بتولمی) و (بلینی) دا بە ( تامودی) ناویان هاتووە و بەر لە ( ٤٠٠-٦٠٠) ی زاینی دوای پێغەمبەری خۆمان ﷺ بە تەواوی بزر دەبن.

( الامم البائدة/ هارون يحيى/: ١٠٨.

# مەملەکەتی شەشەم
# ڕووداوەکانی ژیانی ساڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ

ئەم پێغەمبەرە ٩ جار لە قورئاندا ناوی هاتووە، لە سورەتەکانی النمل، الأعراف، الشعراء و هوود، بەڵام لە سورەتی تر باسی هۆزەکەی کراوە نموونەی سورەتی القمر، الإسراء، السجدة، ابراهیم و...هتد.

ئەم هۆزە سەربەهۆزی عادە، بە عادی دووەم ناسراوە یاخود بەهۆزی ثەموود کە یەکێکە لە باوانی ساڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بە باپیری هەژمار دەکرێت.

ناوی ساڵح کوڕی عوبێدی کوڕی ئاسف کوڕی شامخ کوڕی عوبێد کوڕی حازر کوڕی جەبار کوڕی ثەموود کوڕی عامر کوڕی ئیرەم کوڕی سام کوڕی نووح-ە.

خوای گەورە ناردی بۆ هۆزی ثەموود کە بتپەرست بوون و بانگی کردن بۆ یەکتاپەرستی، ئەم گەلە لە دوای گەلی عاد بوون واتا عەرەبی ڕەسەن بوون، کە گەلی عاد لەناوچوون ئەمان لەنێوان حیجاز و شام دا لە جێگایەکدا بەناوی حیجر ژیانیان دەکرد، هەمان بنەڕەتی گەلی عاد بوون، تەنانەت خانوو باڵەخانە و ژیاریان لە هۆزی عاد دەچوو، بۆیە بەهۆزی عاد دەوترێت عادی یەکەم، بەمانیش دەوترێت عادی دووەم.

گەلەکەی زۆر دژایەتییان دەکرد و هەندێکیش ئیمانیان پێهێنا، بەڵام زۆربەی خەڵکەکەی دژی بوون، هەرچەندە ساڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ زۆر بە هێمنی و نەرم و نیانی بانگەوازی دەکردن، بەڵام ئەوان هەر سەرەڕۆتر دەبوون.

جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم کە لە قورئاندا هەمیشە بەدوای یەکدا هۆزی عاد و ثەموود هاتووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سەردەم و کاتەکانیان زۆر لەیەکەوە نزیک بوو، پێدەچێت ئەو گەلانەی کە پێغەمبەریان بۆ نێردراوە ئەگەر پێغەمبەرەکە بە بەردەوامی لەگەڵیاندا بووبێت و وەڵامیان بۆ ئایینی خوا نەبووبێت خوای گەورە سزای داون و لەناوی بردوون، یان مەگەر پێغەمبەرەکە لەناویاندا دەرچووبێت و لە جێگایەکی تر بانگەوازی کردبێت، وەکو حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ، هەڵبەت لەسەرەتاوە سوننەتی خوایی بەم شێوەیە بووە پاشان

خوای گەورە سوننەتەکەی خۆی گۆڕی و بۆ مانەوەی بانگەواز لەناویاندا وەکو هۆزی جوولەکە و ئوممەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

هەرچەندە پێغەمبەر مووسا عَلَيْهِ السَّلَامُ هەواڵی ئەم دوو گەلەی دایە بەنی ئیسرائیل، بەڵام چونکە ئەوان هەمیشە بیریان لە خۆویستی و نەتەوە پەرستی بوو، ئەوەی لە یەهوود نەبوایە لەکتێبەکانیاندا یاداشتیان نەدەکرد، ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ۝ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ۝﴾ إبراهيم

واتە: موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەگەر ئێوەو هەرچی خەڵکی سەر ڕووی زەوی هەیە هەموتان کوفر بکەن بە خوای گەورە، ئەوا بەدڵنیایی خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندو بێ پێویستەو پێویستی بە سوپاسکردنی ئێوە نییە، سوپاسکراوە لە زەوی و ئاسمانداو هەموو دروستکراوەکان سوپاسگوزاری خوای گەورە ئەکەن۝ ئایا هەواڵی ئوممەتانی پێش خۆتانتان بۆ نەهاتووە کە خوای گەورە چی بەسەریان هێناوە وەکو قەومەکانی نووح و عادو ثەموودو ئەوانەی دوای ئەوانیش کە ژمارەیان خوا نەبێ کەسی تر نایزانێ و زانیارییان تەنها خوای گەورە خۆی ئەیزانێ کە پێغەمبەرانیان بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە هاتن بۆ لایان، بەڵام ئەوان دەستیان کردە ناو دەمی خۆیان و ئەیانگەست وەکو ڕق لێبوون و تووڕە بوون لەو ئایینەی کە پێغەمبەران هێناویانە، یاخود دەستیان دەخستە سەر دەمیان وەکو بە درۆزانینی پێغەمبەران، ئاماژە بووە بۆ بێدەنگ بوون و وەڵام نەدانەوەی پێغەمبەران، یاخود بە دەستیان ئاماژەیان بۆ دەمی پێغەمبەران دەکرد کە بێدەنگ بن لە بانگەواز کردنمان و قسەی پێغەمبەرانیان ڕەت ئەکردەوە، پێیان وتن: ئێمە کافرین بەوەی کە ئێوەی پێ نێردراون لە ئیمان و یەکخواپەرستی، ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کە ئێوە بانگمان ئەکەن بۆ لای لە یەکخواپەرستی و دوودڵین لێی۝

خوای گەورە لە قورئاندا بەچەند گۆشەنیگایەک و دیمەنێک باسەکانی ژیانی صاڵح و ڕووداوەکانی ئەو گەلەمان بۆ باس دەکات، سێ نموونەی لێ وەردەگرین.

نموونەی یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ۝ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ

فِي ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الأعراف

واتە: بۆ لای قەومی ثەموودیش صالّح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان نارد کە لە خۆیان بوو، قەومی ثەموود لە دوای قەومی عاد بوون و لە (حیجر) نیشتەجێ بوون فەرمووی: ئەی قەومی خۆم عیبادەتی خوای گەورە بکەن و بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن چوونکە جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێت ئەوە موعجیزەو بەڵگەی ڕوون و ئاشکراتان بۆ هاتووە لەلایەن پەروەردگارەوە کە لەو بەردو تاوێرە ڕەقە حوشترێکی بۆ دەرکردن، کە خۆیان داوایان کرد موعجیزەیەکیان نیشان بدات و لە تاوێرێکی ڕەق حوشترێکیان بۆ دەربکات، صالّحیش بەڵێنی لێ وەرگرتن ئەگەر خوای گەورە ئەمەی نیشان دان ئیمانی پێ بهێنن، داوای لە خوای گەورە کرد، خوای گەورەیش وەڵامی دایەوەو ئەو تاوێرە ڕەقە جوڵاو لەت بوو حوشترێکی بۆ دەرکردن لە پێش چاوی خۆیان، ئەمە حوشترێکە کە خوای گەورە ناردوویەتی وەکو موعجیزەو نیشانەیەك ئێوە لێی گەڕێن با لە زەوی خوای گەورەدا بۆ خۆی بلەوەڕێت و قەدەغەی مەکەن، لێی نزیك مەبنەوە بە خراپە، چوونکە سزایەکی بەئێشی خوای گەورە ئێوە ئەگرێتەوە﴿٧٣﴾ یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتان کە لە دوای ئەوەی قەومی عادی لەناوبرد ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەوی، لەسەر زەویشدا جێگیری کردن و شوێنی بۆ کردنەوە لە زەوی لە خۆڵەکەی خشت ئەبڕن و کۆشك دروست ئەکەن، لەبەر بەهێزیتان شاخەکان هەڵئەکۆڵن و ئەیکەن بە ماڵ بۆ خۆتان و لەناو شاخەکاندا ماڵ دروست ئەکەن ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتانەوە لەسەر زەویدا ئاشووب و ئاژاوە مەنێنەوەو خراپەکاری مەکەن﴿٧٤﴾ باڵادەست و دەسەڵاتدارو سەرکردەو گەورەکان لە کافران و بێباوەڕان لەوانەی کە خۆیان بەگەورە ئەزانی بە خەڵکە لاوازو فەقیرو هەژارو بێدەسەڵاتەکەیان ئەوت کە ئیمانیان هێنابوو ئایا ئێوە ئەزانن صالّح لەلایەن پەروەردگارییەوە نێردراوەو کراوە بە پێغەمبەر؟! وەکو گاڵتە پێکردن و سووکایەتی پێکردن باوەڕدارە لاوازەکانیش لە شوێنکەوتوانی صالّح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەیانوت: بەڵێ ئێمە ئیمانمان پێیەتی کە لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوە و شوێنیشی ئەکەوین﴿٧٥﴾ دەسەڵاتدارو گەورەکان و خۆ بەگەورە

زانان بە باوەڕدارانیان ئەوت: ئەوەی کە ئێوە ئیمانتان پێی هێناوە کە صاڵحە ئێمە پێی کافرو بێباوەڕین﴿٧٦﴾ حوشترەکەیان سەربڕی کە خوای گەورە وەکو موعجیزە ناردبووی، (قەدداری کوڕی سالف) سەری بڕی بەڵام خوای گەورە فەرمووی هەموویان سەریان بڕی چوونکە هەموویان ڕازی بوون و ڕەزامەندیان وەرگیرابوو بە ژن و پیاوەوە سەرکەشییان کردو خۆیان بەگەورەزانی لە فەرمانی خوای گەورە وتیان: ئەی صاڵح ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوایت با ئەو سزایەی کە تۆ هەڕەشەمان لێ ئەکەی پێی ئەڵێی: لەلایەن خواوە سزاتان بۆ دێت با سزاکە بێت و پەلە بکە لە ناردنیدا﴿٧٧﴾ خوای گەورە سزای دان بەوەی تووشی بوومەلەرزەیەکی کردن لەژێریانەوەو دەنگێکی زۆر سەخت هات لە سەرروویانەوە، کە دڵی بڕین لەناو شوێن و ماڵی خۆیاندا نووسان بە زەوییەکە لەسەر ئەژنۆ و دەم و چاویان و جووڵەیان نەماو هەموو مردن﴿٧٨﴾ دوای بێئومێد بوون لێیان صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ پشتی تێ کردن و بەجێی هێشتن، یان دوای لەناوچوونیان صاڵح پشتی تێ کردن و وەکو سەرزەنشت کردن پێی فەرموون: ئەی قەومی خۆم من پەیامی خوای گەورەم پێ گەیاندن و ئامۆژگاریم کردن بەڵام ئێوە ئامۆژگاریکارانتان خۆش ناوێ﴿٧٩﴾

نموونەی دووەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾﴾ هود

واتە: بۆ لای قەومی ثەموود صاڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان ناردکە لە خۆیان بوو، قەومی ثەموود لە دوای قەومی عاد بوون و لە (حیجر) نیشتەجێ بوون، پێی وتن:ئەی قەومی خۆم ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن لەبەر ئەوەی جگە لە زاتی پیرۆزی (الله) هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێت، هەر ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی دروست کردووە، وای لێکردوون کە سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە. ئێوە داوای لێخۆشبوون لە

خوای گەورە بکەن لە تاوانەکانی پێشترتان، پاشان بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن و لە داهاتوودا تاوان مەکەن، بە دڵنیایی پەروەردگارم وەڵامدانەوەی بۆ دوعاو پاڕانەوە زۆر نزیکەو وەڵامتان دەداتەوە﴿٦١﴾ وتیان: ئەی صالح پێش ئەوەی کە تۆ بانگەوازمان بکەی بۆ یەکخواپەرستی لەناو ئێمەدا ئومێدمان پێت بوو کە ببی بە سەردارو گەورەی ئێمە، ئایا تۆ بەرهەڵستی و قەدەغەی ئەوەمان لێ ئەکەی کە ئێمە عیبادەتی ئەو شتانە بکەین کە باوك و باپیرانمان عیبادەتیان ئەکرد، ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کە تۆ بانگمان ئەکەی بۆ لای بۆ یەکخواپەرستی و لە گوماندابن﴿٦٢﴾ صالح عَلَيْهِ السَّلَامُ فەرمووی: ئەی قەومی خۆم ئایا پێم بڵێن ئەگەر من لەسەر بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو یەقین بم لەلایەن خوای گەورەوە، خوای گەورە ڕەحمی خۆی واتە پێغەمبەرایەتی پێم بەخشیوە، ئەی ئەگەر من سەرپێچی خوای گەورە بکەم و پەیامی خوای گەورە نەگەیەنم وەکو ئێوە پێم ئەڵێن ئەی کێ من سەر ئەخات و ئەمپارێزێت لە سزای خوای گەورە، ئێوە هیچ شتێك بۆ من زیاد ناکەن تەنها زەرەرمەندی نەبێ کە ئەگەر بە قسەی ئێوە بکەم زەرەرمەندی دونیاو قیامەت ئەبم﴿٦٣﴾ ئەی قەومی خۆم ئەم حوشترە کە خۆتان پێشنیارتان کردبوو، خوای گەورە لەو تاوێرە بۆی دەرکردن، جا لێیبگەڕێن و وازی لێ بێنن با لە زەوی خوای گەورە بلەوەڕێت بە خراپە دەستی بۆ نەبەن چوونکە سزایەکی نزیك ئەتانگرێتەوە ئەگەر ئێوە بە خراپە لێی نزیك ببنەوە﴿٦٤﴾ ئەوان حوشترەکەیان سەربڕی کە خوای گەورە وەکو موعجیزە ناردبووی، (قەدداری کوڕی سالف) سەری بڕی بەڵام خوای گەورە فەرمووی هەموویان سەریان بڕی، چوونکە هەموویان ڕازی بوون و ڕەزامهیندیان وەرگیرابوو بە ژن و پیاوەوە، صالح فەرمووی: تەنها سێ ڕۆژ لە شوێنی خۆتاندا بمێننەوەو بژین لە دوای ئەو سێ ڕۆژە خوای گەورە سزاتان ئەدات، ئەمە بەڵێنێکەو درۆ نییە﴿٦٥﴾ کاتێك کە سزای خوای گەورە هات صالح و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون بە ڕەحمەتی خۆمان ڕزگارمان کردن لەسەرشۆڕی و سزای ئەو ڕۆژە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بەهێزو باڵادەست و بەعیززەتە﴿٦٦﴾ ئەوانەیشی کە ستەمیان کرد دەنگێکی گەورە لە ئاسمانەوە هات و دڵی بڕین و هەموویانی کوشت، لەناو شوێن و ماڵی خۆیاندا نووسان بە زەوییەکە لەسەر ئەژنۆ و دەم و چاویان و جووڵەیان نەماو هەموویان مردن﴿٦٧﴾ وەکو ئەوەی کە هەر نیشتەجێ نەبووبێتن لەو شوێنانەداو ئاوەدانیان نەکردبێتەوە، بزانن کە قەومی ثەموود کوفریان کرد بە پەروەردگاریان دەی قەومی ثەموود هەر دووربن لە ڕەحمەتی خوای گەورە﴿٦٨﴾

نموونەی سێیەم: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴿١٤١﴾إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴿١٤٢﴾إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٤٣﴾فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴿١٤٤﴾وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴿١٤٥﴾أَتُتۡرَكُونَ

فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُواْ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾﴾ الشعراء

واته: قه‌ومی ئه‌موودیش سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانیان به‌درۆ زانی، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی باوه‌ڕیان به پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی خۆیان نه‌بوو وه‌ك ئه‌وه وایه باوه‌ڕیان به هیچ پێغه‌مبه‌رێك نه‌بووبێت﴿١٤١﴾ صاڵح پێغه‌مبه‌ر كه له هۆزو عه‌شیره‌تی خۆیان بوو پێی وتن: ئه‌وه بۆ ته‌قوای خوای گه‌وره ناكه‌ن﴿١٤٢﴾ به دڵنیایی من پێغه‌مبه‌رێكی ئه‌مینم بۆ ئێوه‌و په‌یامی خوای گه‌وره‌تان وه‌كو خۆی پێده‌گه‌یه‌نم به‌بێ زیادو كه‌م﴿١٤٣﴾ ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن و گوێڕایه‌ڵی من بكه‌ن، من له گه‌یاندنی ئایینه‌كه‌ی خوای گه‌وره‌دا داوای ئه‌جرو پاداشت و پاره له ئێوه ناكه‌م﴿١٤٤﴾ به‌ڵكو ئه‌جرو پاداشتی من ته‌نها له‌سه‌ر په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌و ته‌نها چاوه‌ڕوانی پاداشتم له‌و﴿١٤٥﴾ ئایا ئێوه واده‌زانن وازتان لێ ئه‌هێنرێ له‌و نازو نیعمه‌ته‌ی كه خوای گه‌وره پێی به‌خشیوون به ئه‌مینی بمێننه‌وه‌و مردن و سزاتان به‌سه‌ردا نه‌یات، نه‌خێر شتی وا نییه‌و خۆتان مه‌خه‌ڵه‌تێنن﴿١٤٦﴾ له‌ناو باخ و باخات و له‌سه‌رچاوه‌ی ئاو و كانی و ڕووباره‌كان هه‌روا نامێنێته‌وه﴿١٤٧﴾ له‌و كشتوكاڵانه‌ی كه هه‌تانه، له‌و دارخورمایانه‌ی كه لق و په‌له‌كانیان له‌به‌ر زۆری خورما پێوه‌ی شۆڕ بۆته خواره‌وه‌و زۆر پڕو تێكهه‌ڵكێشه، یاخود پێگه‌یشتووه‌و هاتۆته به‌رهه‌م و كه هه‌روا نامێننه‌وه﴿١٤٨﴾ له‌ناو شاخه‌كانیشدا زۆر به لێهاتوویی ماڵ دروست ئه‌كه‌ن و هه‌ڵیده‌كۆڵن بۆ فه‌خرو شانازی كردن به‌بێ ئه‌وه‌ی كه پێویستتان بێت﴿١٤٩﴾ ده‌ی ئێوه ته‌قوای خوای گه‌وره بكه‌ن و گوێڕایه‌ڵی من بكه‌ن﴿١٥٠﴾ گوێڕایه‌ڵی موشریكان مه‌كه‌ن كه ئیسراف و زیادڕه‌وییان كردووه له تاوان و شیركدا كه بانگه‌وازتان ده‌كه‌ن بۆ كوفرو شیرك و تاوان﴿١٥١﴾ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ئاشووب ئه‌گێڕن له‌سه‌ر زه‌ویدا و چاكسازی ناكه‌ن﴿١٥٢﴾ وتیان: تۆ هیچ كه‌سێك نیت ته‌نها یه‌كێك نه‌بێت له‌وانه‌ی كه جادوت لێكراوه‌و ده‌ستت لێوه‌شێندراو﴿١٥٣﴾ تۆ هیچ كه‌سێك نیت ته‌نها مرۆڤێكی وه‌كو ئێمه نه‌بێت ئیتر چۆن له‌ناو ئێمه‌دا وه‌حی بۆ تۆ هاتووه، ئه‌گه‌ر ڕاست ئه‌كه‌ی تۆ پێغه‌مبه‌ری خوایت موعجیزه‌یه‌كمان بۆ بێنه له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه﴿١٥٤﴾ له‌سه‌ر داواو پێشنیاری خۆیان خوای گه‌وره حوشترێكی له‌ناو تاوێرێك

بە زیندوویی بۆ دەرکردن کە بە چاوی خۆیان بینیان وەکو بەڵگەیەك لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی صالح عَلَيْهِ السَّلَامُ کە پێی فەرموون: ئەمە حوشترێکە ڕۆژی ئاودانی ئەو جیاوازە لە ڕۆژی چوونە سەر ئاوی ئێوەو لێی نزیك نەبنەوە لەو ڕۆژەی کە سەرەی خۆیەتی﴿١٥٥﴾ بە خراپە دەستی بۆ نەبەن، ئەو کاتە سزای ڕۆژێکی گەورە ئەتانگرێتەوە﴿١٥٦﴾ بەڵام ئەوان سەریانبڕی و دوای ئەوەی کە دڵنیا بوون سزای خوای گەورەیان بۆ دێت پەشیمان بوونەوە، بەڵام پەشیمانی سوودی بۆیان نەبوو﴿١٥٧﴾ خوای گەورە سزای دان، سزایەك کە زەوییەکەیان لە ژێردا هەژا، لە بانیشەوە خوای گەورە دەنگێکی بۆ ناردن و لەناوی بردن، بە دڵنیایی ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە، هەر چەندە زۆربەیان ئیمانیان نەهێنا﴿١٥٨﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارت زۆر بەعیززەت و باڵادەستە بۆ کافران، زۆر بەڕەحم و بە سۆزو بەزەییە بۆ باوەڕداران﴿١٥٩﴾



## موعجیزەی وشترەکەی صالّح عَلَيْهِ السَّلَامُ

پێش ئەوەی باسی وشترەکەی صالّح بکەم پێویستە ڕوونکردنەوەیەک لەسەر موعجیزە بدەم، لای هەموان ئاشکرا و زانراوە کە موعجیزە تەنها بۆ پێغەمبەرانە و لە سنووری سوننەت و یاساکانی گەردوون و سروشت دەردەچێت کە خوای گەورە بە سیستەم و پارسەنگی ڕێکی خستووە.

داواکردنی موعجیزە لە پێغەمبەران لەلایەن گەلەکانیانەوە، چەندە پێغەمبەرەکە بەهۆکاری موعجیزەکەی عەزیز و ڕێزدار دەکات، بەڵام ئەوەندەش گەلەکە و داواکارەکانی بێزراو و پلەی ئیمانی و تەنانەت دوای بڕواهێنانیان پلەی لاوازیان دەبێت لای خوای پەروەردگار.

هەمیشە ئەوانەی کە دوورن لە خوای پەروەردگار و خواناسی داوای موعجیزە دەکەن، یاخود ئەوانەی گەمژەو گەلحۆن داوای موعجیزە دەکەن، ئەوانە کە خاوەن ئەقڵ و ژیرین هەرگیز داوای موعجیزەیان نەکردووە.

نابینیت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەبوبەکر یاخود عومەر یان هەر هاوەڵێکی بەڕێزی تری پێغەمبەر داوای موعجیزەیان کردبێت، خودی پەیامەکە لەبەرچاویاندا موعجیزە بووە، ئیمانی خۆیان دانەبەزاندووە بۆ ئاستی گەلحۆ و گەمژەکان، ئەوانەی داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کرد لە کۆتاییدا هیچیان موسڵمان نەبوون.

کەواتە داواکاری لە پێغەمبەران بۆ ئەنجامدانی موعجیزە گەمژەیی گەلەکە دەردەخات، هەر گەل و هۆزو میللەتێک بەدوای شتی بینراو و بیستراو (حاسەکان) هەستەکان بوو ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەستەمە ئەنجامی هەبێت بۆ خواناسی، بەڵام ئەگەر خاوەن ئەقڵ و ژیری و بیروهزر بوون، بەدڵنیاییەوە دەگەنە ئامانج.

لەباسی وشترەکەی صالّح دا کە وەکو موعجیزە باس دەکرێت کە گوایە لە ناو بەردێکەوە هاتۆتە دەرەوە پێدەچێت تەنها وتەو چیرۆکێکی بەرئاگردان بێت، چونکە باسی وشترەکە لە قورئاندا کراوە بەڵام باس لە جۆری هاتنی وشترەکە نەکراوە، ئەوەشی کە بڵاوبۆتەوە لە کتێبەکانی مێژوو و تەفسیردا هەموو قسەو باسێکی خۆش و بێ سەرچاوەیە، هەمووشیان لە (ئەبو جەعفەری طەبەری) وەریان گرتووە.

جەنابی طەبەریش لە کەسێکی وەرگرتووە بەناوی (قاسم) ئەویش لە (حسین) و ئەمیش لە (حەجاج) و پاشان لە (ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڵلا) و لە (شەهری کوڕی حوشوب) ئەویش لە

(عەمری كوڕی خەرجە). گوایە پرسیار لە پێغەمبەر كراوە لەبارەی وشترەكەی صالّح عَلَيْهِ السَّلَامُ كە لە بەرد هاتۆتە دەرەوە، بەڵام ئەم فەرموودەیە هیچكام لە موفەسیر و فەرموودەوانەكان باسی پلەی صەحیحیان نەكردووە، لە تەفسیری ئیبن كەثیر كە جەنابی ئەرنائوطی (عبدالقادر الأرناؤوط) فەرموودەكەی لە ئیبن و كەثیر لە ژیانی پێغەمبەراندا باس نەكردووە، وەكو ئیبن كەثیر دەڵێت: تەنها كۆمەڵێك موفەسیر دەڵێن ئەو موفەسیرانە كێن ناویان نەهاتووە، پاشان سەنەدی فەرموودەكە نەك لاوازە پێدەچێت مەوزوع بێت تەنها مەجلیسی پێ خۆشكرا بێت و زۆرێك لە سەرچاوەكان سەنەد و تەخریجی فەرموودەكەیان لە كۆن و نوێ دا نەكردووە، ئەوەندەی كە من بە شوێنیدا گەڕاوم هەڵبەت خوای گەورە كە باسی وشترەكەی كردووە داویەتیە پەنای زاتی بەرزی كە خاوەنیەتی (ناقە الله) وەكو (بيت الله)، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات كە ئەم وشترە خاوەنی پێناسە و وەصفی تایبەت بووە، خوای گەورە وەكو نیشانەو موعجیزە لەناویاندا ژیاندوێتی، هەروەكو جەنابی سەید قوطب ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت ڕۆناچین تێیدا مادام هیچ بەڵگەمان لە بەردەستدا نییە.

لێرەدا وەكو ئەمانەتی زانستی باسمان كرد كە لە ڕووی ئایینییەوە هیچمان لە بەردەست نییە لەسەر ئەم وشترە لە چۆنیەتی و ژیانی و دروستبوونی و جۆری موعجیزەیەتی، سەرچاوەكان هەموو ناتەندروستن كە لەسەر ئەو باسە هاتووە، بەڵام سەرچاوە ناتەندروستەكانیش دەگوازمەوە هەروەكو باسێكی مێژووی.

## وتە بێ سەرچاوەكان

لە كتێبە مێژوویەكاندا هاتووە بەتایبەت مێژووی طەبەری و بیدایە و نیهایەی ئیبن و كەثیر و هەروەها (الكامل في التاريخ)ی ئیبن ئەثیری جزیری...هتد.

كە صالّح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بانگەوازی دەكردن بۆ خواپەرستی و یەكتاپەرستی ئەوان داوای موعجیزەیان كرد كە لەو بەردە وشترێك بهێنێتە دەرەوە ئەگەر پێغەمبەرە؟

صالّحیش داوای كردووە لەخوای پەروەردگار كارەكەی بۆ ئەنجام داوە.

مەرجی ئەنجامدانی كارەكەش ئەوەبوو ڕۆژێك ئاو خواردن بۆ وشترەكە بووە، ڕۆژێكیش بۆ ئەو گەلە.

دیارە هۆکاری سەربڕینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکێشی و بەخیلی و حەسوودی ئەو هۆزە، چونکە ئاویان کەم بووە ئەگەرچی وەکو لەباسە بێ سەرچاوەکەدا هاتووە کە شیری داوەتە هەموو خەڵکەکە، بەڵام ئەوان خراپەکار بوون سەریان بڕیوە.[٧٩]

## کۆی گشتی باسی صاڵح پێغەمبەر عَلَيهِالسَّلَامُ

شەهید سەید قوطب لە کتێبە نایابەکەیدا (لە سایەی قورئان)[٨٠] دا دەڵێت: هەموو ڕستەی یەکخواپەرستی پێغەمبەران لەیەکچووە، لەسەردەمی ئادەم عَلَيهِالسَّلَامُ تا کۆتایی ئەم ژیانە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت هەموو خاوەنی یەک بەرنامە و مەنهەج بوون.

هەر بۆیە لە سەرەتا ئاماژەم بەوە کرد کە ژیانی پێغەمبەران هەموو لەیەک دەچن و یەک ئامانجیان هەبووە، ئامانجی سەرەکییان خواناسی بووە بە یەکتاپەرستی، بڵاوکردنەوەی یاسا و شەریعەتەکانی خوای موتەعال.

ژیانی نووح، هوود و صاڵح سەلامی خوا لەهەموویان بێت زۆر لێکچوونی پێوە دیار بووە، کە زۆرجار وا هەست دەکەیت، جێگای نووح بە (جودی) دیاری کردووە لە دوای لافاوەکە، هەروەها جێگای پێغەمبەر هوود بە (الأحقاف) و پێغەمبەر صاڵح ناوچەکەی بە (حیجر) بووە، تەنانەت دوو سورەت بەناوی جێگاکانیانەوە ئەمەش جۆرێکە لە موعجیزەی قورئانی کە زۆر بە وردی و دەقیقی جێگاکەی دەست نیشان کردووە، ژیانی ئەم دوو پێغەمبەرە بێجگە قورئان لە کتێبە ئایینییەکانی تردا باس نەکراوە، دەست نیشان کردنی جێگاکەیان لە قورئاندا و پاشان دۆزینەوەی شوێنەوارەکانیان ئاماژەی ڕاستی و دروستی باسە مێژووییە قورئانیەکانە بە ڕەهایی، چونکە زۆرێک لەو شوێنەوارانە لەسەردەمی نوێ دۆزراونەتەوە.

---

[٧٩] ذكر المفسرون: أن ثمود اجتمعوا يوما في ناديهم، فجاءهم رسول الله صالح، فدعاهم إلى الله، وذكرهم وحذرهم و وعظهم وأمرهم، فقالوا له: إن أنت أخرجت لنا من هذه الصخرة، وأشاروا إلى صخرة هناك، ناقة من صفتها كيت و كيت، وذكروا أوصافا سموها ونعتوها وتعنتوا فيها، وأن تكون عشراء طويلة، من صفتها كذا وكذا، فقال لهم النبي صالح عليه السلام: أرأيتم إن أجبتكم إلى ما سألتم على الوجه الذي طلبتم، أتؤمنون بما جئتكم به و تصدقوني فيما أرسلت به< قالوا: نعم، فأخذ عهودهم و مواثيقهم على ذلك، ثم قام إلى مصلاه فصلى الله عز وجل ما قدر له، ثم دعا ربه عز وجل أن يجيبهم إلى ماطلبوا، فأمر الله عز وجل تلك الصخرة أن تنفطر عن ناقة عظيمة عشراء، على الوجه المطلوب الذي طلبوا، على الصفة التي نعتوا، فلما عاينوها كذالك، رأوا أمرا عظيما ومنظرا هائلا، وقدرة باهرة و دليلا قاطعا، وبرهانا ساطحا، فآمن كثيت منهم، واستمر أكثرهم على كفرهم وضلالهم و عنادهم، ولهذا قال: (فَظَلَمُوا بِهَا) أي: جحدوا بها، ولم يتبعوا الحق بسببها، أي أكثرهم، ولهذا قال لهم صالح عليه السلام (هذه ناقة الله) أضافها الله سبحانه وتعالى، إضافة تشريف وتعظيم، كقوله: بيت الله، وعبد الله (لكم أية) أي: دليلا على صدق ما جئتكم به (فذروها تأكل في أرض الله ولا تمسوها بسوء فيأخذكم عذاب ألأعراف / ٧٣). **في الظلال القرآن/ سيد القطب.**

هێشتنەوەی جێگاکان نیشانەیە بۆ ئێمە کە خوای گەورە نیشانمان دەدات و پێمان دەڵێت ئەوانە شوێنەواری تاوانن، مرۆڤ دەبێت لێی بترسێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی سەردانی ئەو ناوچەیەدا نەیهێشت هیچ کەس لە سوپاکەی لەو ناوچەیە بمێنێتەوە و تەنانەت ئاوی ناوچەکەش بخۆنەوە، نەیهێشت خواردنیش بە ئاوەکە دروست بکەن، ئەگەرچی سوپاکەی برسی و تینوو بوون!

ئەم گەلە پاشماوەی عاد بوون باپیری پێنجەمی پێغەمبەر صالح عَلَيْهِ السَّلَام ثەموودە، ثەموودیش کوڕی پێغەمبەر هوود عَلَيْهِ السَّلَام بوو، کەواتە دروستکردنەوەی کۆمەڵگەیەک لەو جێگایەدا بەفەرمانی خوای پەروەردگار بووە، هەمان کارو پیشەی هۆزی (عاد)یان بووە، دەست ڕەنگین بوون لە دروستکردنی باڵەخانەو قەڵای گەورە گەورە لەسەر شاخ و گرد و تەپۆڵکەکاندا، ئەمەش نیعمەتێکی خوای پەروەردگارە کە بەخشیویەتی پێیان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾﴾ الأعراف

واتە: یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتان کە لە دوای ئەوەی قەومی عادی لەناوبرد، ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەوی، لەسەر زەویشدا جێگیری کردن و شوێنی بۆ کردنەوە، لە زەوی لە خۆڵەکەی خشت ئەبڕن و کۆشك دروست ئەکەن لەبەر بەهێزیتان شاخەکان هەڵئەکۆڵن و ئەیکەن بە ماڵ بۆ خۆتان و لەناو شاخەکاندا ماڵ دروست ئەکەن ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتانەوە لەسەر زەویدا ئاشووب و ئاژاوە مەنێنەوەو خراپەکاری مەکەن.

لەدوای دروستبوونەوەیان لەو ناوچەیەدا هەڵبەت مەبەست جێنشینبوونیانە وەکو کۆمەڵگە کە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، گومانی تێدا نییە شەیتان هەمیشە لە بۆسەدایە بۆ ئیمانداران، دیسان دوای یەک جیل و نەوە خراپەو شیرکی خستەوە ناو گەل و هۆزی ثەموود و خەڵکی دەستیان کردەوە بە بت پەرستی، جا ئەم گەلەش خاوەنی چەند بتێک بوون لەوانە (ود، جد، هد، شمس، مناف، مناة، لات و...هتد).

ناوی ئەم بتانە لە کتێبی ژیانی پێغەمبەرانی (عفیف عبدالفتاح الطبارة) هاتووە کە ئەو گەلە خاوەنی ئەم بتانە بوون، ئەویش لە مێژووی عەرەب پێش ئیسلام کە کتێبێکە (د. جواد علي) نوسیوویەتی (تأريخ العرب قبل الإسلام) هاتووە.

هەڵبەت هەر هەمان بت کە بەناوبانگ بوون لەو ناوچەدا، لە هەر جێگاو ناوچەیەک ناوی تایبەتی لێ نراوە.

چۆن ئەوان لەسەر بنەمای بتە کۆنەکانی هۆزگەری نووح و عاد پەرستشیان کردووە، ئیسلام و ئایینی پێغەمبەران یەک ڕێگاو مەنهەجی هەیە، خوای گەورە بۆمان باس دەکات دیمەنی بانگەوازی پێغەمبەر صالح عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان بۆ دەگێڕێتەوە لە قورئاندا و دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾﴾ هود

واتە: صالح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ -مان نارد بۆ لای قەومی ثەموود کە لە خۆیان بوو، قەومی ثەموود لە دوای قەومی عاد بوون و لە (حیجر) نیشتەجێ بوون لە نێوان (تەبووك و مەدینە) پێی وتن: ئەی قەومی خۆم ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن لەبەر ئەوەی جگە لە زاتی پیرۆزی الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نیە کە شایەنی پەرستن بێت هەر ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی دروست کردووە، وای لێکردوون کە سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لە تاوانەکانی پێشترتان پاشان بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن و لە داهاتوودا تاوان مەکەن، بە دڵنیایی پەروەردگارم وەڵامدانەوەی بۆ دوعاو پاڕانەوە زۆر نزیکەو وەڵامتان دەداتەوە.

هەر هەمان ڕستەو وتەیە کە پێغەمبەرانی پێش خۆی دووبارەیان کردبووەوە، هەروەها خوای گەورە وشەی (قوم)ی بەکار هێناوە، نێر و مێ دەگرێتەوە ئەویش بۆ پاداشت و تەوبەکردنە، بەڵام کە دێتە بواری جێبەجێکاری و تەکلیفکردن تەنها گوتارەکە لەگەڵ پیاوانە، ئافرەتان دەچنە ناوی، واتا بە پیاو پلەی یەکەم بەرپرسە لە دیندا، وەکو ئایینی یەهوودی و نەسرانی نییە، هەرچی خراپەکارییە بیخەنە سەر ئافرەتان و پیاوانیش لێی دەربچن، هەر لە حەواوە بە تاوانبار دادەنرێت تا کۆتا ئافرەت کە گوایە ڕۆحی شەیتان بەشێکە لە ڕۆحیان و تێکەڵاوی لاشەیان دەبێت.

خوای پەروەدگار لە پاداشتدا پیاو و ژنی وەکو یەک یەکسان کردووە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾ الأحزاب

(ئوم عومارەی ئەنصاری) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا وتی: هەموو شتێك تەنها باسی پیاوانەو نابینم باسی ئافرەتان بکرێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، (ئوم سەلەمەی) خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمەی ئافرەتان لە قورئاندا باس ناکرێین وەکو پیاوان کە باس دەکرێن؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، واتە: بەڕاستی پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوانی باوەڕدارو ئافرەتانی باوەڕدار و پیاوانی خواپەرست و گوێڕایەڵ و ئافرەتانی خواپەرست و گوێڕایەڵ پیاوانی ڕاستگۆ و ئافرەتانی ڕاستگۆ پیاوانی ئارامگرو ئافرەتانی ئارامگر، پیاوانی خۆبەکەمزان و ئافرەتانی خۆبەکەمزان، یان لە عیبادەتدا ملکەچ بۆ خوای گەورە پیاوانی خێرخوازو ئافرەتانی خێرخواز، پیاوانی ڕۆژووەوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان، ئەو پیاوانەی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن، ئەو ئافرەتانەیشی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن، ئەو پیاوانەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە ئەکەن، ئەو ئافرەتانەی کە زۆر زیکرو یادی خوای گەورە ئەکەن لە هەموو حاڵەتێکیاندا، ئا ئەمانە بە ژن و پیاوەوە خوای گەورە لێخۆشبوون و ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردوون.

لە ئایەتەکەی سورەتی هوود دا خوای گەورە ئەرکی ئاوەدانی و شارستانییەتی پێدابوون دەفەرموێت: {...هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا...}، هەر میللەتێک خاوەنی بیروباوەڕی دروست بوو، هەوڵی دا بۆ ئاوەدانی، خوای گەورە پێی دەبەخشێت، لەهەمان کاتدا هەر میللەتێک خاوەنی بیروباوەڕ بوو، هەوڵی دا بۆ شارستانییەت و ژیار با بیروباوەڕەکەی تەندروست نەبێت هەر سەردەکەوێت.

نموونەی وڵاتانی پێشکەوتووی دنیا وەکو ڕۆژئاوا و یابان و چین و...هتد. هەموو ئەمانە ئەگەرچی خاوەن بیروباوەڕی تەندروست نین، بەڵام چونکە هەوڵیان بۆ زانست بووە، ژیان و ژیار و شارستانییەتیان لەناودا بوو، داوای لێ دەکردن کە سەرەڕۆ نەبن و ئەرکەکەیان جێبەجێ بکەن تا خوای گەورە بیانکاتە خەلیفە و جێنشین بینەوە لەسەرزەوی، بەڵام تاکە مەرجێک بۆ ئەوان تۆبەکردن بوو پاشان ئایەتەکە دەفەرموێت: { فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ}، کەچی هۆزی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ داوای شتی نامەعقولیان دەکرد، هاتن وتیان ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت و دەستت لێ نەوەشاوە لە ڕێگای سیحر و جادووەوە وشترێکمان بۆ بهێنە کە جیاواز بێت لە وشترەکانی ترمان (عەفیف عەبدو لفتاح طەبارە) دەڵێت: داواکەیان لەسەر وشترێکی سوور بوو کە دەبێت لە هەموو وشترەکانی گەورەتر بێت و شیری زیاتر بدات.

لەناو گەلی ثەموود وشتر زۆر خۆشەویست بوو، لە مێژووەکاندا هاتووە کە گوایە خوای پەروەردگار وشترێکی زۆر گەورەی لەناو وشترەکانیاندا خستۆتەوە یان داوایان کرد ئەگەر تۆ پێغەمبەری لەو بەردە وشترێکمان بۆ دەربهێنە یاخود بۆ خەلق بکە! هەڵبەت مەبەست لە ڕێگای خوای پەروەردگارەوە، ئەم داوایەیان لە ئەنجامی بەردەوامی بانگەوازی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ

هاتووە ئەوان بۆیە داوای شتێکی وا دەکەن کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ نییە، هەرچەندە پێشتر کەسێکی خۆشەویست و خوازراو بوویت لەناوماندا بەڵام ئێستا بێزراویت داوامان لێ دەکەیت واز لە خواکانمان بهێنین کە باووباپیرانمان پەرستویانە، ﴿قَالُواْ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی صاڵح پێش ئەوەی کە تۆ بانگەوازمان بکەی بۆ یەکخواپەرستی لەناو ئێمەدا، ئومێدمان پێت بوو کە ببی بە سەردارو گەورەی ئێمە، ئایا تۆ بەرهەڵستی و قەدەغەی ئەوەمان لێ ئەکەی کە ئێمە عیبادەتی ئەو شتانە بکەین کە باوك و باپیرانمان عیبادەتیان ئەکرد ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کە تۆ بانگمان ئەکەی بۆ لای، بۆ یەکخواپەرستی و لە گوماندایـن.

پاشان بەوە تاوانبار دەکرا کە ئەو مرۆڤەو (بەشەرە) ئیتر چۆن پەیامی خوای بڵاودەکاتەوە موعجیزەی دەبێت هەبێت، وتیان ئەگەر ڕاست دەکەیت هەموو لای بەردەکە کۆبوونەوە کە داوایان کرد وشترەکەی تێدا دەربهێنرێت، پێغەمبەر صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ بە وەحی ئاگادار کراوەتەوە، کە خوای گەورە ئەو وشترەی ئەوان باسی دەکەن لەو بەردە دەردەهێنێت، یاخود لەناو وشترەکانیاندا ئەژیت و پاشان لە دایک دەبێت، بەڵام کە هات مەرجی هەیە دەبێت ئێوە ڕۆژێک لەسەر بیری ثەموود ئاو بخۆنەوە ڕۆژێکیش بۆ وشترەکە.

هەموو بە پێکەنینەوە وتیان باشە.

خوای گەورە وشترەکەی بۆ ناردن هەڵبەت نووسەر ڕای (عەفیف عەبدولفەتاح طەبارە)ی لەپەسەند ترە، تا ئەوەی کە لە بەرد هاتبێتە دەرەوە، چونکە دەڵێت: وشترێکی سووری زەبەلاح بوو هەموو لێی دەترسان، لەگەڵ ئەوەشدا وشترێکی نەجیب و لەسەرخۆ بوو لە وشترەکانی تر لەدایک بوو.

خوای گەورە ئەو موعجیزەی بۆ ناردن و لەسەر زمانی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مُرْسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾﴾ القمر

واتە: خوای گەورە ئەفەرموێت: لەسەر داواکاری و پێشنیاری خۆیان ئێمە لە تاوێرێکی ڕەقەوە حوشترێکمان بۆ دەرکردن وەکو تاقیکردنەوەیەك، تا ببێتە موعجیزەیەك لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی صاڵح، تۆ چاوەڕێ بەو بزانە ئەوان چی ئەکەن و ئارام بگرە لەسەر ئەو ئازارانەی

کە ئازارت پێ ئەگەیەنن، سەرەنجام و سەرکەوتن لە دونیاو قیامەت بۆ تۆیە(٢٧) پێیشیان ڕابگەیەنە کە چوونە سەر ئاوە دابەشکراوەکە لە نێوانیاندا: ڕۆژێك حوشترەکە ئەچێتە سەر ئاو با ئەوان نەچن، ڕۆژێکیش حوشترەکە ناچێت ئەوان ئەچن، هەر کەسێك بەشی خۆی هەیە لە ئاوەکە، بەڵام ئەوان وایان نەئەکرد ئەو ڕۆژەی سەرەی خۆیان بوایە ئەڕۆیشتن، ئەوەیشی سەرەی حوشترەکە بوو ئەڕۆیشتن ئەیاندۆشی(٢٨)

داواکرنی موعجیزە هەروا سادە و ساکار نییە، کەواتە تۆ مەرج لەسەر دینداری و نیشانەی پرسیار لەسەر خوا و پێغەمبەر دادەنێیت، کەواتە لەبەرانبەردا خوای موتەعالیش مەرجت لەسەر دادەنێت، مەرجەکەش ئاو خواردنەوەی هۆز و وشترەکەیە بە (نۆرە)نۆبە ئاو بخۆنەوە.

ئەو موعجیزەی ئەوان لایان سەیر بوو هاتە دی و لەبەرچاویاندا بوو، هەر هۆکاری ئەو موعجیزەیە بوو سەرۆکی یەکێک لە تیرەکانی عاد ئیماندار بوو بەناوی (جندع بن عەمر بن مخلاة بن لبید بن جواس) دوانی تریش لە سەرۆکی تیرەکانی هۆزی عاد زۆر دژایەتیان کردن ئەوانیش (ذؤاب بن عمر بن لبید) بوو کە خاوەنی زۆرێک لە بتەکانی عاد بوو لەگەڵ کەسێکی تر بەناوی (ورباب بن صمعر بن جلهس).

(جەندەع) ئامۆزایەکی بانگکرد بۆ ئایینی ئیسلام کە ئەوکات صالح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو، بەناوی (شیهابی کوڕی خەلیفە) کە ئەویش یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی عاد، بەڵام زۆرێک لە سەرۆکەکانی تر پەشیمانیان کردەوە و ڕێگایان لێگرت، ئەگەر شیهاب ئیماندار بوایە، زۆربەی هۆزەکە خواناس و ئیماندار دەبوون، بۆیە یەکێک لە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە پارچە شیعرێکی نوسیووە دەڵێت: لە بنەماڵەی عامر و ئەگەر شیهاب موسڵمان بوایە ئەوا ئەموود عەزیز دەبوو هەروەها صاڵحیش، بەڵام شیهاب گوێی بۆ زوئاب گرت، ئەقڵ و هۆشی وەکو مێش هەڵفڕی.

دەقی شیعرەکەی میهراشی کوڕی عەنیمەتی کوڕی زەمیل کە یەکێک بوو لە ئیماندارانی ئەو هۆزە دەڵێت.[٨١]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨١] وقد ذكر المفسرون أن ثمود اجتمعوا يوما في ناديهم ، فجاءهم رسول الله صالح فدعاهم إلى الله وذكرهم وحذرهم ووعظهم وأمرهم ، فقالوا له : إن أنت أخرجت لنا من هذه الصخرة وأشاروا إلى صخرة هناك ناقة من صفتها كيت وكيت ، وذكروا أوصافا سموها ونعتوها وتعنتوا فيها ، وأن تكون عشراء طويلة من صفتها كذا وكذا. فقال لهم النبي صالح عليه السلام : أرأيتم إن أجبتكم إلى ما سألتم على الوجه الذي طلبتم أتؤمنون بما جئتكم به . وتصدقوني فيما أرسلت به . قالوا: نعم، (ص: ٣١١)، فأخذ عهودهم ومواثيقهم على ذلك ، ثم قام إلى مصلاه فصلى لله عز وجل ما قدر له ، ثم دعا ربه عز وجل أن يجيبهم إلى ما طلبوا فأمر الله عز وجل
<===

هەروەکو چۆن لەناو گەلانی ڕابردوودا چینی دەوڵەمەند و هەژار جیاوازی لە نێوانیاندا دەکرا، لەناو هۆزی صاڵحیش دا عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەو چینایەتییە بەدی دەکرێت، ئەوانەی کە هەژار و لاوازەکان بوون داکۆکیان لە ئیمان و بیروباوەڕی خۆیان دەکرد، لەهەمان کاتدا بە ئاشکرا بیروباوەڕی خۆیان دەخستە ڕوو. دەشێت ئەمەش بگرێتەوە بەو هۆکارەی کە گەورە پیاوێکی ناو هۆزەکە ئیمانی هێنابوو، بۆیە هەژارەکانیش ڕای خۆیان بە ڕاشکاوانە دەوت، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾﴾ الأعراف

واتە: باڵادەست و دەسەڵاتدارو سەرکردەو گەورەکان لە کافران و بێباوەڕان لەوانەی کە خۆیان بەگەورە ئەزانی بە خەڵکە لاوازو فەقیرو هەژارو بێدەسەڵاتەکەیان ئەوت کە ئیمانیان هێنابوو، ئایا ئێوە ئەزانن صاڵح لەلایەن پەروەردگاریەوە نێردراوەو کراوە بە پێغەمبەر؟! وەکو گاڵتە پێکردن و سووکایەتی پێکردن باوەڕدارە لاوازەکانیش لە شوێنکەوتوانی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەیانوت: بەڵێ، ئێمە ئیمانمان پێیەتی کە لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوە و شوێنیشی ئەکەوین﴿٧٥﴾ دەسەڵاتدارو گەورەکان و خۆ بەگەورە زانان بە باوەڕدارانیان ئەوت ئەوەی کە ئێوە ئیمانتان پێی هێناوە کە صاڵحە ئێمە پێی کافرو بێباوەڕین﴿٧٦﴾

ئینجا کە وردە وردە خەڵکی ئیماندار لە دەوری صاڵح پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ کۆبوونەوە پیاوانی دەسەڵاتدار، خاوەنی بەرژەوەندی و سەروەت و سامان پڕۆژەکانیان بەرەو لەناوچوون دەچوون (نۆ) پیاو لەناو گەلی ثەموود دا دەستڕۆشتوو بوون و بڕیاری لە ناوبردنی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ و

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

تلك الصخرة أن تنفطر عن ناقة عظيمة كوماء عشراء على الوجه المطلوب الذي طلبوا وعلى الصفة التي نعتوا ، فلما عاينوها كذلك رأوا أمرا عظيما ، ومنظرا هائلا ، وقدرة باهرة ، ودليلا قاطعا ، وبرهانا ساطعا فآمن كثير منهم، واستمر أكثرهم على كفرهم وضلالهم وعنادهم ؛ ولهذا قال: فظلموا بها، أي جحدوا بها ، ولم يتبعوا الحق بسببها . أي أكثرهم ، وكان رئيس الذين آمنوا جندع بن عمرو بن مخلاة بن لبيد بن جواس، وكان من رؤسائهم، وهم بقية الأشراف بالإسلام فصدهم ذؤاب بن عمر بن لبيد ، والحباب صاحب أوثانهم ، ورباب بن صمعر بن جلهس ، ودعا جندع ابن عمه شهاب بن خليفة ، وكان من أشرافهم فهم بالإسلام فنهاه أولئك فمال إليهم .
فقال في ذلك رجل من المسلمين يقال له: مهرش بن غنمة بن الدميل رحمه الله شعرا:

وكانت عصبة من آل عمرو إلى دين النبي دعوا شهابا
عزيز ثمود كلهم جميعا فهم بأن يجيب ولو أجابا
لأصبح صالح فينا عزيزا وما عدلوا بصاحبهم ذؤابا
ولكن الغواة من آل حجر تولوا بعد رشدهم ذئابا

هەموو ئەم زانیاریانە لە کتێبی (البداية و النهاية) ابن كثير وەرگیراوە.

وشترەکەیان دا، هەڵبەت بە دوو پلانی چەپەڵ هەڵسان یەکەم کوشتنی خودی ئەو موعجیزەیەی داوایان کردبوو کە بریتییە لە وشترەکە، پاشان بە بیانووی ئەوەی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ بەرگری لە وشترەکە دەکات خۆشی بکوژن، لە شەودا هەموو بەیەکەوە هەر نۆ کەسەکەیان سوێندیان خوارد کە پلانەکە جێبەجێ بکەن و لەشەودا صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ بکوژن.

پلانی یەکەم: کوشتنی وشترەکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴿٧٧﴾﴾ الأعراف

واتە: حوشترەکەیان سەربڕی کە خوای گەورە وەکو موعجیزە ناردبووی، (قەدداری کوڕی سالف) سەری بڕی بەڵام خوای گەورە فەرمووی هەموویان سەریان بڕی، چوونکە هەموویان ڕازی بوون و ڕەزامەندیان وەرگیرابوو بە ژن و پیاوەوە سەرکەشییان کردو خۆیان بەگەورەزانی لە فەرمانی خوای گەورە وتیان: ئەی صاڵح ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوایت با ئەو سزایەی کە تۆ هەڕەشەمان لێ ئەکەی پێی ئەڵێی: لەلایەن خواوە سزاتان بۆ دێت با سزاکە بێت و پەلە بکە لە ناردنیدا.

لەگەڵ ئەنجامدانی تاوانەکە ئەوەندە سەرسەخت و ناپەسەند بوون وەکو تەحەداکردنی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ داوای سزای خوایان دەکرد، هەڵبەت وەکو شێوەیەک لە بەدرۆخستنەوە بوو، خوای گەورە سەربڕینی وشترەکەی خستە پاڵ هەموو بەشداربووەکان ئەگەرچی یەک کەس هەڵساوە بەکارەکە، بەڵام چونکە پلانەکە لەلایەن هەموویانەوە داڕێژرا کەواتە هەموو بەشدارن تێیدا.

پاشان دەربارەی سزاکە کە خوای گەورە مۆڵەتی دانێ دەفەرموێت: ﴿فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴿٦٥﴾﴾ هود

واتە: ئەوان حوشترەکەیان سەربڕی کە خوای گەورە وەکو موعجیزە ناردبووی، صاڵح فەرمووی: تەنها سێ ڕۆژ لە شوێنی خۆتاندا بمێننەوەو بژین لە دوای ئەو سێ ڕۆژە خوای گەورە سزاتان ئەدات، ئەمە بەڵێنێکەو درۆ نییە.

پلانی دووەم: کوشتنی پێغەمبەر صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ هەر لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کە مۆڵەت درابوون، هەڵسان لە شەوی کۆتاییدا کە خودی حەزرەتی صاڵح عَلَيْهِ السَّلَامُ بکوژن، خوای گەورە پلانی دووەمیان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا

لَصَٰدِقُونَ﴿٤٩﴾وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴿٥١﴾فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ﴿٥٢﴾﴾ النمل

واتە: لەو شارەیشدا نۆ کەس هەبوون لە دەسەڵاتداران کە بە ڕاوێژی ئەمان (قەدداری کوڕی سالف) وشترەکەی سەربڕی ئەوانە ئاشووبیان دەگێڕاو ئاژاوەیان لەسەر زەویدا ئەنایەوە هیچ کاتێك چاکسازییان نەئەکرد﴿٤٨﴾ دوای سەربڕینی وشترەکە وتیان: وەرن با سوێند بخۆین بە خوای گەورە بۆ یەکتری بە دڵنیایی ئەبێ لەناکاودا بدەین بەسەر صاڵح و کەسوکاریداو بیانکوژین، پاشان بە دڵنیایی بە کەسوکاریان ئەڵێین و سوێندیان بۆ ئەخۆین کە ئاگامان لە کوشتنی ئەمان نییەو ئێمە ئاگادار نین کە کوژراون و ئێمە نەمان کوشتون بە دڵنیایی ئێمە لەم قسەیەدا ڕاستگۆین﴿٤٩﴾ خوای گەورەش لە دژی ئەوان و لەبەرامبەر نەخشەو پیلانی ئەوان نەخشەو پلانی بۆ دانان، بەڵام ئەمان هەستیان نەکرد بە نەخشەو پلانی خوای گەورە﴿٥٠﴾ بزانەو تەماشا بکە سەرەنجامی نەخشەو پیلان دانانی ئەوان چی بوو، ئێمە ئەوان و قەومە کافرەکەیانمان هەر هەموویان بە تێکڕا لەناوبرد﴿٥١﴾ ئا ئەوە ماڵەکانیانە چۆڵ و وێران و خاپورەو کەسی تیا نییە بەهۆی زوڵم و ستەمی خۆیان، واتە: بەهۆی شەریك دانانیان بۆ خوای گەورە بە دڵنیایی ئەمە هەمووی نیشانەو بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی و تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە بەڵام بۆ کەسانێك کە زانیارییان هەبێ و بزانن﴿٥٢﴾

خوای گەورە پلانی کوشتنی صاڵح عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ هەڵوەشاندەوە بە ئاگر و دەنگی لەڕادەبەدەر لە ئاسمانەوە کە ئەمەش لە ڕێگای هەورە بروسکەوە بووە کە ناوی ناوە بە (صاعقة) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمۡ يَنظُرُونَ﴿٤٤﴾﴾ الذاريات.

واتە: ئەوانیش سەرکەشی و خۆبەگەورەزانییان کرد لە فەرمانی خوای گەورە، ئەمانیش خوای گەورە سزاو دەنگێکی بۆ ناردن و لەناوی بردن و ئەوان تەماشایان ئەکردو بەچاوی خۆیان سزاکەیان بینی.

ئەویش بەتاڵکردنەوەی ئەو بارگە کارەبایەیە کە لەنێوانی (سارد و گەرم) یان (موجەب و سالب) دروست دەبێت کە یەک دەگرن لەگەڵ تەنێکی سەرزەوی جا ئەو تەنە مرۆڤ بێت باڵەخانە و هەر ماتریاڵێک بێت دەیسوتێنێت و وێرانی دەکات، ئەو دەنگ و ئاگرە کاریگەری لەسەر ڕزاندنی زەویش هەیە بۆیە خوای گەورە ناوی ناوە بە (رجفة) پاشان دەنگەکان ئەوەندە

بەهێز و گەورە بوو لەڕادەبەدەر، بۆیە ناونراوە بە (طاغية) ئەو دوو دیاردە دەبێتە هۆکاری هات و هاوار و قیژەی ئەو گەلە خوای گەورە بە (صيحة) ناوی بردووە و دەفەرموێت:

﴿وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ٦٧﴾ هود

واتە: ئەوانەیشی کە ستەمیان کرد دەنگێکی گەورە لە ئاسمانەوە هات و دڵی بڕین و هەموویانی کوشت.

هەروەها دەبارەی دەنگە لە ڕادەبەدەرەکە دەفەرموێت:

﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ٥﴾ الحاقة

واتە: قەومی ثەموود کە قەومی صاڵح پێغەمبەر بوون، خوای گەورە بەهۆی تاوانەکەیانەوە لەناوی بردن، یاخود سزایەکی بۆ ناردن کە دەنگێك بوو هەموو سنوورەکانی بەزاندو بەو دەنگە لەناوی بردن.

لەبارەی لەرزاندنی دەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ٧٨﴾ الأعراف

واتە: خوای گەورە سزای دان بەوەی تووشی بوومەلەرزەیەکی کردن لەژێریانەوەو دەنگێکی زۆر سەخت هات لە سەروویانەوە کە دڵی بڕین لەناو شوێن و ماڵی خۆیاندا نووسان بە زەوییەکە، لەسەر ئەژنۆ و دەم و چاویان و جووڵەیان نەماو هەموو مردن.

پێدەچێت لەناوبردنی هۆزی ثەموود زیاتر بەهۆکاری پلانی کوشتنی حەزرەتی صاڵح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ و باوەڕنەبوونیان بە یەکتاپەرستی بووە، هۆکاری لەناوچوونیان نەک لەبەر وشترێک.

لەدوای لەناوچوونی هۆزی ثەموود، صاڵح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ کۆچی کرد بۆ ناوچەکانی مەککە و دەوروبەری مەککە دا ژیا تاکو وەفاتی کرد.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەبوبەکر ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت باس دەکات و دەفەرموێت: ئەبوبەکر ئەم جێگایە کوێیە؟ ئەویش دەڵێت: دۆڵی (عسفان)ە ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: هوود و صاڵح بەم دۆڵەدا ڕەت بوون

بۆ حەج و بۆ ماڵی خوا و دروشمەکانی حەجیان بەجێ هێناوە. دیارە پێغەمبەریش ﷺ بۆ حەج تەشریفی بردووە لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵی[٨٢].

لەدوای سەردەمی صالح عَلَيْهِ السَّلَامُ ژیان لەسەرزەوی و ناوچەی نێوان سند و هند و ڕافیدەین و نیل زۆر زیادی کرد، کشتوکاڵ و شار و شارۆچکە پەرەی سەند، شارستانییەت دەستی پێکرد و بابل و ئوور و ئەکەدی و ئاشووری هەموو بوونە خاوەنی جێگاو خاکی خۆیان لە وڵاتی میزۆپۆتامیا و لەڕۆژهەڵات و وڵاتی فارس و هیند و چین پەرەیسەند و کە ڕۆژئاوا لە خواری ئەنادۆڵ واتا کوردستانی ئێستای بن دەستی تورکیا و شام و میسر کە ئەوکات بە قیبط یاخود ئێجیپت ناسراو بوو، هەرچەندە ئێستاش بە زمانی ئینگلیزی هەر بە ئێجیپت ناودەبرێت بەناوی گەلەکە نەک خاکەکەی، بەڵام قورئان بەناوی خاکەکەی ناوی بردووە بە (مصر).

قۆناغی دوای شارستانییەت بۆ پێغەمبەران سەخت دەبێت و دەربەدەر دەکرێن، بەڵام ئەوان سەلامی خوایان لێ بێت هەر بەردەوام بوون لە بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و ناسینی شەریعەتی خوای پەروەردگار.

## پاشکۆیەک بۆ وەڵامدانەوەی گومان

هەندێک لە شارەزاو پسپۆڕانی مێژووی مرۆیی کە ناسراون بە (ئەنثرۆپۆلۆجیا) یاخود زانستی شوێنەوارناسی (ئارکۆلۆژیا) ئایین بە گوێرەی پەرەسەندنی سەردەم و کات و جێگا ناوزەدی دەکەن کە گوایە بەسێ قۆناغی سەرەکی تێپەڕی کردووە.

سەردەم و پەرەسەندنی یەکەم بریتی بووە لە فرەخوایی (دور التعدد)[٨٣]

قۆناغی پەرەسەندنی ناوەند، یاخود دووەم جیاکاری و هەڵبژاردە و شکانەوە لەلایدا بە واتای کۆتایی ڕەواج پێدان (دور التمييز و الترجيح) [٨٤]، قۆناغی پەرەسەندن یەکانەی خوا و یەکتاپەرستی (دور الوحدانية).[٨٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٨٢) فلما مر رسول الله- صلى الله عليه وسلم- بوادي عسفان ، قال: يا أبا بكر أي واد هذا؟ قال: وادي عسفان، قال: لقد مر به هود و صالح، على بكرين أحمرين خطمهما ليف ، وأزرهم العباء ، وأرديتهم النمار يلبون ، يحجون البيت العتيق.أحمد، حديث حسن.

(٨٣) Polytheism

(٨٤) Henotheism

(٨٥) Monotheism

شیکارییەک بۆ ئەم قۆناغانە لە تەفسیری سەید قوطبەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

یەکەم: فرە خوایی؛ کۆمەڵگە سەرەتاییەکان خاوەنی چەند خوایەک بوو کە زۆر جار لە ٢٠ خوا بۆ سەرەوە تا دەگەیشتە سەدان خوا، بۆ هەر دیاردەیەکی سرووشتی خوایەکیان داتاشی بوو بەندایەتیان بۆ دەکرد، واتا دەگونجا بۆ هەر خێزانێک خوایەکی تایبەت یان چەند خوایەکی تایبەت هەبووبێت بۆ هەر یەکێک لەم خوایانە نوێژ و قوربانی تایبەتی بۆ کراوە، ئەمە دید و تێڕوانینی زانستی ئەنترۆپۆلۆجیا و ناسینی ئایینە لەڕووی زانستی و ئەکادیمییەوە، دوور لە خوێندنەوەی ئایینی، واتا تەنها لەڕووی مادییەوە ڕاڤەی بۆ کراوە کە ئەوەش بەشێکی زۆر گەورەی لە ئەدەبیاتی جەدەلی مارکسیزم وەرگیراوە کە ناسراوە بە (دیالێکتیکی مارکسی) یاخود ڕاڤەی مێژوو بە مادده[٨٦].

لەدواییدا سەید قوطب وەڵامی هەموو ئەو گومانانە ئەداتەوە لە تەفسیرە نایابەکەی لە سورەتی هوود دا.

قۆناغی پەرەسەندنی ئایین لای مادیەکان بریتییە لە سەردەمی جیاکاری و هەڵبژرادن و گرنگیدانان بۆ خواکانە، ئەمەش بەو پێیەی هەر هۆز و عەشیرەتێک خوایەک بۆ خۆی جیادەکاتەوە و دەبێتە خاوەنی ئەو خوایە لەڕووی

ئەمن و ئاسایش و دانی ڕزق و ڕۆزی و دابینکردنی ژیانیان، پاشان بە کۆمەڵ بەندایەتی بۆ دەکەن و دەشێت لەناو ئەم کۆمەڵە خوایانە جێگایان بۆ دابین بکەن کە خواکان ناویان لێبنرێت بە خوای باران و باو و خۆراک هەموو جۆرە خوایەکی سرووشتی، بەڵام لەمەودوا هۆزەکە بڕیاری جۆری عیبادەت و کاتی عیبادەتی ئەدات، جا لە ڕێگای سەرۆک هۆز بێت یان کاهین و بەناو پیاوانی ئایینی، ئەم قۆناغەش لە زانکۆ بیانییەکان ناسراوە بە پەرەسەندنی ناوەند و ڕەواج پێدان[٨٧].

قۆناغی سێیەم و کۆتایی پەرەسەندنی ئاین، دەگەڕێتەوە بۆ یەککرتنی ئوممەتی گەورەتر لە هۆز و عەشیرەت و شارو کۆمەڵگەکان، ئەمەش هەموویان یەک دەگرن لەسەر پەرستنی خواکان لەهەموو هەرێم و ناوچەکان، ئەم یەکگرتنەش تەواو نییە، بەڵکو هەر لەناوەندی فرەخوایدا دەسوڕێتەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

Polytheism (٨٦)

Henotheism (٨٧)

ئەم پەرەسەندنەش زۆر ناتەندروستە بەوەی کە ئەقڵی مرۆڤەکان ناگاتە ئەوەی خوایەک بناسێت کە پێداویستی نییە و خاوەنی ئەم گەردوونەیە و زانا و ئاگادارە بەسەر دروستکراوەکانیەوە، هیچ کات مرۆڤ پەی نابات بە نهێنییەکانی ئەم بوونە، بەڵکو تەنها پەرستشێک دەکات کە یاری بەناخی خۆی دەکات یان بێئایینی دەکات، چونکە ناسینی خوا دەبێت لە ڕێگای خودی ڕەگەزی مرۆڤەکان بێت، دەنا ئەستەمە بتوانرێت خوا بناسێت بەو شێوەیەی خوای گەورە دەیەوێت، هەربۆیە لە سەردەمی سەرەتایی مرۆڤایەتی خوای موتەعال حەزرەتی ئادەمی ناردووە بە یەکتاپەرستی و پاشان ناسینی شەریعەتەکەی و ئەرک و فەرمانی مرۆڤ و پاشان مافی مرۆڤەکان لەلایەن خوای گەورەوە.

یەکەم ڕەوەند کە خوای ناسیوە بەتەنهایی و بیروباوەڕی یەکتاپەرستی و ئایینی ئیسلام و شەریعەتی حەنیفی هەبووە و پیادەی کردووە، ڕێک پێچەوانەی ئەو بەیت و بالۆرەی لە پەرەسەندنی ئایین دا هەیە و ڕاڤەی ماددی بۆ مێژووی ئایین زۆر ناتەندروست و ئەفسانەیە، لەسەردەمی نووح-ەوە عَلَيهِ السَّلَام کە فرە خوایی دروست بووە، کاری مرۆڤە خواناسەکان ئەوە بووە کە مرۆڤە سەر لێشێواوەکان بەرەو ڕاستی خواپەرستی بهێننەوە.

تەنانەت خودی شوێنەوارناسی هەموو ئەوە پشت ڕاست دەکەنەوە کە مرۆڤ لەئاسماندا تەنها یەک خوای پەرستووە و لەسەرزەوی خوای تر دروست کراوە بۆ نزیکبوونەوە لە خوای سەرەکی لە ئاسماندا.

هەموو لێکۆڵەرەوەکانی ئایینی لێکنزیک بوونەوە (مقارنة الأديان) وتەکانیان گشت دژ بەیەکە و دان بەبوونی (الله) دەنێن، تەنانەت لە نووسراوە کۆنەکاندا ڕێک یەکتایی خوا لە ئاسمان دەسەلمێنێت و مرۆڤەکانی سەردەمی چاخەکۆنەکان جەخت لەسەر خواپەرستی یەکتایی دەکەنەوە، تەنانەت ئایینەکانی سەرەتاش کە دەستکاری کراون هەموو بوونی یەک خوا دەسەلمێنێت، بەڵام هاوبەشیان بۆ داناوە.

ئەم قۆناغەی کە باسمان کرد لە ژیانی پێغەمبەرانی سەرەتا لە ئادەمەوە تاکو صاڵح سەلامی خوایان لێبێت کاریان ناساندنی خوای تاک و تەنها بووە، بەدڵنیاییەوە لەدوای ئەمانەش لە ئیبراهیم باوکی هەموو پێغەمبەران تاوەکو محەمەد صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ بە هەمانشێوە کاریان ناساندنی خوای پەروەردگار بووە بە یەکتاپەرستی و پاشان گەڕانەوەی سەرووەری شەریعەت بۆ خوای پەروەردگار.

بەواتایەکی تر قۆناغی پێغەمبەرانی ناوەند دەستپێکی ناساندنی شەریعەتە و پاشان ناساندنی نهێنییەکانی گەردوونە، ناساندنی جادووکاری و جادووبازییە کە لە سەردەمی

پێغەمبەرانی سەرەتایی ڕەواجی نەبووە و زانراو نەبووە، تەنانەت خودی صالّح کە بە سیحر لێکراو ناوبراوە، بەواتای نەخۆش ئاماژەی بۆ کراوە، نەکو ساحیرەکان جادوویان لێ کردبێت.

قۆناغی نێوان پێغەمبەرانی سەرەتا بۆ پێغەمبەرانی ناوەند قۆناغی بەرەو دەسەڵات و بیناکردنی حکومەت و پادشایە و پاشان ناساندنی یاسا و ڕێساکانە کە لە سەردەمەکانەوە وەکو میراتی پڕ ئەزموون خوای گەورە پاداشتی کردووە بۆ نەوە دوای نەوە و بەتایبەت بۆ نەوەکانی ئیسرائیل و پاشان ئوممەتی پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تا ڕۆژی قیامەت.

لەدوای مردنی صالّح عَلَيْهِ السَّلَامُ هیچ پێغەمبەرێک لە نێوان جەنابیان و حەزرەتی ئیبراهیم دا نییە (خوای گەورە لە هەمووان زاناترە) لەو ماوەی نێوانی صالّح و ئیبراهیم پێدەچێت چەند سەد ساڵێک ماوەیان هەبووبێت، لەو ماوەدا زیاتر پێشبڕکێی شارەکان دروست بوو، بەتایبەت لە ساڵی ٣٢٠٠ (پ، ز) پێش لەدایک بوونی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا و میسر شارەکان هەنگاویان نا بەرەو شارستانییەت، لەکاری بیناسازی، پیشەسازی و کشتوکاڵ و...هتد. مرۆڤایەتی لەسەردەمی سەرەتاییەوە دەرچوو بۆ بونیاد نان، بۆیە بە کۆمەڵێک شار دەرکەوتن وەکو (بابلیۆن، ئوور، کیش، نیفەر، ئوما، ئووروک، نەینەوا، کوثی، ئەرب...هتد)، ئەمانە هەموو لەدۆڵی ڕافیدەین لەنێوان دیجلە و فورات دروستبوون، بەدوای ئەواندا لە شام هالب یاخود (حلب) و حەڕان بەرەو وڵاتی میسر شاری گەورەی ناوچەکە ئەتت، تاوی، لوکسور و...هتد.

هەریەک لەم شارانە خاوەنی سوپای خۆی و هێز و پارە و دەسەڵاتداری خۆی بوو، لەم سەردەمەدا دەزگای دەوڵەت و دامەزراندن و باج وخەراج و سوپا و موچە دابەش دەکران، کەسێک بەناوی (نەمرووود) کە سەرکردەیەکی بەهێز و شەڕوانێکی لێزان و لەهەمانکاتدا دیکتاتۆر بە زمانی سەردەم توانی بابل و ئوور و نەینەوا و زۆربەی شارەکان بکات بەیەک و بەناوی دەوڵەتی (نەبەط) یان (نابەت) یاخود ئیمپراتۆریەتی نەبەط لە ناوچەکە دابمەزرێنێت کە بەڕەچەڵەک لە هۆزی نەبەطی بابلییەو هیچ پەیوەندی بە فارسەوە نییە، چونکە هەندێک دەڵێن فارس بووە، نەمرووود دژی فارس بوو، چونکە بنەڕەتی نەبەط تورکە، پادشای فارس بەناوی لوهراسب کە لە شاری کیش نیشتەجێ بوو دژی تورکەکان بوو، ئەوانی دەربەدەرکرد (نەمرووود) یەکێک بوو لەوان، کە توانی سەربکەوێت بەسەر فارس دا یاخود پارسیا. ئەم مێژووەش زیاتر لە طەبەرییەوە وەرگیراوە، مێژوونوسانی تریش دووبارەیان کردۆتەوە، هەرچەندە (هێرۆدۆت) مێژوونوسی یۆنانی باسی لێکردووە لە شانامەشدا ناوی بە (نەمرووود) هاتووە، بۆ پشت ڕاستکردنەوە هیچ شوێنەوارێک نییە بۆ ناوی (نەمرووود)!

بەڵام زانراوە کە پادشایەک هەموو ناوچەکەی کردە یەک و پاشان زۆر زاڵم و دەسەڵات ڕۆیشتوو خوێنخوار بووە.

کۆی گشتی هەموو ناوچەکانی لە ژێر دەسەڵاتیدا بووە، خاوەنی سوپای بەهێز و توانا بووە، ئەگەر بڵێین تاکە هێزی جیهان بووە لەو سەردەمەدا هیچ هێزو توانایەک نەیتوانیوە ڕووبەڕووی ببێتەوە.

ئەم قۆناغەش پێویستی بە هاتنی پێغەمبەرێک هەیە، چونکە نەمروود خۆی بە خوا زانیووە لەسەرزەویدا، بانگەوازی خوایەتی کردووە کە دەبێت ئەو بپەرستن.

# مەملەکەتی حەوتەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام

ئیبراهیم پێغەمبەر لای نەسرانییەکان تەنها بەباوکی یەهوودییەکان وەکو پێغەمبەر تەماشا دەکرێت، لای نەسرانییەکان تەنها بەباوکی پێغەمبەران دەناسرێت و خۆی بە پێغەمبەر نازانن، پێدەچێت لای دوو ڕێبازی تایبەت بە نەسرانییەکان وەکو ئۆرتۆدۆکس و پرۆتستانتەکان لای هەندێکیش لە کاتۆلیکەکان هەر هەمان بیروباوەڕیان هەیە، بەڵام بەشێکی کەمیان وەکو پێغەمبەر تەماشای دەکەن. بەردەوام لای نەسرانییەکان پێغەمبەر دێت لەناو خەڵکیدا بەتایبەت لەسەردەمی ئەمڕۆماندا ئەوان پێغەمبەران تەنها بە چاوی پیاوچاکێک تەماشای دەکەن، وەکو ئایینی ئیسلام نین زۆر بە چاوی ویقار و گەورەییەوە تەماشای پێغەمبەران بکەن، لە ئایینی نەسرانی ٤ پێغەمبەری گەورە و ١٢ پێغەمبەری بچووک بوونی هەیە لە کتێبەکانیاندا یەهوودیش بڕوای بە ٤٨-٥٠ پێغەمبەر هەیە کە هەموو لە نەوەی ئیسرائیل تەماشا دەکرێن، لە جێگای خۆیدا باسی هەموویان دەکەین و ڕوونکردنەوەی تەواوی لەسەر دەدەین لەم کتێبەدا، هەرچەندە ئەم کتێبە تەنها لە بیروباوەڕی ئیسلامی و دیدوبۆچوونی مێژووی ئیسلامییەوە سەرچاوەی گرتووە، بەگەڕانەوە بۆ سێ سەرچاوەی سەرەکی ئەویش قورئان و سوننەت و مێژووی ئیسلامی و ئەهلی کیتاب و شوێنەواری مێژوویی و لەگەڵ مێژوونووسانی جیهان، هەموو ئەم سەرچاوانە پشتی پێ بەستراوە بەو مەرجەی دژی قورئان و سوننەت نەبن و هەروەها دژ بەیەکتریش نەبن.

ئیبراهیم پێغەمبەر ٦٩ جار لە قورئان دا ناوی هاتووە، لە ٢٥ سورەت دا باسکراوە، شوێنی لەدایکبوونی خاکی عێراقی ئێستایە لە جێگایەک بەناوی (ئوور) کە دەکەوێتە دەشتایی نێوان ڕووباری دیجلە و فورات لە باشووری خاکی عێراق کە بە خاکی (سواد) ناسراوە[٨٨]، واتا

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٨] ( عباس محمودالعقاد) زانای بەرەگەز کورد دەنووسێ: بە پێی ( سفر التكوين)ی جولەکە نووح لە (١٦٥٠پ.ز) لە خاکی کلدان مردووە، تارح باوکی ئیبراهیم ساڵی (١٨٠٦) لە دایک بووە، ناوی ناو (ابرام)

( ابو اللانبياء/ل: ٤٧.

بەڵام بە پێی سەرچاوە مەسیحییەکان لەوانە ( جوزیف ئەنجوس) دەنووسێ: ( شوێنەوارەکان پیشانی دەدەن ئەمڕافل کە شەڕی ئیبراهیمی کردووە حەمورابی بووە، کە ساڵی (٢٠٠٠) پێش زاین پاشای بابل بووە، چالێنە بزمارییەکان پیشانی دەدەن هاوچەرخی ( ئاری ئاکۆ) بووە.

( ابو لأنبياء/ل: ٥٩.

<===

ناوچەکانی دەورووبەری ڕووباری ڕافیدەین یاخود ئاوەدانی شارو شارۆچکە و دێهاتەکانی خاکی عێراق، لەسەر ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە زۆر نووسراو هەیە، قورئان و سوننەتیش تەنها هێڵە گشتییەکانیان دیاری کردووە قورئان بە قووڵی چۆتە ناو باسی ژیانی لەبواری یەکتاپەرستی و ئازار و ناڕەحەتی و هیجرەتی لە پێناوی ئایینی خوای گەورەدا.

ئەو وێستگانەی کە باسکراوە لە ژیانی ئیبراهیم پێغەمبەردا عَلَيْهِ السَّلَامْ بۆ ژیانی ئێستامان و داهاتووی نەوەکانمان بە هەزارەها وانەی لە خۆ گرتووە، زۆر پێویستە بە قووڵی و بە چاوێکی زۆر ئارەزوومەندانەوە تەماشای بکەین کە ماندوترین پێغەمبەرە و پاشان لە پێغەمبەرانی (ئولولعەزمە) و بەباوکی پێغەمبەران ناسراوە، بونیادنانەوەی کەعبە لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە بووە کە یەکەم جار لەلایەن ئادەمەوە دروست کراوە، سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران بێت.

## سەرەتای لە دایک بوونی و منداڵی

ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامْ خوای گەورە لە قورئاندا ناوی باوکی بە (ئازەر) بردووە، کەواتە ناوی ئیبراهیمی کوڕی ئازەرە، ئەمەش ڕاسترین ناوی خۆی و باوکێتی، پاشان لە مێژوو لای ئەهلی کیتاب هاتووە بەناوی (ئیبراهیم کوڕی تارخ کوڕی ناحور کوڕی قینان کوڕی ئەرفەخشەند کوڕی سام کوڕی نووح).

ئەوەندەش بەسە لە قورئان دا ناوی باوکی هاتووە بە ئازەر، چونکە میحوەرێکی سەرەکییە لە باسی ژیانی دا، ئیتر هەندێک کەس لە خۆیانەوە بێ بەڵگە و سەرچاوە لە نەتاشراو دا دەتاشن، گوایە ئەمە ناوی بت بووە، نازناوی ئازەر لەو بتەوە هاتووە، پێناچێت هیچی ڕاست بێت ناوی باوکی ئازەرە و لەهەموو سەرچاوەکان ڕاسترە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

( د. بلیو. ئەی ویگرام) دەنووسێ: [( ئۆرفە) ئەوری کلکدانییەکانە، هەموو موسوڵمانان بڕوایان وایە ( ئۆرفە) ئەوری کلکدانیەکانە لانک و گۆڕی لەوێیە.

( مهد البشرية/ل: ٣٣.

لە پەڕاوێزی ( محیی الدین ابن عربي) لەسەر ( تفسیر الخازن) هاتووە: ئیبراهیم خەڵکی کۆیەی عێراقە، تا ئێستاش شوێنی نەمرود لە نزیک ڕانیە ماوە، لەوێ ئاگری بۆ ئیبراهیم کردۆتەوە).

پیری شالیاری زەردەشتی/ دانا محمد بەهادین ملا صاحب/ل: ٢٩.

دیارە مەبەستی لە دۆڵناوانی قەزای حاجیاوایە، شوێنی مەنزەنیقی ئیبراهیم، کە ئەشکەوتی ئیبراهیمش لەوێیە.

لەوێ بۆ ئۆرفەو حەران و شام و میسر کۆچی کردووە.

لەسەردەمی پادشا نەمروود لە دایک بووە، کە لەوانەیە لە ساڵی ٥ هەزار پێش زاین لەدایک بووبێت، چونکە ساڵی ئەو سەردەمە پێوەری تایبەت و شارستانییەتییەکان خاوەنی ڕۆژمێری خۆیان بوون، هەندێکیش دەگێڕنەوە بۆ ٤ هەزار ساڵ پێش زاین، ئەمانەش هەمووی گریمانەیە و هیچ دڵنیاییەکی لە پشتەوە نییە.

ئەوەی لە مێژووی طەبەری دا هاتووە کە ئیبراهیم بێجگە لە خۆی دوو برای بە ناوی (هاران و ناحور) هەبووە.

حەزرەتی لووط کوڕی هارانی برای ئیبراهیم هەروەها ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ مامێکی هەبووە بەناوی (هاران) واتا برای پێغەمبەر ئیبراهیم و مامی کە باوکی سارا خاتوونی خێزانیەتی، جا هەندێک وا لێکیانداوەتەوە کە گوایە سارا خاتوون کچی برای بووە، واتا برازای بووە، لە ڕاستیدا کچی مامی بووە، واتا ئامۆزای، بەهۆکاری ئەوەی کە براکەی و مامی یەک ناویان هەبووە بۆتە هۆکاری لێ تێکچوون و بەهەڵەدا چوون لەو باسەدا و خوێندنەوەی هەڵەی بۆ کراوە.

هەروەها دایکی ئیبراهیم ناوی (ئەمیلە) یاخود (یونا) بووە، ئەم دوو ناوە هاتووە لە مێژووی (إبن عساكر)دا بەناوی مێژووی دیمەشق، هەروەها ئیبن کەثیریش لەوی وەرگرتووە.

ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەو کاتەی کە ئیبراهیم لەدایک بووە بابل و ناوچەکانی دەوورووبەری خاکی (کلدان)ەکان بووە.

ئیشوکاری باوکی ئیبراهیم بت دروستکردن بووە، بتی دروست کردووە و بە منداڵەکانی فرۆشتووە، لە مێژووی طەبەری لە ئیبن ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە کە گوایە ئیبراهیم بتی فرۆشتووە، بەڵام بە کڕیارەکانی دەگوت کە ئەو بتانەی دەیکڕن هیچ سوود و زیانێکیان نییە، هەمیشە بەوە ناسراوە لەناو خوشک و براکانیدا کە کاتێک دەگەڕایەوە ماڵەوە بتەکانی دەبردەوە هیچی بۆ نەدەفرۆشرا.

بەو هۆکارە باوکی گلەیی زۆری لە ئیبراهیم هەبوو کە وەکو براکانی تری بتەکان نافرۆشێت.

## ڕەوشی کۆمەڵایەتی

لەو سەردەمەدا کۆمەڵگاکانی ناوچەی میزۆپۆتامیا گرنگی زۆریان دابوو بە فاڵ گرتنەوە و تەماشاکردی ئەستێرەکان، واتا لە ڕێگای ئەستێرەکانەوە ژیانی خۆیان ڕێکدەخست، جۆرێک بوو

لە خوێندنەوەی کاروباری ژیانیان لە ڕێگای ئەستێرەکانەوە، وەکو (بورجەکان) کە ئێستا لە زۆرێک لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەردەچێت.

ئەمەش جۆرێک بوو لە جادووبازی کە جادووبازەکان لە ڕێگای هەڵدانی زار و بەکارهێنانی جنۆکە خەریکی ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە بوون، بگرە زۆرێک لە دەزگاکانی وڵات لەسەر بنەمای سیحر و جادوو بە ڕێگەوە دەچوون، جادووبازەکان پلەوپایەی زۆر گەورەیان هەبوو وەکو وەزیری ئەم سەردەمە تەماشا دەکران، ئەم کارەش لە نێوان مرۆڤەکاندا کە بەربڵاو بوو، هۆکارەکەی ئەوە شەیتان و جنۆکە هاوکارەکانی بەتەواوی چوو بوونە ناو خەڵکی و سەرگەردانیان کردبوون، تەنانەت بە بت پەرستییەوە نەوەستان خەڵکی و دەسەڵات و پادشا و گەورەکانیان بەخوای سەرزەوی تەماشا دەکران، جۆرێک لە بیروباوەڕ بڵاو بووبووەوە کە دەسەڵاتداران خوێنی خوایەتییان هەیە و جیاوازن لە خەڵکی تر، سەرباری هەموو ئەم گەندەڵی و ناپەسەندییە جادوو باز و کاهینەکان زۆر بە گەورە تەماشا دەکران و قوربانی بۆ ئەوان دەکرا، لە جیاتی خوای پەروەردگار ئەوان دەپەرستران لەگەڵ بتەکانیان.

پادشای (بابل) کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی کلدانی بوو کە ئاشووری و پاشان سۆمەری و پارس و کورد کە ئەو دەمە کورد بە لۆلۆیەکان ناسرا بوون یان بە (سۆبارتۆییەکان) تورک و عەرەب هەموو لەو خاکەدا دەژیان، نەمروود لە بنەڕەتدا تورکە پادشای ئەو ئیمپراتۆرە بوو کە هێزێکی وانەبوو لەسەر زەویدا هاوشانی بێت.

لێرەدا کە دەوترێت کلدانی و ئاشووری و سۆمەری ڕاستە جۆرێک بوون لە گەل، هەرجارە و دەسەڵاتی کامیان زۆر بووبێت لە ناوچەکەدا زمانی ئەو هۆزە زاڵ بووە بەسەر ئەو دەسەڵاتەدا، هاوشێوەی وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆ کە لە ناو دەسەڵاتی شیعەنشینی ئێران چەندین زمان لەو وڵاتەدا هەیە لە عەرەب، تورک، بەلوچ، کورد، گیلەک و عیلامی بەڵام زمانی فارسی زمانی سەرەکی ئەو وڵاتەیە و بەو شێوەیە بووە لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ دا.

لەو سەردەمەدا ڕۆژانە وەکو هەواڵ و ڕۆژنامەکان دەچوونە لای پادشا و پێشبینی و هەواڵی داهاتوویان ئەدا بە نەمروود، یەکێک لە هەواڵەکان کە درایە نەمروود، ئەوەبوو کە کەسێک لەدایک دەبێت لەناوچەی (ئوور) دەبێتە هۆکاری لەناوچوون و ڕماندنی بت و خواکانمان!

ئەم وتەیە کە لە مێژووی طەبەری و مێژووی ئبن ئەسیر و مێژووەکانی تر هاتووە سەرچاوەکەی دەرنەکراوە لەلایەن لێکۆڵەرەوەکان، بۆیە ئێمەش وەکو خۆی بۆتان دەگوازینەوە.

لەدوای ئەوەی نەمرووود ئاگادار کرایەوە بەوەی منداڵێک لەدایک دەبێت لەناوچەکانی (سواد) ترسی هەیە بۆ دەسەڵات و خواکانی بابل، لەو کاتەدا دایکی ئیبراهیم سکی پڕ دەبێت بە ئیبراهیم خۆی دەشارێتەوە تا سکەکەی دادەنێت و ئیبراهیم لەناوچەی خۆیان ناژین، دوای ئەوەی کە تەمەنی دەگاتە (بلوغ) باوکی دەڕواتە شاری بابل و لەوێ دەمێنێتەوە.

لە شاری بابل ئیبراهیم گەورە دەبێت، گومانی تێدانییە کە ئیبراهیم کاریگەری کۆمەڵگاکەی لەسەر دەبێت و بیردەکاتەوە لە ئەو ئەستێرە و خوایانەی دەپەرستن...

خوای گەورە دیمەنی بیرکردنەوەی ئیبراهیم لە قورئاندا بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ٧٦ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ٧٧ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٧٨ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٧٩ وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ٨٠ وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٨١ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ٨٣﴾ الأنعام

واتە: بەو شێوەیەی ئەستێرەو هەسارەو ئاسمانەکان و زەویمان نیشانی ئیبراهیم دا تا بەتەواوی بچێتە ڕیزی دڵنیاکانەوە٧٥ کاتێ کە شەو باڵی کێشا بەسەریا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی دی) وتی: ئەمە پەروەردگارمە، کاتێ کە ئەستێرەکەی لێ ئاوابوو وتی: من شتی لەبەرچاو ون بووم خۆش ناوێت و حەزی لێ ناکەم٧٦ کاتێ کە مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئەمە پەروەردگارم بێت، کاتی کە ئەویش ئاوابوو وتی: بەخوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتم نەدات دەچمە ڕیزی دەستەی گومڕاکانەوە٧٧ خۆر هەڵهات، وتی: ئەمەیان پەروەردگارمە ئەمە گەورەتریشە کاتێ کە ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، ئیتر من بەریم لەو شتانەی کە ئێوە کردوتانە بە هاوەڵ و شەریك٧٨ من ڕووی خۆمم کردۆتە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، بەدڵئارامی تەواوەوە هەرگیز من لە ڕیزی موشریك و

هاوەڵپەرستاندا نیم﴿٧٩﴾ کەوتنە موجادەلەو دەمە دەمێ و بەدرۆخستنەوەی، ئێوە دەربارەی خوای (تاك و تەنها) لەگەڵ من دا دەمە دەمێ و موجادەلە دەکەن، لە کاتێکدا کە ئەو هیدایەتی داوم و ڕێبازی ڕاستی نیشان داوم و من ناترسم لەو شتانەی کە ئێوە کردوتانە بە شەریکی خوا مەگەر ویستی پەروەردگارمی لەسەر بێت و بیەوێت شتێکم بەسەر بێنێت، زانست و زانیاری پەروەردگارم هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئایا ئێوە بیرناکەنەوە و یادەوەری وەرناگرن﴿٨٠﴾ من چۆن لەو شتانە دەترسم لە ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، ئێوە ناترسن لەوەی کە شەریك و هاوەڵتان بۆ خوا بڕیار داوە بەبێ هیچ بەڵگەیەك کە خوا ناردبێتی بۆتان، جا کەواتە کام دەستە شایستەی ئەوەیە کە بێ ترس بێت و بە ئاسایش بژی، ئەگەر ئێوە لێکدانەوەتان هەیەو لەڕاستی یەکان شارەزان﴿٨١﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوەو زوڵم و ستەم و شیرکیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە ئاسوودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانە، بێگومان ئەوانە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتەبەر﴿٨٢﴾ بەو جۆرە بەڵگانە کە بە ئیبراهیممان بەخشی زاڵ بوو بەسەر قەومەکەی دا، پلەوپایەی هەر کەسێك شایستە بێت بەرزی دەکەینەوە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر داناو کاربەجێیە، زۆر زانایە بە هەموو شتێك﴿٨٣﴾

زۆرێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن: کە ئەم گفتوگۆیە وەکو بەڵگەو ئارگۆمێنت هێنانەوە بووە بۆ هۆزەکەی، پاشان ئیمانی خۆی تێدا ئاشکرا کردووە بۆ خەڵکی ناوچەکە، جا هەندێک دەڵێن لە (حران) یاخود شام بووە کە ئەمە ڕوویداوە، بەڵام ئەوەندەی کە پەیم پێ بردووە ئەم باسە و قسەکردنەی ئیبراهیم لەگەڵ خۆیدا بووە و پاشان ئیمانی فیطری وەرگرتووە و خوای پەروەردگار لە ڕێگای ئیلهامی پێش پێغەمبەرایەتی یەکتاپەرستی خوای گەورەی ناسیووە، هەروەها ئەوانەی کە دەڵێن ئەم گفتوگۆیە لەناوچەی شام و حەران بووە، بەڵگەیان ئەوەیە کە گوایە ئەو ناوچەیە ئەستێرە پەرست بوون نەک بابل و بابلییەکان بتیان پەرستبێت.

لەڕاستیدا ئەم وتەیە زۆر دەقیق نییە، چونکە بابلییەکان ڕۆژ پەرست و ئەستیرەکانیان پەرستووە، بە بەڵگەی ئەوەی کاتێک ناڕواتە دەرەوە لەگەڵ خەڵکەکە بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە کە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕێگای ئەستێرەکانەوە زانیویەتی نەخۆش دەکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ﴿٨٩﴾﴾ الصافات

واتە: تەماشایەکی ئەستێرەکانی کرد﴿٨٨﴾ وتوویەتی: من نەخۆشم﴿٨٩﴾

خوای ڕۆژیان هەبووە کە ناوی عەشتار بووە، هەرچەند نووسەر عەشتار بە ئەستێرەی (زوهرە) دەزانێت لای یۆنان و ڕۆمەکان بە (ڤینۆس) ناسراوە، بەهەرحاڵ هەرکامیان بێت

پەیوەندی بە ئەستێرەوە هەیە، هەندێکی تر دەڵێن مەردک یاخود مەردۆخ خوایان بووە کە دەلالەت بووە لەسەر (خۆر).

هەروەها (وێل دیورانت) لە کتێبی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: بابلییەکان لێکۆڵینەوەیان ئەکرد لە ئەستێرەکان بۆ ئەوەی ڕێگاو بان و کاروان و بازرگانییەکانیان ڕێکبخەن و ڕێگا بدۆزنەوە، یاخود بۆ ناو ڕووبار و دەریاکان بەکاری بهێنن، نا؛ بەڵکو خوێندنەوەیان بۆ ئەستێرە بۆ پێشبینیکردن و زانیاری لەسەر داهاتوو بە دەست بهێنن، ئەو وەکو ئارەزوو ناوی بردووە[٨٩].

خەزعەلی دەڵێت: پەرستنی خوا و بت و هەموو کارەکانیان لە ڕێگای ئەستێرەوە بووە[٩٠].

باوکی لەناو کۆمەڵگەکاندا ناسراو بووە، دەڵێن کەسێکی دەست ڕەنگین بووە لە پەیکەرتاشی و بواری وێنەکێشان دا، لە ئبن کەثیردا هاتووە ئەویش لە طەبەری وەریگرتووە کە گوایە ئبن عباس و زۆرێکی تر لە زانایان دەڵێن: ناوی ئازەر نازناوە کە گەورەترین بتی دەروازەی بابلی دروست کردووە کە هەندێکی تر بە (مەردەک) ناویان بردووە.[٩١]

باوکی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بت تاش بووە و بت فرۆش بووە، هەر ئەمەش وای کردووە کە ئیبراهیم بەوپەڕی لووطف و خۆشەویستی ئامۆژگاری باوکی دەکات و سەرەتا چەند جارێک زۆر بە هێمنی و خۆشەویستییەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٨٩] لە بەرگی دوو دا لە لاپەڕە ٢١١ بەدواوە بە درێژی باسی لێوە کردووە.

[٩٠] خەزعەلی خەڵکی شاری کەرکوکە و یەکێکە لە شارەزاو پسپۆڕەکانی مێژووی دێرینی عێراق و کەسێکی مادديیەو ڕاڤەی مێژوو بە پێوەری مادی لێکدەداتەوە.

[٩١] لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە ( صحف ابراهيم) کراوە (إِنَّ هَذا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى * صُحُفِ إِبْراهِيمَ وَمُوسى)الأعلى/١٨-١٩ کە خوا بۆ ئەوی ناردووە.

( أ.د. فالح شبيب العجمي) دەنووسێ: ( ڤیدا) کتێبی ( بەراهیمەکان)ی هیند پەڕاوی ئیبراهیمە، بەڵام دەستکاری کراوە ( بەراهیمەکان) ئیبراهیمین لەوێ دا باسکراوە، کە ئیبراهیم خێزانەکەی سارا بووە و لە سەر ئاینی ئەون ( صحف ابراهيم/ أ.د. فالح شبيب العجمي/ جامعة ملك سعود/ل: ١-٦.

( علي حسني الخربوطي/ دەنووسێ: هیندییەکان بڕوایان وایە یەکێ لە خواکانیان ( شبوه) لەگەڵ ژنی سەردانی ( مەکیشیکا) واتە: مەکەیان کردووە گیانی چووە بە بەر ( بەردە ڕەشەکەدا).

دیسان فارس وەکو ( المسعودي) باس دەکات: بڕوایان وابوو کەعبە گیانی ( هورمز)ی کراوە بە بەراورد (ئیبراهیم) باپیرەیانە، بۆیە باب و باپیرانیان حەجیان کردووە، لەوانە ( ساسان کوڕی بابک)دا.

( تأريخ الكعبة/عل حسني الخرطبوطي/ل: ٢٦-٢٧.

بە پێ ی مێژووی ( الطبري) ساسان کوڕی بابل و ساسانییەکان کوردن، وەکو لە نامەی _ ئەردەوان) بۆ ساسان هاتووە: ( ايها المربي في خيام الاكراد/ تأريخ الطبري/ج١/ل: ٣٩٠.

صِدِّيقًا نَّبِيًّا۝٤١إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ۝٤٢يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا۝٤٣يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا۝٤٤يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا۝٤٥قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا۝٤٦قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ۝٤٧وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا۝٤٨﴾ مريم

واتە: لە کتێبی (قورئاندا) باسی (گۆشەیەک لە بەسەرهاتی) ئیبراهیم (بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە) ئەو کەسایەتییەک بووە، کە پێغەمبەر و ڕاست و ڕاستگۆ بوو۝٤١ کاتێ (کە خوا هیدایەتی دا) بە باوکی وت: باوکی (بەڕێزم) ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستی کە نە گوێبیستە، نە بینایە (نە لە تەنگانەدا) فریات دەکەوێت۝٤٢ ئەی باوکی (بەنرخم) ئەو زانست و زانیارییەی کە بە من گەیشتووە، (دەربارەی دەسەڵات و توانای بەدیهێنەری ئەم جیهانە) بۆ تۆ نەهاتووە پەیڕەوی من بکەو (گویم بۆ بگرە) ڕێنموویت دەکەم بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروست۝٤٣ ئەی باوکی (ئازیزم) شەیتان مەپەرستە، چوونکە شەیتان یاخی بووە لە خوای میهرەبان و سەرکەشیی کردووە۝٤٤ ئەی باوکی (بەڕێزم) من دەترسم سزایەک لەلایەن خوای میهرەبانەوە یەخەت پێ بگرێت، ئەو کاتە ئیتر دەبیتە یارو یاوەرو هاودەمی شەیتان۝٤٥ (باوکی ئیبراهیم بە سەغڵەتیەوە) وتی: بۆچی ئەی ئیبراهیم تۆ (ئەوەندە) لە خواکانی من بێزاری، ئەگەر کۆڵ نەدەیت (لێت قبوڵ ناکەم) و بەرد بارانت دەکەم بڕۆ، (ون بە لەبەرچاوم) هەر نەتبینمەوە۝٤٦ ئیبراهیم وتی: سڵاوت لێ بێ (وا من دەڕۆم) داوای لێ خۆشبوون و (هیدایەتت) لە پەروەردگارم بۆ دەخوازم، چوونکە ئەو زاتە منی خۆش دەوێ و ڕێزی بۆ داناوم۝٤٧ من دوور دەکەومەوەو کەنارگیری دەکەم، لە ئێوەو لەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێدم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت۝٤٨

ئەنجامی ئەم ئامۆژگارییە لەوەوە هاتووە کە باوکی ئیبراهیم بتفرۆشەو دەیەوێت واز لەو کارە بهێنێت، پاشان ڕووشد و تەمەنی گەیشتنە ئاستی ئەوەی کە کۆڵی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرێت، ئینجا خوای پەروەردگار ناردی بۆ خەڵکی ناوچەکە بە گشتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ۝٥١﴾ الأنباء

واتە: بە دڵنیایی هەر لە پێشتردا ڕێگای ڕوشدو ڕاستمان بە ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيۡهِٱلسَّلَامُ بەخشی، ئێمە ئەمانزانی کە شایەنی ئەوەیە کە ڕێگای هیدایەت و ڕاستی پێ نیشان بدەین و بیکەین بە پێغەمبەر﴿٥١﴾

پاشان کەوتە بانگەوازی خەڵکەکە و وەکو پێغەمبەرێک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴿١٦﴾إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴿١٧﴾وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴿١٨﴾أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴿١٩﴾قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴿٢٠﴾يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ﴿٢١﴾وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴿٢٢﴾وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٣﴾﴾ العنكبوت

واتە: باسی ئیبراهیمیش بکە کە کاتی خۆی بە قەوم و هۆزی خۆی وت: تەنها خوا بپەرستن و هەر لەو بترسن، ئەو بیروباوەڕە چاك و پەسەند و خێردارترە بۆتان، ئەگەر بزانن و تێبگەن﴿١٦﴾ بەڕاستی ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەستن تەنها بت و پەیکەرن، ئێوە بوختان و شتی نابەجێ دروست دەکەن، بێگومان ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن خاوەنی هیچ ڕزق و ڕۆزییەك نین بۆ ئێوە، کەواتە هەر داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە﴿١٧﴾ ئەگەر تۆ بە درۆ بزانن ئەی محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ ئەوا ئوممەتانی پێش تۆیش پێغەمبەرانی خۆیان بە درۆ زانیوەو ئەمە داب و نەریت و عادەتی سەرجەم ئوممەتانە کە پێغەمبەران بە درۆ ئەزانن، هەواڵتان پێگەیشتووە چۆن سزامان داون و لەناومان بردوون، هیچ شتێکیش لەسەر پێغەمبەر نییە تەنها ئەوە نەبێت کە دینەکە بە ئاشکرا بە خەڵکی بگەیەنێ﴿١٨﴾ خۆ ئەگەر ئێوە ئەم پەیامە بەدرۆ دەزانن (وەنەبێت یەکەم هۆزو گەل بن کە لەبەرامبەری پەیامی خواوە هەڵوێستتان ئاوا نارەوا بێت) ئەوە بەڕاستی گەلانێکی پێش ئێوەش پەیامی خوایان بەدرۆ دەزانی، پێغەمبەریش تەنها گەیاندن و ڕوونکردنەوەی ئاشکرا ئەرکی سەرشانێتی و هیچی تر﴿١٩﴾ ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە چۆن خوا لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت و پاشان دووبارەی دەکاتەوە، بێگومان ئەو شتانە بۆ

خوا زۆر سادە و ئاسانە﴿١٩﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە، لەوهوودواش هەر خوا سەر لەنوێ بەرپایان دەکاتەوە (بە شێوەو شێوازێکی تر ئاسمانەکان و زەوی و ئێمەش دەهێنێتەوە کایە) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە﴿٢٠﴾ هەندێك جار، سزای ئەو کەسانە دەدات کە خوا بیەوێت و شایستەی سزان و سۆزو میهرەبانی خۆیشی دەنوێنێت بۆ ئەوانەی کە دەیەوێت و باوەڕدارن، سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبرێنەوە﴿٢١﴾ ئەوانەی کە بڕوایان نییە بەئایەت و فەرمانەکانی خواو بەدیدار ئامادەبوونی بەردەم بارەگاکەی (بۆ لێپرسینەوە) ئا ئەوانە (خوا دەفەرموێت) لە میهرەبانی من نائومێدن و ئەوانە سزای زۆر بەئێش بۆیان ئامادەیە﴿٢٣﴾

ئینجا ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لەناو خەڵکیدا دەرکەوت و ناسرا بە کەسێک کە بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی دەکات و خۆی بە پێغەمبەر دەناسێنێت، سەرەتا لەناو کەسووکارەکەی خۆیەوە دەستی پێکرد و پاشان بۆ ناو گەلەکەی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴿٥١﴾إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴿٥٢﴾قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ﴿٥٣﴾قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴿٥٤﴾قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ﴿٥٥﴾قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴿٥٦﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئێمە ژیریی و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاک ئەومان دەناسی﴿٥١﴾ کاتێک کە بەباوك و قەومەکەی وت: ئەم بت و پەیکەرانە چیە؟! ئێوە بە دەوریدا دێن و دەیانپەرستن﴿٥٢﴾ وتیان: ئێمە باوانمان بینیوە ئەمانەیان پەرستووە﴿٥٣﴾ وتی: بەڕاستی ئێوەو باوانی ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرا بوون﴿٥٤﴾ وتیان: بەڕاست، تۆ حەقیقەتت بۆ ئێمە هێناوە یا گاڵتە دەکەیت؟!﴿٥٥﴾ وتی: (من گاڵتە ناکەم) بەڵکو (دەمەوێت تێتان بگەیەنم) کە پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییەو هەر ئەویش بەدیهێناون، من لەسەر ئەو بیرو باوەڕە لە شایەت و ئاگاکانم﴿٥٦﴾

دیارە گەلەکەی لە ئەنجامی بانگەوازەکەی هیچ کاردانەوەیەکیان نەبوو، گوێیان نەدا بە بانگەوازەکەی. ئەویش بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی بانگیان بکات بۆ یەکتاپەرستی و دووربکەونەوە لە بتپەرستی و خورافیات.

هەواڵ گەیشتە نەمروود کە کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی دەکات، بۆ ئەنجامی بانگەوازەکەی نەمروود بانگی کرد تا بزانێت ئەم کەسە داوای چی دەکات و چی دەوێت؟

کاتێک ئیبراهیم عَلَيۡهِ‌ٱلسَّلَامُ چوو بۆلای نەمروود ئەویش کەوتە مشتومڕ بۆ ئەوەی ڕێگا لە ئیبراهیم بگرێت، بنەماڵەی ئیبراهیم لەناو دەسەڵاتدا بەهۆکاری باوکی کە بت تاشێکی زیرەک بوو لەناو ناوەندی ئەو دەسەڵاتەدا ڕێز و حورمەتیان دەگیرا تا ڕادەیەک ناسراو و قسە ڕۆشتوو بوون، هەربۆیە بەو شێوەیە نەمروود کە خۆی بەخوا دەزانی، پادشاکانی ڕابردووو کە لەدوای طۆفانەکەی نووح هاتبوون، هەموو بانگەوازی خواییان دەکرد، ئەمیش خۆی بە نەوەی پادشاکان دەزانی لە مێژوو و پاشماوە دێرینەکان و نووسراوی سەر بەرد و هەڵکەندراوەکاندا هاتووە کە ئەم پادشایانە ڕەچەڵەکیان لە ئاسمانەوە هاتووە!

تەنانەت لە ئێستادا تەفسیرە مادییەکان ئەوەندە لاوازن بەچاوی میتۆلۆجی ئەفسانەوە تەماشای ناکەن، بەڵکو دەڵێن گوایە دەشێت جۆرێکی تر لە مرۆڤ بوون و لە ئەستێرەکانی ترەوە هاتبوون، ئەمەش زۆرێک لە کاناڵەکانی وەکو (دیسکەڤەری،، هستری، فۆکەس و...هتد) بەرنامەی تایبەتیان لەسەر هەیە، کە هەموو بەرنامەی

دیکۆمێنتی گەورە و بەدەیان پرۆفیسۆر قسەی لەسەر دەکەن. ئەمەش جۆرێکە لە جاهیلیەتی سەردەم، هەروەکو سەید قوطب دەڵێت: جاهیلیەت کۆتایی نەهاتووە و بەردەوامە لەگەڵ مرۆڤایەتی دا و پێویستی بە ڕاستکردنەوەیە بەم ئایینە.

بگەڕێینەوە ناو باسەکە خوای گەورە پوختەی ئەو دیبەیت و مشتومڕەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿٢٥٨﴾﴾ البقرة

واتە: ئایا نابینی ئەوەی کە ویستی حوجەو بەڵگە بێنێتەوە بەسەر ئیبراهیم پێغەمبەردا عَلَيۡهِ‌ٱلسَّلَامُ سەبارەت بە بوونی پەروەردگار کە (نەمرودی) زاڵمی پاشای عێراق بوو کاتێك کە خوای

گەورە موڵك و دەسەڵات و سەروەت و سامانی پێ بەخشی بوو ئەویش لەخۆی بایی بوو داوای بەڵگەی لە ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ کرد لەسەر بوونی خوای گەورەئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من ئەو الله یە کە ژیان و مردنی بەدەستە خەڵکی ئەژێنێت و خەڵکی ئەمرێنێ(نەمرودیش) وتی: منیش ئەتوانم خەڵك بژێنم و خەڵك بمرێنم دوو کەسی هێنا یەکێکیانی کوشت و یەکێکیانی نەکوشت وتی: ئەوەم مراندو ئەوەم ژیاندئیبراهیمفەرمووی : پەروەردگاری من خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێ و لە خۆرئاواوە ئاوای ئەکات، ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەیت با بۆ سبەینێ خۆر لە خۆرئاواوە هەڵبێت(نەمرودی) کافری دەمکوت کرد وە هیچ بەڵگەی پێ نەما وە سەرسام بوو بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی کەسانی زاڵم و ستەمکار نادات، خوای گەورە بە مێشێك سزای دا کە چووە ناو لوتیەوە دەبوایە بە چەکوشی ئاسن لەسەری خۆی بدایا تا هێور بوایەتەوە وە هەر بەو مێشە کوشتی

ئەم ڕووداوەی کە ڕوویداوە پێش شکاندنی بتەکانە کە ئاگر بۆ ئیبراهیم کە باسی زیندووبوونەوە و مردن دەکات، واز لە حوججە و ئەو بەڵگەیە دەهێنێت و دەڕوات بۆ بەڵگەی ئەقڵی و کەونی، خۆ ئەگەر ئەو کارە کە خەڵکەکە ئەنجامی دا و ئیبراهیمیان خستە ناو ئاگر ڕوویبدایە ئەوا زۆر ئاسان بوو بۆ ئیبراهیم و وەڵامی دەدایەوە بەوەی کە منتان خستە ناو ئاگر و نەسوتام و نەمردم، ئیتر کوا مردن و ژیان بەدەست تۆیە! (خوای گەورەش لە هەمووان زاناترە).

لە سۆنگەی ئەم ڕووداوانەوە پلەبەندی زەمەن و کاتەکان لای نووسەر بەو شێوەیەیە لەدوای ئەو گفتوگۆیە، پاشان ئیبراهیم لە دەرئەنجامەکەیدا داوای چۆنیەتی زیندوبوونەوە دەکات، خوای پەروەردگار کە چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە، ئەم بۆچوونەشم هەر لە ئەنجامی ڕێکخستنی زەمەنەکەوە وەرگرتووە، چونکە ئەم گومانە دروست نابێت کە خۆی بە موعجیزە هەموو یاساکانی ئەم گەردوونەی بۆ وەستاو ئاگر خۆشترین جێگای ئیبراهیم بووە، لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین کە ئیبراهیم گومانی لە مردن و زیندو بوونەوە نییە، وەکو خودی ئەنجامدانی کارەکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، بەڵکو داوای (کەیفییەت) واتا چۆنیەتی دەکات، ئەمەش گومانی زانستییە بۆ یەقین و دڵنیایی، ئەگەر تەماشای وشەی ئایەتەکە بکەین زۆر جوان دیارە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾﴾ البقرة

واتە: کاتێ کە ئیبراهیم وتی: پەروەردگارا نیشانم بدە کە تۆ چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە خوا فەرمووی: مەگەر باوەڕت پێی نییە؟

سەرنج بدەین وشەی (کیف) هاتووە، ئەمەش چۆنیەتییە، هەر لەم بارەوە (ئیمامی ڕازی) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: مەبەست چۆنیەتی گەڕاندنەوەی ڕۆحە بۆلاشە بە شێوەیەکی ئاسان.

لەدوای ئەم ڕووداوانە بە دڵنیایی و یەقینەوە بەردەوامبوونی لە بانگەواز و بانگەشەی ئایینی ئیسلامی حەنیف، گوێ نەدانی بە بانگەوازەکەی ئیبراهیم، بۆیە بڕیاری دا کە لە ڕووی کردار و پراکتیکەوە پێیان بسەلمێنێت ئەم پێگەیشتووەیە لە کامڵبوونی ئەقڵانی بوونە، هەڵبەت بۆ خەڵکی ئاقڵ و خاوەن بیرو هۆشە، بەڵام کەسێک کە وەرزش بە ئەقڵی نەکات بە دڵنیاییەوە هەر بەڵگەیەکی زانستی ئەقڵانی نیشان بدەیت هەر حەزی بە تەمەڵی و جاهیلییە.

خوای گەورە دیمەنی بانگەواز و پاشان ڕووداوی شکاندنی بتەکانمان لە قورئاندا بۆ دەگوازێتەوە و زاتی بەرزی دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ۝٥١إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ۝٥٢قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ۝٥٣قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ۝٥٤قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ۝٥٥قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ۝٥٦وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ۝٥٧فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ۝٥٨قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ۝٥٩قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ۝٦٠قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ۝٦١قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ۝٦٢قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ۝٦٣فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ۝٦٤ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ۝٦٥قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ۝٦٦أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ۝٦٧قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ۝٦٨قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ۝٦٩وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ۝٧٠﴾ الأنبياء

واتە: ئێمە ژیریی و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام بەخشی، ئێمە چاک ئەومان دەناسی۝٥١ کاتێک کە بە باوك و قەومەکەی وت: ئەم بت و پەیکەرانە چییە؟! ئێوە بە دەوریدا دێن و دەیانپەرستن۝٥٢ وتیان: ئێمە باوانمان بینیوە ئەمانەیان پەرستووە۝٥٣ وتی: بەڕاستی ئێوە و باوانی ئێوە لە گومراییەکی ئاشکرا بوون۝٥٤ وتیان: بەڕاست، تۆ تۆ حەقیقەتت بۆ ئێمە هێناوە یا گاڵتە دەکەیت؟۝٥٥ وتی: (من گاڵتە ناکەم) بەڵکو (دەمەوێت تێتان بگەیەنم) کە پەروەردگارتان

پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە و هەر ئەویش بەدیهێناون، من لەسەر ئەو بیرو باوەڕە لە شایەت و ئاگاکانم﴿٥٦﴾ بە خوا نەخشەیەك دەکێشم بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی بەجێیان دێڵن﴿٥٧﴾ ئینجا هەموویانی وردو خاش کرد جگە لە بتە گەورەکەیان، بەڵکو کە گەڕانەوە (پرسیار بکەن) و یەخەی ئەو بگرن﴿٥٨﴾ وتیان: ئەوە کێ ئاوای لە خواکانمان کردووە، بەڕاستی کەسێکە لە ڕیزی ستەمکاراندایە﴿٥٩﴾ وتیان: گوێمان لە لاوێك بوو باسی دەکردن و ناوی دەهێنان، پێی دەوترێ ئیبراهیم﴿٦٠﴾ وتیان: بیهێنن بە بەرچاوی خەڵکەوە (موحاسەبەی بکەین و لێی بکۆڵینەوە) با ئەوانیش بەئاگابن﴿٦١﴾ وتیان: باشە ئەی ئیبراهیم تۆ ئاوات کردووە بە خواکانمان؟﴿٦٢﴾ ئیبراهیم وتی: (بۆچی لە من دەپرسن، خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە) دەڵێی هەر کاری ئەم بتە زلەیە، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن﴿٦٣﴾ لە دڵی خۆیاندا لێکیان دایەوە، سەرئەنجام وتیان بەخۆیان: بەڕاستی هەر ئێوە خۆتان ستەمکارن (ئیبراهیم ڕاست دەکات ئەمانە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، چۆن دەتوانن بەرگری لە ئێمە بکەن)﴿٦٤﴾ سواری سەری خۆیان بوون و (گەڕانەوە بۆ نەفامییان و) وتیان: بێگومان تۆ دەزانی کە ئەوانە قسە ناکەن﴿٦٥﴾ ئیبراهیم وتی: باشە ئاخر چۆن شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یا زیانێکتان پێ بگەیەنێت﴿٦٦﴾ هاوارو ئۆف لە ئێوەو لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن ئایا ئەوە تێناگەن و بیروهۆشتان ناخەنەکار﴿٦٧﴾ وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن، پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت﴿٦٨﴾ وتمان: ئەی ئاگر ببە بە ساردیی و سەلامەتیی لەسەر ئیبراهیم﴿٦٩﴾ ئەوانە ویستیان پیلان بگێڕن (دژی ئیبراهیم) بەڵام ئێمە ئەوانمان خەسارەتمەندو ڕیسوا کرد﴿٧٠﴾

هەموو ئەنجامدانی کارەکە بۆ ئەوە نەبوو کە دەمارگیری پەڕگیری بڵاوبکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ئاستی ڕاستی و حەق و ئەقڵانی بوونی ئیبراهیم دا ئەوان ترس و تۆقاندن و کوشتنیان بەکار هێناو بڕیاری سوتاندنی ئەو گەنجەیان دا، بە هۆکاری شکاندنی بت و پەیکەرەکانیان بە دەستی خۆیان و باوکی ئیبراهیم دروستکرابوو.

لە ئەنجامی کارەکەی ئیبراهیم گەورە و بچووکی شاری بابل ڕازی بوون لە سەر سوتاندنی تەنانەت لە مێژووی طەبەری و ئیبن کەثیردا هاتووە پیرێژنێکی بەساڵاچووی نەخۆش داری کۆدەکردەوە بۆ سوتاندنی و کەسێکی کورد بەناوی (هیزن) بۆ یەکەمجار مەنجەنیقی دروست کرد و ئیبراهیم خرایە ناو مەنجەنیقەکەی و هەڵدرا بۆناو ئاگرەکە، لە ڕاستیدا ئەم وتەیە هیچ سەنەدێکی نییە و تەنها باسێکی بێ سەرچاوەیە لە دوو کتێبی مێژوودا هاتووە.

هەموو خەڵکی بابل و بەئامادەبوونی نەمرووود تەماشای سوتاندنی ئیبراهیم دەکەن، ئیبراهیم لە ناوەڕاستی بڵێسەی ئاگردایە و ناسوتێت، ئەمەش بەتەواوی جێگای سەرنج بوو بۆ نەمرووود، بۆیە هاواری کرد دەتوانێت لە ئاگرەکە بێیتە دەرەوە؟

ئیبراهیم زۆر بە ئاسانی وتی بەڵێ، کە هاتە دەرەوە لەبەرچاوی هەموویاندا نەسوتابوو، هەر ئەمەش وایکرد لە نەمرووود کە ئیبراهیم دووربخاتەوە لەشاری بابل و بینێرێت بەرەو شام تا لەوێ بانگەواز بکات، لە ڕیوایەتە مێژوویەکاندا هاتووە کە گوایە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بەستراوەتەوە، لەدوای سوتانی لە گوریسەکە هاتۆتە دەرەوە لە ئاگرەکە، پاشان خەڵکانێک ئیمانیان پێ هێناوە کە نەمرووود بەمەی زانیوە بۆ گەڕانەوەی کەرامەتی شکاوی خۆی بە سەرکردایەتی سوپایەک دەکەوێتە شوێن حەزرەتی ئیبراهیم و ئیمانداراني تر، بەڵام خوای گەورە بە سوپاکەی خۆی کە بە بچووکترین سوپا هەژمار دەکرێت لەناویان دەبات ئەویش بە مێشوولە!

یاخود دەڵێن سوپاکەی کشاوە دواوە و نەیتوانی لەبەر مێشوولەکان شوێنیان بکەون، هەر ئەو سوپایە بووە هۆکاری کوشتنی نەمرووود.

لەسەر سوتاندنی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ چوونە ناو ئاگرەکە، باسوخواست زۆرە گوایە ناو ئاگرەکەی بۆ بووە باخ و بێستان و فریشتەی سێبەری لەگەڵ دا بووە، یاخود جوبریل عارەقی ناوچاوی سڕیوە، یاخود دەڵێن ٤٠ ڕۆژ لەناو ئاگرەکەدا بووە، یاخود جوبرائیل، هاتووە بۆلای و وتوویەتی چیت دەویت؟ گوایە حەزرەتی ئیبراهیم وتوویەتی من پێویستم بە تۆ نییە، پێویستم بە خوای تۆیە، ئەمە هەر زۆر لاوازە، جوبرائیل لە خۆیەوە بێ فەرمانی خوای گەورە نایەتە لای هیچ مرۆڤێک با پێغەمبەریش بێت!

زۆرێک لەو ڕیوایەتانە نەک لاوازە بەڵکو زۆربەی درۆ و هەڵبەستراوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجی نووسەرە کە لە فەرموودەیەی ڕاست و (صحيح) دا هاتووە کە مارمێلکە فووی کردووە بە ئاگرەکەدا تا خۆشی بکات، هەرچەندە ئاگرێک بەو گەورەیە فوی مارمێلکە چ هۆکارێک بێت، لەبەر ئەوە هیچ تەفسیرێکم بۆی نییە و بۆ جیلی داهاتووی بەجێ دەهێڵم و فەرموودەکەش بە چەند شێوە ڕیوایەت کراوە لە خاتوو عائیشەوە.

بەڵام جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم لە یەکێک لە بانگخوازەکانی مەغریب گوێم لێ بووە دەڵێت: گوایە لاشەی (الوزغ) واتا مارمێلکە جۆرێک لە گازی کوشندەی هەیە، وتەکەشی لە کەناڵی قورئانی کەریم لە جەزائیر دا بوو کە ناسراوە بە کەناڵ ٥.

مێژوونووسان و ڕاڤەکاران دەڵێن: لەدوای لەناوچوونی نەمروودی کوڕی فالحی کوڕی عابری کوڕی صاڵحی کوڕی ئەرفەخەشدی کوڕی سامی کوڕی نووح، لەناو خەڵکیدا هەواڵ بڵاو بوویەوە زیاتر ئیبراهیم ناووناوبانگی دەرکرد و بۆ بانگەوازەکەی ئیبراهیم بە ناوچەکەدا دەگەڕا و لە حەران و حەڵەب و ناوچەی خەلیل لە فەڵەستین و پاشان میسر و حیجازدا بۆ بانگەواز کردن دەگەڕا.

## هیجرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ شام و میسر

لەدوای ئەوەی لە بابلیۆن (بابل) دەرچوو بەرەو حەران، لووط یەکێک بوو لەو ئیماندارانە بەڵام کە حەزرەتی ئیبراهیم بڕیاری هیجرەتی دا لووطیش بڕیاری دا لەگەڵیدا بێت و هیجرەت بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝﴾ العنكبوت

واتە: ئینجا لووط عَلَيْهِ السَّلَامُ باوەڕی پێ هێنا، ئیبراهیم دوای ئەوەی کە نائومێد بوو لە قەومەکەی وتی : بەڕاستی من ئیتر کۆچ دەکەم بۆلای پەروەردگارم (بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو بۆم دیاری دەکات ) چوونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی زۆر بە دەسەڵات و دانایە.

پاشان حەزرەتی ئیبراهیم (سارا) خاتوونی خێزانی هێنا کە دەڵێن کچی مامی خۆیەتی، ئەوانەشی کە دەڵێن سارا خاتوون کچی دەسەڵاتدار و حاکمی حەران بووە، هەر ڕاستە چونکە مامی حەزرەتی ئیبراهیم کە براگەورەی باوکی حەزرەتی ئیبراهیمە (ئازەر) نەمروود کردویەتییە پادشا، یاخود حاکم و دەسەڵاتداری ناوچەی حەران، بۆیە من هەردوو ڕاکانم کۆکردەوە ئەو ئەنجامەی لێ دەرچوو بە بەڵگەی ئەوەی دەسەڵاتداری حەران و مامی ئیبراهیم هەریەک ناویان هەیە!

لە دوای ژنهێنانی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بە ناوچەکاندا دەگەڕا هۆکاری یەکەمی بانگەواز بوو بۆ یەکتاپەرستی، هۆکاری دووەمی خەریکی ئاژەڵداری بوو لەگەڵ بانگەوازەکەشیدا بازرگانی دەکرد، حەزرەتی ئیبراهیم ناسرابوو لەهەموو ناوچەکاندا و خەڵکی بە گشتی خۆشیان دەویست، لەدوای ئەوەی کە زانرا نەیانتوانییوە بیسوتێنن و بە موعجیزە لەئاگرەکە ڕزگاری بووە ڕێزو مەکانەتی تایبەتی هەبوو لەناو خەڵکی شام و میسر دا، هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم و لووط-ەوە وردە وردە ژیار و شارستانییەت لە یۆنان دامەزرا، هەرچەندە وشەی (یۆنان) ناوی یەکێکە لە پێغەمبەران، لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێئەدەین، ئەو ناوچانە ناسراو بووە بە (دانوب)

و دواتر ناوی (گریکی) وەرگرتووە، عەرەب و جوولەکە و ناوچەکانی ئەنادۆڵ بە (یۆنان) ناویان بردووە.




## هەڵبەستنی گومانی ناڕەوا و درۆ بۆ حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا﴾ مریم

واتە: لە کتێبی (قورئاندا) باسی (گۆشەیەک لە بەسەرهاتی) ئیبراهیم (بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە) ئەو کەسایەتییەک بووە، کە پێغەمبەرو ڕاست و ڕاستگۆ بوو.

لێرەدا خوای موتەعال بە ڕاشکاوانە دەفەرموێت: ئیبراهیم لە ڕاستگۆکانە بە واتایەکی تر (کان صدیقا) بەواتای ڕاستگۆیی زۆر دێت، وەکو عەرەب دەڵێت: (موبالغە لە ڕاستگۆیی)دا تەماشای هەموو تەفسیرەکانم کرد ئەوانەی کە لە زیندان لامبوون هەموو ئەوەیان پشت ڕاست

دەکردەوە کە ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕاستگۆترینەکانە، نموونەی تەفسیرەکانی (في ظلال القرآن، صفوة التفاسير، تفسير الجلالين، تفسير المسير للسعدى و ابن کەثیر) هەموو کۆڕان.

بەڵام زۆرێک لە ڕاڤەکاران و مێژوونووسان فەرموودەیەکیان هێناوە لە بوخاری بە (موقوف) واتا بەوەستاوی لەسەر ئەبو هورەیرە و لە تەفسیری طەبەری لە وتەی زانای بەڕێز (السدى) ئەبو داوود النسائي هەروەها ئیمامی ئەحمەد هەموویان (وەستاوە لەسەر هاوەڵان یان لاوازە) (موقوف او ضعيفا) کە گوایە حەزرەتی ئیبراهیم سێ درۆی کردووە (پەنا بەخوا) ئەم فەرموودەیەش دراوەتە پەنای پێغەمبەر و هاوەڵان کە ئەگەر مرۆڤ لێی ورد بێتەوە هەر کوفرێکی تەواوە و قورئان بە درۆ دەخاتەوە، خوای موتەعال بە ڕاشکاوانە دەفەرموێت: لە ڕاستگۆترینە، کەچی فەرموودە هاتووە دەڵێت سێ درۆی کردووە؟!

ئاخر ئەمە نەک جێگای نابێتەوە لە زانست و ئەقڵی مرۆڤی خواناس دا، هەر جێگای باوەڕی مرۆڤی زۆر سادە و ساناش نییە، پاشان لە سورەتی مریم خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە خۆی و منداڵەکانی خاوەنی زمانێکی ڕاستگۆ بوون: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾﴾ مريم

واتە: بێگومان ئێمە لە ڕەحمەت و بەخشندەیی خۆمان هەموویانمان بەهرەوەر کرد، وە ئێمە زمانی (خەڵکی دیندارمان) هێناوەتە گفتوگۆ (کە هەتا دنیا دنیایە) باسی ئەوانە بەچاکی و پاکیی و بڵندیی بکەن.

پێدەچێت هەموویان لە ئیبن ئیسحاقەوە وەریانگرتبێت، ئیبن ئیسحاقیش لە لاوازەکانە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا.

ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئیبراهیم سێ درۆی کردووە لە ژیانیدا بێجگە ئەم سێ درۆیە لە ژیانیدا درۆی تری نەکردووە! دوانیان لەبەر خوا درۆی کردووە، گوایە ئەم ئایەتە یەکێکە لە درۆکانی، پەنا بەخوا (إني سقيم) زۆرێک بە نەخۆشی لێکیان داوەتەوە، درۆی دووەمیان گوایە ئەو کاتەیە کە بتەکانی شکاندووە، پاچ و تەورەکەی داوەتە دەست بتە گەورەکە (بل فعله كبيرهم هذا)، سێیەم درۆ گوایە کاتێک بووە کە چوون بۆ وڵاتی میسر پادشاکەی زۆر زاڵم دەبێت و هەر ئافرەتێکی بەدڵ بێت دەیکاتە خێزانی خۆی و مێردەکەی دەکوژێت، ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم بە سارا خاتوون دەڵێت: بە درۆم مەخەرەوە من و تۆ خوشک و براین، چونکە لەسەر ئەم زەوییەدا ئیمانداری تێدا نییە بێجگە من و تۆ، لە درێژەی فەرموودەکەدا باس لەوە دەکات

کە بە موعجیزە پادشاکە توانای نابێت بڕواتە لای خاتوو سارا و خزمەتکارێکی پێشکەش دەکات بەناوی (هاجەر خاتوون)[92].

## شیکارییەک بۆ ئەم باسە

مرۆڤ کاتێک ئەم بەناو فەرموودەیە دەخوێنێتەوە ڕاستەوخۆ هەست دەکات کە هیچ پەیوەندی نییە بە وتەی پێغەمبەری خواوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز دژی قورئان وتەی نەفەرمووە، لێرەدا سێ درۆ دەداتە پەنای حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ کە حاشا ئەوە لە پێغەمبەر ﷺ ناوەشێتەوە و هەروەها قسەی واش ناخاتە پەنای باوکی خۆی و هەموو پێغەمبەران و هەرگیز پێغەمبەری خوا دژی کەلامی خوا قسەی نەکردووە.

لەم بەناو فەرموودەیەدا ڕێک دژی قورئانە، گومانمان لەوە نییە کە هەر فەرموودەیەک دژی قورئان بێت وەرناگیرێت.

وشەی (سقیم) بەواتای نەخۆش نایەت، بەواتای بێزاری و بێتاقەتی و نائارامی دڵ و دەروون دێت، ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ هیچ درۆیەکی نەکردووە لەبەردەوامی بانگەوازدا بووە لەگەڵیاندا، بەڵام ئەوان بەردەوام بوون لە بت پەرستی و خوانەناسی، ئیتر چۆن بێزار و دڵ ناڕەحەت و نائارام نابێت؟

کەواتە ڕاستی فەرموو حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بەڕاستی نائارام و دڵتەنگ و بێزار و ناڕەحەت بووە لە دەستیان، هەر بۆیە بڕیاری ڕاستی داوە کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی بۆنەی ئایینی ئەواندا نابێت، ئەم خۆی پێغەمبەرە و دژی بتەکانی ئەوانە، ئیتر چۆن دەڕواتە دەرەوە لەگەڵیاندا، پاشان لە کوێدایە درۆ کردن لەم بڕگەیەدا، حاشا لە باوکمان ئیبراهیم.

لەو ئایەتەدا کەبەناوی درۆی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بەکاری دەهێنن کە لە سورەتی الأنبياء دایە خوای گەورە ڕووداوەکەمان بە تەواوەتی بۆ باس دەکات، بەڵام لەو دەقەدا تەنها

---

[92] لَمْ يَكْذِبْ إبْرَاهِيمُ عليه السَّلَامُ إلَّا ثَلَاثَ كَذَبَاتٍ، ثِنْتَيْنِ منهنَّ في ذَاتِ اللَّهِ عزَّ وجلَّ؛ قَوْلُهُ ﴿فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ﴾ الصافات، وقَوْلُهُ: ﴿... بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا ...﴾ الأنبياء وقالَ: بيْنَا هو ذَاتَ يَومٍ وسَارَةُ، إذْ أتَى علَى جَبَّارٍ مِنَ الجَبَابِرَةِ، فقيلَ له: إنَّ هَاهُنَا رَجُلًا معهُ امْرَأَةٌ من أحْسَنِ النَّاسِ، فأرْسَلَ إلَيْه فَسَأَلَهُ عَنْهَا، فَقالَ: مَن هذه؟ قالَ: أُخْتِي، فأتَى سَارَةَ قالَ: يا سَارَةُ، ليسَ علَى وجْهِ الأرْضِ مُؤْمِنٌ غيرِي وغَيْرَكِ، وإنَّ هذا سَأَلَنِي فأخْبَرْتُهُ أنَّكِ أُخْتِي، فلا تُكَذِّبِينِي، فأرْسَلَ إلَيْهَا، فَلَمَّا دَخَلَتْ عليه ذَهَبَ يَتَنَاوَلُهَا بيَدِهِ فَأُخِذَ، فَقالَ: ادْعِي اللَّهَ لِي ولَا أضُرُّكِ، فَدَعَتِ اللَّهَ فَأُطْلِقَ، ثُمَّ تَنَاوَلَهَا الثَّانِيَةَ، فَأُخِذَ مِثْلَهَا أوْ أشَدَّ، فَقالَ: ادْعِي اللَّهَ لي ولَا أضُرُّكِ، فَدَعَتْ فَأُطْلِقَ، فَدَعَا بَعْضَ حَجَبَتِه، فَقالَ :إنَّكُمْ لَمْ تَأْتُونِي بإنْسَانٍ، إنَّما أتَيْتُمُونِي بشيطَانٍ !فأخْدَمَهَا هَاجَرَ، فأتَتْهُ وهو قَائِمٌ يُصَلِّي، فأوْمَأَ بيَدِهِ :مَهْيَا، قالَتْ: رَدَّ اللَّهُ كَيْدَ الكَافِرِ -أوِ الفَاجِرِ- في نَحْرِهِ، وأَخْدَمَ هَاجَرَ. قالَ أبو هُرَيْرَةَ: تِلكَ أُمُّكُمْ يا بَنِي مَاءِ السَّمَاءِ. موقفا رواهَ البخاري، رقم ٣٣٥٨، في أحاديثَ الأنبياء.

ئەوەی کە مەبەستە دانراوە لە ئایەتەکە ئەویش (بل فعله کبیرهم هذا)، لە ڕاستیدا ئەم درۆ نییە، بەڵکو گاڵتە پێکردنە بە پیاوانی ئایینی و بتپەرستەکان بەگشتی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ﴿٦٣﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئیبراهیم وتی: (بۆچی لە من دەپرسن، خۆ بتە گەورەکە ساغ و سەلیمە) دەڵێی هەر کاری ئەم بتە زلەیە، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن.

بەڵام ئەوانەی کە ئەم قسەیان هەڵبەستووە بیریان چۆتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّواْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾﴾ الأنبياء

واتە: (ئینجا ئیبراهیم لەبەر خۆیەوە سوێندی خواردو وتی:) بەخوا نەخشەیەك دەکێشم بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی بەجێیان دێڵن.

خوای گەورە دەفەرموێت لەسەر زمانی ئیبراهیم، سوێند بەخوا بەرانبەر بە بتەکانتان پلانی سەرکەوتوو دادەڕێژم کە پشتتان هەڵکرد، ئەوەتا بە ئاشکرا پێی وتوون خۆ هۆزەکەش بۆ بچووککردنەوەی ئیبراهیم دەڵێن، ﴿قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ﴿٦٠﴾﴾ الأنبياء

واتە: وتیان: گوێمان لە لاوێك بوو باسی دەکردن و ناوی دەهێنان، پێی دەوترێ ئیبراهیم.

لێرەدا هیچ درۆیەک نییە، بەڵکو هەمووی بەڕاستگۆیی باسکردووە حەزرەتی ئیبراهیم.

هیجرەتی سارا خاتوون لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم بۆ میسر، ئەم وتەیە لە هیچ جێگایەکی ئیسلامدا نەهاتووە کە پادشای میسر ئەو کارەی ئەنجام دابێت، بەڵکو ئەمە لە تەوراتەوە وەرگیراوە، تەنانەت بەدرۆزن دانانی حەزرەتی ئیبراهیم لە (سفری تکوین لە باسەکانی ١٦،١٧،١٨ و ١٩)دا هاتووە، کە وەک نووسەر کاتێک تەماشای پەیمانی کۆنم کرد ئەو دەقانەیە لە تەوراتی دەستکاریکراوی یەهوود و نەسارا کراوە، بە فەرموودەی پێغەمبەر و خزندوویانەتە ناو ئیسلام، لە کتێبی مێژووی ئیسلامی فەرموودەکاندا تێکەڵ کراوە.

## بۆچوونی نووسەر

لەم فەرموودەیەدا پێدەچێت لای نەسارا ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بە پێغەمبەر نازانن، بۆ ناشرینکردنی ئەم قسانەیان دابێتە پاڵی و یەهوودیش بۆ بەشی دووەمی بەرەبابی ئیبراهیمی لە ئیسماعیلەوە خاتوو هاجەرە بە ئافرەتێکی خزمەتکار و بێ نەسەب نیشان بدەن دژی عەرەب

بۆ ناشرینکردنی بنەڕەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامیدا باسی هاجەرە خاتوون نەکراوە کە کەنیزەکی پادشای میسر بووبێت، پاشان ئەگەری ئەوەی هەیە کە هاجەرە خاتوون ئافرەتێکی ناوداری وڵاتی میسر بووبێت و بووبێتە هاوەڵی سارا خاتوون، خودی سارا خاتوون بۆ هاوسەرەکی خواستووە، چۆن سارا خاتوون دەڵێت بڕۆ هاجەرە خاتوون بەرەو بۆ خۆت منداڵی لێ دروست بکە، ئاخر ئەگەر ئافرەتەکە قابیلی خواستن نەبێت بە دڵنیاییەوە حەزرەتی ئیبراهیم ڕازی نابێت.

پاشان لە بەناو فەرموودەکەدا هاتووە کە ئیبراهیم دەڵێت: لەسەر زەوی ئیمانداری تێدا نییە ئەی حەزرەتی لووط ئەی ئەوانەی کە ئیمانیان هێنا بە خوای ئیبراهیم، پاشان پێغەمبەرێک لە دەسەڵاتی نەمرود خوای گەورە ڕزگاری کردووە چۆن دەڵێت: بە خێزانی لە ترسی ئەوەی نەمکوژن دەڵێم تۆ خوشکمیت؟ ئاخر ئەمە لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە، چۆن پێغەمبەر خێزانی خۆی دەخاتە بن دەستی پیاوی زاڵم، بەهەرحاڵ بەهەر شێوەیەک بیری لێ دەکرێتەوە دژی ئیسلام و بیروباوەڕی ئیماندارانە.

لێرەدا بە پەسەندی دەزانین کە ئەم مێژووە لایەقی پێغەمبەرانی بێت، دەبێت خاتوو سارا خاتوو هاجەری بۆ ئیبراهیمی مێردی هەڵبژاردووە، ئەو وشەیەش هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە کە گوایە سارا خاتوون هاجەرە خاتوونی دەرکردبێت و ناردوێتی بۆ ناوچەی مەککە کە بەناوچەی فاران ناسراو بووە.

ئەگەر ئەم بۆچوونە ڕاست بێت، ئەی فەرمانی خوای پەروەردگار چی بەسەرهات، کەواتە پەیوەندی بە خانەوادەی ئیبراهیمەوە نەبووە، بەڵکو فەرمانی خوای پەروەردگار بووە کە دەبێت لە ئیبراهیم دوو بەرەباب جیابێتەوە و حوکمی هەموو جیهان بکەن تا ڕۆژی قیامەت، ئەمەش فەزڵ و گەورەیی حەزرەتی ئیبراهیمە، پاشان کاری ناپەسەند لەباوکی پێغەمبەران بوەشێتەوە، حاشا! کە ئەوە وتەی خواناس و ئیماندار نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ④﴾ الممتحنة

واتە: بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان (خراوەتە بەرچاو)، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: (دوای ساڵەها بانگەواز) ئێمە بەرین لە ئێوەو لەو

شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئایینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپابووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دێنن، جگە لەو قسەو (بەڵێنەی) ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەن، بێگومان دەسەڵاتی خوایشم نیە (ئەگەر کارەساتیکت بەسەر بێنێت)، (ئینجا وتی): پەروەردگارا هەر پشت بە تۆ دەبەستین و ڕوودەکەینە دەروازەی ڕەحمەتی تۆ، گەڕانەوەشمان بۆلای تۆیە لەڕاستیدا ئیبراهیم بەتەنها خۆی ئوممەتێک بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾﴾ النحل

واتە: بەڕاستی ئیبراهیم هەر خۆی ئوممەتێك بوو، (هەر خۆی پێشەوایەك بوو) ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بوو، هەرگیز لە موشریك و هاوەڵپەرستان نەبوو﴿١٢٠﴾ زۆر سوپاسگوزاری خوا بوو لە بەرانبەر ناز و نیعمەتی بێشوماری پەروەردگارییەوە، ئەویش هەڵیبژاردو ڕێنموویی کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست﴿١٢١﴾ ئێمە هەر لە دنیادا چاکەمان پێبەخشی و پاداشتی چاکەمان دایەوە (بەبەخشینی هاوسەری پاك و نەوەی خواناس)، ئەو لەجیهانی داهاتوودا لەڕیزی چاکاندایە﴿١٢٢﴾

## مێژووی ڕووداوەکانی ژیانی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بۆ بە ئوممەت بوون

ئیبراهیم لە هەموو ناوچەکان ئایینی خوای گەورەی بڵاودەکردەوە و خۆی و ئەوانەشی کە لەگەڵیدا بوون، چونکە ئایەتەکە باسی (الذین معه) ئەمەش مەبەست لە خێزانەکەی نییە، بەڵکو مەبەست لە ئیماندارانە، بانگەوازی ئیبراهیمی پەیوەست نەبووە بە ناوچەیەکەوە، بەڵکو پەیوەست بوو بە جیهانەوە. بۆیە لە کەنعان، بابل، کلدانی و میسری و...هتد شوێن ئایینی حەنیفی ئیسلام کەوتن و هەر ئەویش بوو ناوی ناین بە موسڵمان، ﴿وَجَٰهِدُوا۟ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾﴾ الحج

واتە: هەروەها بەردەوام بن لە خەبات و جیهاد و هەوڵ و کۆشش لە پێناوی خوادا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، لەبەر خاتری ئەو بێت، ئەو زاتە بۆ ئەوە هەڵی بژاردوون و لە ئایین

و بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی نارەواو قورس و گرانی لەسەر دانەناون (کە نەتوانن ئەنجامی بدەن، جا ئەم بەرنامەیە) ڕێ و شوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باواتانە کە پێشتر هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناوی بردوون، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە (کە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون) و ئێوەش (بە گەیاندنی ئەو پەیامە (ببنە شایەت بەسەر خەڵکییەوە، کەواتە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش لە ماڵ و سامان و زانستی و هێزتان) دەربکەن و پشت بەخوا ببەستن، چوونکە هەر ئەو زاتە یارو یاوەرتانە، جا دڵنیابن کە خوا چەندە یارمەتیدەرێکی چاکە و چەندە پشت و پەنایەکی بەهێزو بە نرخە.

توخمی ئوممەت پەیوەندی بیروباوەڕ دروستی دەکات، نە خاک و هۆز و میللەت و زمان، ئوممەت هەموو ئەمانە تێدەپەڕێنێت و مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای بیروباوەڕ و پابەند بوون ڕێکدەخات.

ئەوەش کاری سەخت و گەورەی ئیبراهیم عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ بوو لە بانگەوازی یەکتاپەرستی، ئوممەتی دروست کرد بۆ بونیادنانی خیلافەت لە سەرزەوی.

ئوممەتیش دروست نابێت ئەگەر وەحدەتی بیروباوەڕی نەبێت لەگەڵ بزاوتێک یان کۆمەڵە نوخبەیەک کە ئەو مەنهەجە هەڵبگرن، تا بتوانن بزاوتەکە یاخود بزاڤەکە بگەینە لوتکە و یەکتاپەرستی خوای گەورە بڵاوبکەنەوە، جا لەسەردەمانێک دەشێت نوخبەکە پێغەمبەران بن یان هاوەڵانیان یان شوێنکەوتوانیان.

بەو هۆکارەش بوو کە خاتوو سارا بیری لە خستنەوەی نەوە کردەوە کە پێداویستی ئایینەکەیە، بۆیە خۆی ڕێکی خست کەوا هاوسەرەکەی هاوسەرگیری تر بکات، دڵێکی پاک و ژنێکی سالار و سەنگین بوو. خوای گەورە لەبەر دڵپاشی و چاکی خۆی نائومێدی نەکرد، بەڵکو منداڵیشی بەخشیە ئەو ئافرەتە بەڕێزە تا بتوانن، خێزانێکی باش و

تۆکمە دروست بکەن و تا منداڵەکانیان ببنە هەوێنی دامەزراندنی ئوممەت و بەرزڕاگرتنی ئایینی خوای گەورە و

بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستی بە جیهاندا.

هەروەها لەناوچەکانی تری ئاسیا دا خێزانی تری پێکهێناوە، حەزرەتی ئیبراهیم بێجگە خاتوو سارا و خاتوو هاجەر کە هەریەکەیان خاوەنی کوڕێک بوون، سارا خاتوون حەزرەتی ئیسحاقی بووە و خاتوو هاجەر حەزرەتی ئیسماعیل.

بێجگە ئەم دوو هاوسەرە دوو هاوسەری تری هەبووە بەناوی (قەنطورا) کە ئافرەتێکی کەنعانی بووە، ٦ منداڵی لێی هەبووە بەناوی (مەدیان، زەمران، سەرج، یەشقان و نەشەق) ناوی شەشەم نەزانراوە.

خێزانێکی تری کە خەڵکی ناوچەی هیندستان بووە ناسراوە بە کچی ئەمین بەناوی (حەجون)، ئەم هاوسەرەشی خاوەنی پێنج منداڵ بووە بەناوی (کیسان، سورج، ئەمیم، لووطان، نافس).

ئەم باسە مێژوویەش لە کتێبی (التعریف و الإعلام)دا هاتووە کە نووسەرەکەی ناوی (أبو القاسم السهیلي).

## بونیادی خێزانی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ

حەزرەتی ئیبراهیم خێزانی دووەمی پێکهێنا لە وڵاتی میسر، ئەو دەمە میسر خاوەنی فیرعەون نەبووە چونکە سەرچاوەی فیرعەونی میسر لە خوارووی میسر بووە، لە (لوکسور)[٩٣] کە زۆربەیان بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ سوودانی ئەفریقی، ئەو دەمە شاری بەناوبانگ لەوڵاتی میسر تەنها شاری (ئەتەت تاوی) بووە، ئەویش خاوەنی مەلیک بووە، تێکەڵاوی خەڵکی شام بووە. زۆرێک لە مێژوونووسان دەڵێن ئەو دەمەش بابلیۆنییەکان یاخود کلدانییەکان حوکمڕانی بوون، هەموو سەر بە دەسەڵاتی نەمروود بوون. هەندێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن ئەو دەمە نەمروود و حوکمی هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کردووە، فەرموودەیەک دەهێنێت زۆرجار دەیدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە گوایە چوار پادشا حوکمی هەموو سەرزەویان کردووە، دوانیان موسڵمان بوون، سولەیمان و زولقەرنەین، دوانیان کافر بوون نەمروود و نەبوخزنەسر حوکمی سەرزەویان کردووە. لە مێژووی ئیبن کەثیردا هاتووە کە (موجاهید) و هەندێکی تر لە مێژوونووس و ڕاڤەکارانی قورئان ئەم باسەیان کردووە.

بەهەرحاڵ لەو دەمەدا میسر خاوەنی فیرعەون نەبووە، پاشان ئەو باسەی کە گوایە پادشای میسر ویستویەتی دەستدرێژی بکاتە سەر خاتوو سارا، ئەوەش دژی بیروباوەڕی ئیسلامییە و

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٣] الأقصر.

ئیسرائیلیاتی پوختە و لە تەورات باسکراوە، لای هەمووان زانراوە نەسرانییەکان ئیبراهیم بە پێغەمبەر نازانن.

کەواتە هێنانی خاتوو هاجەر و مارەکردنی وەکو ئافرەتێکی ئازاد بووە و ماوەی ژیانیان لەگەڵ خاتوو سارا دا بەیەکەوە بوون، چوونی خاتوو هاجەر بۆ دۆڵی مەککە هیچ پەیوەندی بە خاتوو ساراوە نییە، چونکە فەرمانی خوایە.

گریمان خاتوو سارا بەهۆکاری ئەوەی کە هاجەر خاتوون سکی کردووە و منداڵی بووە، ئەگەر داوای کردبێت لەبەرچاوی ون بێت، ئیبراهیم پێغەمبەر عَلَيْهِ السَّلَامُ دەیبات بۆلای ماڵی باوانی لەبابل یان ماڵی کەسووکاری خۆی لە وڵاتی میسر، ئەمە زیاتر ڕێگای تێدەچێت.

بەڵام چوونی خاتوو هاجەر بۆ دۆڵی مەککە فەرمانی خواییە و هیچ پەیوەندی بە خاتوو ساراوە نییە، پێغەمبەر ئیبراهیم کەسێکی ئەوەندە لاواز نەبووە!

لەدوای لەدایکبوونی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم فەرمانی خوای گەورە بوو کە بڕۆنە ئەو جێگایە، مانەوەیان لەو جێگایەدا فەرمانی پەروەردگارە بەو شێوەیەش نییە کە گوایە ئیبراهیم بێ هیچ توێشو و خۆراکێک کوڕێکی ساوای شیرەخۆر لەگەڵ دایکی بەجێ بهێڵێت، ئەمەش بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەبەردەست نییە، نە لە قورئان دا نە لە سووننەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا.

هەڵقووڵانی ئاوی زمزم بە دوعای خودی حەزرەتی ئیبراهیم بووە کە خوای گەورە ئەو ناوچە وشک و بێ ئاوو کشتوکاڵە پڕ خێر و بەرەکەت بکات، بونیادی کەعبەی کردەوە ئەوکات ماڵ ومنداڵەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆلای خاتوو سارا و ئیسحاقی کوڕی، ئەویش بە بەڵگەی ئەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٩ رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠﴾ إبراهيم

واتە: پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە، لەپاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لە پاڵ (بيت الحرام) دا، پەروەردگارا، بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بەچاکی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵی هەندێك لەو

خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆر بەهرەمهێندیان بکەیت، بۆئەوەی سوپاسگوزاریت بکەن۞ پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ دەزانیت چی دەشارینەوە و چی ئاشکرا دەکەین (لە کارو کردەوەمان) و هیچ شتێك لە زەوی و لە ئاسماندا لە خوای گەورە پەنهان نابێت۞ سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە تەمەنی پیریدا ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم، بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و نزایە۞ پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی، پەروەردگارا، دوعاو نزام گیرا بکە۞

لەلای من وەک نووسەر ئەم دیوە ڕاستە لە مێژووی ژیانی ئیبراهیم لە نێوان هەردوو خێزانە بەڕێزەکەیدا. ئەوانی تر کە لە کتێبە مێژوویەکاندا هاتووە بێ سەرچاوە جێگای پەسەند کردن نییەو لە ڕووی زانستی بیروباوەڕ و مێژووناسیش پێناچێت ڕاست و دروست بێت، ئەم دوعایەی ئیبراهیم لەکاتی بێ ئاوی و بێ خۆراکی بووە لەگەڵ خێزانەکەیدا هاجەر و ئیسماعیل، هەر بۆیە بە وجوودی حەزرەتی ئیبراهیم ئاوی زمزم هەڵدەقووڵێت، پێش گەڕانەوەی بۆ شام ماڵی خوای نۆژەن کردۆتەوە، پاشان لە بینینی دەنگی ئاوەکە خاتوو هاجەر چەند جارێک لە گردی سەفاوە بۆ مەروە دەڕوات و تا ئاوەکە هەڵدەقووڵێت، ئەویش لە خۆشیدا دەڵێت (زم زم) واتا کۆی دەکاتەوە تا بیکاتە حەوزێک وای زانیبوو کە ئەو ئاوە کاتییە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ڕەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل بێت، ئەگەر ئاوەکەی نەکردایەتە حەوز و کۆی نەکردایەتەوە ئەوا دەبووە سەرچاوەی ئاوی ڕۆشتوو.

پاشان فریشتەیەک دڵنەوایی دەکات و دەڵێت: مەترسە دڵنیابە کە ئەو ئاوە بەردەوام دەبێت، چونکە ئێرە ماڵی خوایە و ئەم کوڕەو باوکی ئەم ماڵە نۆژەن دەکەنەوە، خوای گەورەش خەڵکەکەی بەهەلاکەت نابات.

زۆرێک ئەوە دەکەنە هەنجەت کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بەیەکەوە کەعبەیان نۆژەن کردۆتەوە، بەڵام ئەو دەمە ئیسماعیل منداڵ بووە لەڕاستیدا حەزرەتی ئیبراهیم سەرەتا بە کەڵەکە بەرد دایدەمەزرێنێتەوە و پاشان لەگەڵ ئیسماعیل دا بونیاد و پایەو قەواعیدی بۆ دروست دەکەنەوە.

هەرچەندە باسەکەی ئێمەش لەسەر گریمانە، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی ئیبراهیم دا کە ئاماژەمان بۆ کردووە گریمانەکانمان دامەزراندووە، بە پرسی مێژوویی و جیاکردنەوەی سەردەمەکان.

واتە لە دۆڵی مەککە کەسی تیا نەژیاوە، بەڵام چواردەوری دۆڵی مەککە جۆگەلە و ئاو و مێرگی (الواحة)ی تێدابووە، بەتایبەت نزیک طائیف و نەخلە و ناوچەکانی تریش، هەروەها ئاوەدانی لە چواردەوری دۆڵی مەککەدا هەبووە، دوورو نزیک هۆزیکیش بەناوی هۆزی (جورهوم) کە لە بنەڕەتەدا یەمەنین، ئەو ماوەیە بەهۆکاری شکانی بەنداوی(سەد)ی ناوچەیەک لە یەمەن بەرەو ناوچەی مەککە کۆچ دەکەن و لە دەوروبەری ماڵی خودا بارگەو بنە دەخەن و پیرۆزی و بەرەکەتی ئەم بنەماڵە یاخود خێزانە دەبینن و زۆر ڕێزیان دەگرن، لەهەمان کاتدا حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام بانگیان دەکات بۆ ئیمان و دینداری لەو ناوچەیەدا دەمێننەوە، پاشان حەزرەتی ئیبراهیم دەگەڕێتەوە بۆ شام و خاتوو هاجەر و ئیسماعیل جێ دەهێڵێت، بۆ مەوسیمی حەج دەگەڕێتەوە، لەکاتی گەڕانەوەیدا بانگەوازی حەج دەکات لە شام و میسر و ناوچەکانی باکووری حیجاز، مەوسیمی حەج ساڵانە نەبووە، بەڵکو ماوەی پێچووە ئینجا بانگەوازی بۆ کردووە، ئەویش لەو هاتووچۆیەی نێوان شام و مەککەدا خەڵکی لێ ئاگادار کردۆتەوە، لەو ماوەیەشدا ئیسماعیل گەورە بووە و هاوکاری باوکی دەکات بۆ بەرزکردنەوەی کەعبە و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾﴾ البقرة

واتە: (بە یاد بێنە) لەوەی کە پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند فەرمانێکی دیاری کراو (کە چی بکات و چۆن بکات) ئەویش زۆر بەجوانی ئەنجامی دا، دوایی (کە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوت) خوا فەرمووی: من بڕیارم داوە بتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم وتی: (حەز دەکەم) نەوەکانیشم (بەم کارە پیرۆزە هەستن)، خوا فەرموی: پەیام و پەیمانی من نادرێ بە زاڵم و ستەمکاران﴿١٢٤﴾ (بە یاد بێنە) کە چۆن (کەعبە)مان کردە جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی، کە بەوپەڕی هێمنی و ئاسوودەییەوە لەوێ بەیەك دەگەن (دە ئێوەش، خەڵکینە) (مەقامی ئیبراهیم) کە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بوو، بیکەنە جێگای خواپەرستی و نوێژ، ئینجا فەرمانمان دا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەو خانووە خاوێن بکەنەوە (لە چەپەڵی ماددی و مەعنەوی) بۆ ئەوانەی کە بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو (طواف) دەکەن و تیای دا دەمێننەوە و (اعتکاف) دەکەن هەروەها بۆ کوڕنوشبەران و سوژدەبەران﴿١٢٥﴾ (بە یاد بێنە) کاتێك کە ئیبراهیم دوعای کردو وتی: پەروەردگارا ئەم شوێنە بگێڕی بە شوێنێکی پڕ لە ئاسایش،

ڕزق و ڕۆزی هەمە جۆر ببەخشە بە دانیشتوانی، (بەتایبەت) بەوانەی کە باوەڕیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە. (خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە دوعات گیرایە)و فەرمووی (بەڵام) ئەوەش کە کافرە بێ بەشی ناکەم لە بەرهەم و نازو نیعمەتی کەم تەمەنی ئەم دنیایە، بەڵام لەوهوودوا بەناچاریی تووشی سزای ئاگری دەکەم کە خراپترین سەرئەنجام و چارەنووسە﴿١٢٦﴾

مەککەش یەکەم ماڵی خوایە کە بونیاد نراوە سەرەتا لەلایەن ئادەمەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴿٩٦﴾﴾ آل عمران

واتە: بەڕاستی یەکەم خانەو ماڵ و مەنزڵگایەك کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی (بۆ خواپەرستی) ئەوەیە کە لە مەککەدایە کە هیدایەت و ڕێنمویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان.

لەم نێوەندەدا فەرمانی سەربڕینی ئیسماعلی کوڕی ئەدرێت بەوەحی لە ڕێگای خەو بینینەوە، هەرچەندە کارەکە ئەنجام نادرێت و خوای گەورە فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دەکات بە بەرانێک یان هەر چوار پێیەک کە شیاو بێت بۆ قوربانی لە (مەڕومالآت و وشتر و مانگا...هتد).

خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴿٩٩﴾رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ﴿١٠١﴾فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ﴿١٠٣﴾وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴿١٠٥﴾إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ﴿١٠٦﴾وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴿١٠٧﴾وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ﴿١٠٨﴾سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴿١٠٩﴾كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴿١١٠﴾إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴿١١١﴾وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴿١١٢﴾﴾ الصافات

واتە: (ئینجا ئیبراهیم) وتی: من ئیتر دەڕۆم بۆلای پەروەردگارم (دەمەوێت هەر ئەو بپەرستم)، ئەو هیدایەت و ڕێنموونیم دەکات﴿٩٩﴾ (بەتەنیا کۆچی کرد قەومی نالەباری بەجێهێشت، لەو ڕێگەو بانەدا داوای لەخوا کرد) لە صاڵح و چاکانم پێ ببەخشە﴿١٠٠﴾ ئێمەش مژدەی مناڵێکی حەلیم و خۆگرو (ژیرمان) پێ بەخشی کە (ئیسماعیل)ە﴿١٠١﴾ کاتێک کە ئەو مناڵە کەوتەدەرو ماڵ لەگەڵیا (بەیانییەک پێی وت) کوڕم، کوڕی شیرینم من لە خەوودا بینیومە کە تۆ سەردەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟! وتی: بابە گیان هەر فەرمانێکت پێ دراوە جێبەجێی

بکە، دەمبینی ئەگەر خوا حەزبکات، خوا بیەوێت لە ئارامگران دەبم﴿١٠٢﴾ کاتێک کە هەردووکیان تەسلیمی (فەرمانی پەروەردگار) بوون، ئیبراهیم بە ڕوودا (ئیسماعیل)ی خستە سەر خاک (بۆ ئەوەی سەری ببڕێت)﴿١٠٣﴾ بانگمان لێکرد کە: ئەی (ئیبراهیم)﴿١٠٤﴾ بێگومان خەوەکەت ڕاست بوو، هاتە دی، ئێمە هەر ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (لە تاقیکردنەوەکاندا سەریان دەخەین)﴿١٠٥﴾ بەڕاستی ئالەمەدا تاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو سەرسوڕهێنەر هەیە﴿١٠٦﴾ ئێمە قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی (ئیسماعیل تا لەجیاتی ئەوودا سەری ببڕێت)﴿١٠٧﴾ لەناو گەلان و نەوەکانی داهاتوودا ناوی (ئیبراهیم)مان هێشتەوە (بەڕێزو سەروەرییەوە)﴿١٠٨﴾ سڵاو و دروود و ڕێز لەسەر ئیبراهیم﴿١٠٩﴾ ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە﴿١١٠﴾ بەڕاستی ئەمیش لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە﴿١١١﴾ مژدەی هاتنە دنیای (ئیسحاق)یشمان پێ بەخشی کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان﴿١١٢﴾

ئینجا دوای ئەم ڕووداوە خوای گەورە فەرمان بە حەزرەتی ئیبراهیم دەکات و دەفەرموێت: بانگەوازی حەج بکە لەناو خەڵکیدا، چونکە ماڵی خوای گەورە بە تەواوەتی ئاوەدانە و ئامادەیە بۆ پێشوازی حاجیان و ئیماندارانی سەردەمی ئیبراهیم، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴿٢٧﴾﴾ الحج

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەیاد بێنە) کاتێك شوێنی کەعبەمان دیاری کرد بۆ ئیبراهیم (دوای تەواوبوونی، فەرمانمان پێدا) کە هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت و (بیکە بە بنکەی یەکخواناسی) و ماڵی من پاك بکەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، یاخود بە پێوەن یان لە کڕنووش و سوژدە بردندان﴿٢٦﴾ جا بانگی خەڵکی بکە و جاڕ بدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج، ئەوانیش بەپیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بەسواریی (ئەو وشترانەی کە دووریی ماوەکە) لاوازی کردوون و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێن﴿٢٧﴾

هەموو ئەم کاتانەی کە باسکرا ماوەی پێگەیشتنی ئیسماعیل-ە لە منداڵییەوە بۆ لاوێتی کەواتە بەردەوام ئیبراهیم لە هیجرەت کردن بووە لەنێوانی هەردوو خێزانەکەیدا و بەردەوامیش بووە لە بانگەوازکردنی خەڵکی دا بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلامی حەنیف.

خوای گەورە دەفەرموێت: لە بارەی ئایینی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾﴾ آل عمران

واتە: (ئاشکرایە) کە ئیبراهیم نە جوولەکە بووە نە گاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردارو موسوڵمان بووەو لەدەستەی موشریك و هاوەڵپەرستان نەبووە.

پاشان باسی ئایینی هەموو نەوەکانی دەکات خوای گەورە کەناوی ئایینی یەهوودی و نەسرانی داهێنراوی دەستی مرۆڤە، بەڵکو هەموو پێغەمبەران بە باوکیان ئیبراهیم خاوەنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوون، ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ ۚ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي ۖ قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ اللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ ۗ قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللَّهِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾﴾ البقرة

واتە: کێ لە ئایینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، مەگەر ئەو کەسەی کە گێل و نادان و وێڵ بێت، بەڕاستی ئێمە ئەومان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە و (کردومانە بە پێشەوا) و لەو دنیاشدا لە ڕیزی پیاوچاکاندایە﴿١٣٠﴾ کاتێك پەروەردگارت پێی وت: ملکەچ و فەرمانبەرداربە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری جیهانەکانم﴿١٣١﴾ ئیبراهیم وەسیەتی کرد بۆ نەوەکانی هەروەها

یەعقوبیش، (هەریەك لەوان وتوویەتی): ڕۆڵەکانم: بەڕاستی خوا ئایینی یەکتاپەرستی بۆ ئێوە بڕیار داوەو هەڵی بژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵ بدەن بە موسوڵمانی نەبێت مەمرن و (تا دوا هەناسەتان پەیڕەوی بکەن)﴿١٣٢﴾ ئایا ئێوە (ئەی جوولەکە و گاورانێك کە محەمەد بە درۆ دەخەنەوەو خۆشتان بەشوێن کەوتەی ئیبراهیم و یەعقووب دەزانن!) ئامادەی سەرەمەرگی یەعقووب بوون؟ ئەو کاتەی بە کوڕەکانی وت: دوای مردنی من چی دەپەرستن؟ هەموو وتیان: خوای تۆو باووباپیرانت ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق دەپەرستین کە تاك و تەنهایە، ئێمە هەموو تەسلیمی ئەوین و فەمانبەرداری ئەوین﴿١٣٣﴾ ئەوانە کەسانێك بوون ڕۆشتن بە خۆیان و کردەوەیانەوە، ئێوەش هەرچی دەیکەن خۆتان بەرپرسیارن بەرانبەری، پرسیاری کارو کردەوەی ئەوان لە ئێوە ناکرێ﴿١٣٤﴾ دەڵێن: وەرن ببنە جوولەکە یا گاور تا بکەونە سەر ڕێگەی ڕاست! (ئەی محەمەد ﷺ پێیان) بڵێ: (نەخێر وا ناکەین) بەڵکو شوێن ئایین و بەرنامەی ئیبراهیم دەکەوین کە پاك و دروستەو هەرگیز لە ڕیزی بتپەرستان و هاوەڵگەراندا نەبووە﴿١٣٥﴾ بڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا هێناوە، بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان، بەوەش کە دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەوەکانی یەعقوب، هەروەها بەوەش کە بۆ مووسا و عیسا و تێکڕای پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە، ئێمە هەرگیز جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانەدا، ئێمە هەمووومان تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارمانین﴿١٣٦﴾ جا ئەگەر ئەوان (جوولەکە و گاورەکان) باوەڕیان هێنا، وەك ئیمان و باوەڕی ئێوە، ئەوە مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەگەر پشتیان تێ کرد، ئەوە ئیتر دەکەونە دژایەتی و دوژمنایەتی ئێوە (بەڵام دڵنیابە ئەی محەمەد ﷺ، ئەی ئیماندار) خوا تۆ دەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان چوونکە ئەو خوایە زۆر بیسەرو زانایە﴿١٣٧﴾ ئەو ڕەنگ و نەخشەیەیە کە خوا دایڕشتووە، کێ هەیە لە خوا چاکتر ڕەنگ و نەخشەی جوان بکێشێت و دایڕێژێت، لە هەموو بارودۆخێکدا ئێمەی (ئیماندار) هەر ئەو دەپەرستین﴿١٣٨﴾ بڵێ: ئایا ڕەوایە ئێوە دەربارەی ئایینی خوا قڕەو گاڵەو کێشەمان لەگەڵ دەکەن (دەتانەوێت پێغەمبەرایەتی هەر لە ئێوەدا بێت، لە کاتێکدا کە قەدری خوایش نازانن و کوڕو هاوسەری بۆ بڕیار دەدەن!)، خۆ خۆتان چاك دەزانن کە ئەو خوایە پەروەردگاری ئێمەش و ئێوەشە، کارو کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و، کارو کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە (ئێمە لە بۆچوون و کارو کردەوەتان بەرین) وە ئێمە دڵسۆزو ملکەچین بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنە وە هەر ڕەزامەندی ئەومان مەبەستە﴿١٣٩﴾ یاخود ئێوە دەڵێن کە: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕەکانی، جوولەکە یا گاور بوون؟! پێیان بڵێ: باشە ئایا ئێوە چاکتر دەزانن یان خوا؟ جا کێ لەوە ستەمکارترە کە ڕاستییەك دەزانێت و دەیشارێتەوە، شایەتییەك دەزانێت و نایڵێت، (بێگومان) خوا بێ ئاگا نییە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی

دەدەن﴿١٣٤﴾ ئەوانە کەسانێك بوون ڕۆیشتن بە خۆیان و کردەوەیانەوە، ئێوەش هەرچی دەیکەن خۆتان بەرپرسیارن بەرانبەری، پرسیاری کارو کردەوەی ئەوان لە ئێوە ناکرێت﴿١٤١﴾

## گەڕانەوە بۆلای خاتوو سارا و ئیسحاقی کوڕی

حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام لە هاتوچۆ و هیجرەتی نێوان مەککە و شام دا بووە، جا مەبەست لە وڵاتی فەڵەستینی ئێستا دێت کە خاتوو سارا لەوێ دەژیا، دەگەڕێینەوە بۆ قووڵایی مێژوو سارا خاتوون ئافرەتێکی نەزۆک بوو منداڵی نەدەبوو، هەر ئەمەش بوو وای کرد کە حەزرەتی ئیبراهیم هاجەر خاتوون بهێنێت و ئیسماعیلی لێ ببێت، خاتوو ساراش وەکو هەموو ئافرەتێک ئاواتی دایکایەتی و نەوەی هەیە، خوای پەروەردگاریش نائومێدی ناکات و منداڵی پێ دەبەخشێ، هەرچەندە سەرچاوە مێژووییەکان نێوانی ئیسماعیل و ئیسحاق بە ١٣ ساڵ مەزەندە دەکرێت، ئەمەش تا ڕادەیەک جێگای باوەڕە، چونکە لەو نێوەندەدا ئیسماعیل زیاتر لەگەڵ باوکیدا بووە، کەمتر گەڕاوەتەوە بۆلای سارا خاتوون و بە بەڵگەی ئەوەی ڕوودا و چالاکییەکانی ئیبراهیم و ئیسماعیل زیاتر بووە تاوەکو ڕووداوەکانی ئیبراهیم و ئیسحاق سەلامی خوا لەهەموویان بێت.

هەروەها بەشێک لە ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم پەیوەندی هەیە بە ژیانی پێغەمبەر لووط-ەوە، کە لە جێگای خۆیدا زیاتر شیکاری پێ ئەدەین ژیانی ئیبراهیم وەکو ژیانی پێغەمبەرانی تر نییە، کە تەنها بۆ پەندو ئامۆژگاری باسی مێژوویی و زانیاری گشتی سوودی لێوەربگیرێت بەڵکو داوامان لێکراوە کە شوێن کەوتووی بین و لاسایی بکەینەوە، ئەویش بە درێژی لە کۆی گشتی دا باسی دەکەین، ئەوەی گرنگە لەم باسەدا لەدایکبوونی حەزرەتی ئیسحاقە کە مژدەیەکی خوایە لەلایەن دوو فریشتەوە لە تەمەنێکی پیریدا و خوای گەورە بەخشییە حەزرەتی ئیبراهیم، لە زۆر جێگای قورئاندا باسکراوە لە هەر گۆشە نیگایەکەوە مەبەست مەدلولی تایبەتی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ﴿٥٦﴾﴾ الحجر

واتە: هەروەها هەواڵیان بدەرێ دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم (علیه السلام)﴿٥١﴾ کاتێك کتوپڕ خۆیان کرد بە ماڵداو وتیان: سڵاو (ئیبراهیم دوای وەڵامدانەوەی سڵاوەکەیان) وتی: (ئێوە کێن؟)،

بەڕاستی ئێمە لێتان دەترسین﴿٥٢﴾ فریشتەکان وتیان: مەترسە (ئێمە لە لایەن خواوە ڕەوانە کراوین) و بێگومان ئێمە مژدەی (لە دایکبوونی) کوڕێکی زۆر زانات پێ دەدەین﴿٥٣﴾ ئیبراهیم وتی: ئایا مژدەم دەدەنێ لە کاتێکدا کە ئاوا پیری یەخەی پێگرتووم!.. جا بەچی مژدەم دەدەنێ؟!﴿٥٤﴾ فریشتەکان وتیان: بەڕاستی مژدەت دەدەینێ، کەواتە نەکەیت لەو کەسانە بیت کە نائومێدن (لە بەخششەکانی خوا)﴿٥٥﴾ ئیبراهیم وتی: ئایا کێ نائومێد دەبێت لە ڕەحمەت و بەخششەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێك کە گومڕاو سەرگەردانن﴿٥٦﴾

هەردوو ئەم کوڕانەی کە خوای گەورە بۆی باسکردووین، نەوەی زۆرو پێغەمبەری زۆری لە حەزرەتی ئیسحاقەوە دێن، بەڵام ئیمانداری کەم.

بە پێچەوانەوە ئیسماعیل پێغەمبەری کەم و ئیمانداری زۆر، تەنها پێغەمبەر محەمەد ﷺ لە بەرەی ئیسماعیلەوە دێت، بەڵام بەرەکەتی زۆر لە ئوممەتەکەیدایە، هەر ئەوەشە ناونراون بە (خیرأمة)، لە ئیسحاق پێغەمبەرانی زۆر هەڵبژێراون بۆ بانگەواز، بەڵام بەرهەمیان کەم بووە. هەر بۆیە ئەو گەلە ناونراون بە (گەلی هەڵبژێردراو) نەک خەڵکەکەی بەڵکو زۆری پێغەمبەرەکانی بەهۆکاری بانگەواز.

## کۆی گشتی باس لە ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ

قۆناغی ئیبراهیم لە پێغەمبەرایەتی سەردەمی دانەمەزراندنی فەلسەفە و دەستپێکی ئەو زانستە بووە لەناوچەکەدا بەگشتی، ئەم زانستەش زادەی بیروبۆچوونی مرۆڤە، لە شەیتانەوە نەهاتووە. فەلسەفە لەسەر بنەمای پرسیارکردن دادەمەزرێت، خوای گەورە بە ئایین وەڵامی هەموو پرسیارە فەلسەفییەکان و فەیلەسوفان دەداتەوە، قۆناغی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ ئەو قۆناغە جیا دەکاتەوە پرسیاری فەلسەفی بە وەڵامی وەحی، عەوداڵ بوون و گەڕان بەدوای ونبووەکاندا و دڵنیای و یەقین و ئارامی بە وەڵامی وەحی کەواتە فەلسەفە خاوەنی پرسیارە و ئیسلامیش خاوەنی وەڵامە.

حەزرەتی ئیبراهیم ئەم دوو چەمکە لەسەردەمی خۆیدا ڕوون دەکاتەوە، هەر ئەو هێز و توانا ئەقڵییەی ئیبراهیم-ە کە توانی بەرزترین گوتاری قورئانی بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، گوتارە قورئانییەکان لە هەمبەر حەزرەتی ئیبراهیم دا،

﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾﴾ النحل

واتە: بەڕاستی ئیبراهیم هەر خۆی ئوممەتێك بوو، (هەر خۆی پێشەوایەك بوو) ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بوو، هەرگیز لە موشریك و هاوەڵپەرستان نەبوو

﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴿٥١﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئێمە ژیریی و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاك ئەومان دەناسی

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴿٤﴾﴾ الممتحنة

واتە: (ئەی ئیمانداران) بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان (خراوەتە بەرچاو)، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: (دوای ساڵەها بانگەواز) ئێمە بەرین لە ئێوەو لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئایینەی ئێوە نییە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپابووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دێنن، جگە لەو قسەو (بەڵێنەی) ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەن، بێگومان دەسەڵاتی خوایشم نییە (ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بێنێت)، (ئینجا وتی): پەروەردگارا هەر پشت بە تۆ دەبەستین و ڕوودەکەینە دەروازەی ڕەحمەتی تۆ، گەڕانەوەشمان بۆلای تۆیە.

﴿۞وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة

واتە: (بە یاد بێنە) لەوەی کە پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە چەند فەرمانێکی دیاری کراو (کە چی بکات و چۆن بکات) ئەویش زۆر بەجوانی ئەنجامی دا، دوایی (کە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوت) خوا فەرمووی: من بڕیارم داوە بتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم وتی: (حەز دەکەم) نەوەکانیشم (بەم کارە پیرۆزە هەستن)، خوا فەرموی: پەیام و پەیمانی من نادرێ بە زاڵم و ستەمکاران.

﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴿١٣٠﴾﴾ البقرة

واتە: کێ لە ئایینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، مەگەر ئەو کەسەی کە گێل و نادان و وێڵ بێت، بەڕاستی ئێمە ئەومان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە و (کردومانە بە پێشەوا) لەو دنیاشدا لە ڕیزی پیاوچاکاندایە

﴿قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ آل عمران

بڵێ: خوای گەورە لە هەموو فەرمایشتەکانیا ڕاستی فەرمووە، کەواتە شوێنی ئایین و بەرنامەی ئیبراهیم بکەون کە پاك و دروست و فەرمانبەردارە، ئەو هەرگیز لە موشریك و هەلپەرستان نەبووە.

لە دەرئەنجامی ئەم گوتارە چەند پلەیەکی گەورەی بەدەست هێناوە لە (ئوممەت بوون، ئیمام بوون، خاوەن گەل بوون، پێگەیشتوو لە بواری ژیان و ئەقڵانی لەسەروو هەموویانەوە وەحی پێغەمبەرایەتی، شوێن کەوتنی، هەرکەس خۆی بە شوێنکەوتووی نەزانێت سووک و ڕیسوایە، کرۆکی یەکتاپەرستی و گەردن کەچی شکانەوە بەلای خوادا، طەرەف بوون لەگەڵ خوای موتەعال)دا، ئیبراهیم خاوەنی سێ ئیمتیازی گەورە بووە.

یەکەم: عەرەب و یەهوود هەندێکی تر لە ئایینەکان ئیبراهیم بە موڵک و خاوەنی دەزانن، لە ڕاستیدا ئیبراهیم هیچ پەیوەندی بە نەسەبەوە نییە، بەڵکو شوێنکەوتنی ئیبراهیم لە ڕێگای بیروباوەڕەوەیە.

دووەم: کۆکەرەوەی هەموو گەل و هۆز و دەوڵەتەکانی دنیایە، جا ڕۆم بێت یان حەبەشە لە کۆندا، لە ئێستادا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بێت یاخود ئایینە ئاسمانییەکان بێت بە گشتی.

سێیەم: خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی لە پانتایی ئیسلام دا و لە هیچ کام لە تەورات و ئینجیل دا ئەو گرنگییەی پێنەدراوە، ئەگەرچی لە بنەڕەتی هەموو پێغەمبەرانە و بەباوکی پێغەمبەران ناسراوە، پاشان بە باوکی ئیمانداران ناسراوە و ناویان ناوین بە (موسڵمان).

لە ڕابردوودا ئاماژەمان بەهەموو ئایەتەکان کردووە.

## گرنگیدان بە ئەقڵ و ئەقڵانی بوون

حەزرەتی ئیبراهیم گرنگی تەواوی داوە بە ئەقڵ و کاری لە سەرکردووە بەپێی ئەو زەمەن و کاتەی خواستویەتی، خوای گەورەش بە وەحی ئاراستەی کردووە، ئەوە زۆر گرنگە لە ژیانیدا بزانرێت کە پێش بوونی بە پێغەمبەر بە ئەقڵ توانی بگات بە خوای پەروەردگار و لە ڕێگای

پرسیار کردن و وەڵامدانەوەی ئەقڵانی خوای گەورە ئەو دیمەنەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿۞وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ۝٧٤ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ۝٧٥ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأٓفِلِينَ ۝٧٦ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ۝٧٧ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ۝٧٨ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝٧٩﴾ الأنعام

واتە: کاتێ کە ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئایا بەڕاست، تۆ ئەم بتانە بەخوای خۆت دەزانی؟! بەڕاستی من دەبینم تۆش و قەومەکەشت لە گومڕایی یەکی ئاشکرادا، گیرتان خواردوە۝٧٤ بەو شێوەیەی (کە ئیماندار باوەڕی دامەزراوتر دەبێت) ئەستێرەو هەسارەو (نهێنییەکانی) ئاسمانەکان و زەویمان نیشانی ئیبراهیم دا تا بەتەواوی بچێتە ڕیزی دڵنیاکانەوە۝٧٥ کاتێ کە شەو باڵی کێشا بەسەریا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی دی) وتی: ئەمە پەروەردگارمە، کاتێ کە ئەستێرەکەی لێ ئاوابوو وتی: من شتی لەبەرچاو ون بووم خۆش ناوێت و حەزی لێ ناکەم۝٧٦ کاتێ کە مانگی بینی هەڵهات، وتی: (ڕەنگە) ئەمە پەروەردگارم بێت کاتی کە ئەویش ئاوابوو (لەبەرخۆیەوە) وتی: بەخوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتم نەدات دەچمە ڕیزی دەستەی گومڕاکانەوە۝٧٧ خۆر هەڵهات، وتی: ئەمەیان پەروەردگارمە ئەمە گەورەتریشە کاتێ کە ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، ئیترمن بەریم لەو شتانەی کە ئێوە کردوتانە بە هاوەڵ و شەریك (بۆ پەروەردگار)۝٧٨ من ڕووی خۆمم کردۆتە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، بەدڵئارامی تەواوەوە (دەڵێم کە): هەرگیز من لە ڕیزی موشریك و هاوەڵپەرستان دا نیم۝٧٩

حەزرەتی ئیبراهیم ڕچەتە شکێن بوو لە پرسیار کردن و نەترسان لە پرسیار و دروستبوونی گومان لە چۆنیەتی زیندووبوونەوە، ئەم ئازایەتی و جورئەتەی بوو کە وەڵامی بەرچاوی وەرگرت و توانی سەربکەوێت بەسەر گوماندا و یەقینی بۆ دروست بێت لە زانست و لە هەستەکاندا و ئەقڵ ئامرازی گرنگ بێت بۆ گەیشتن بە خوای پەروەردگار، دوور لە وەحی و یەکالاکەرەوەی هەموو پرسەکان دەبێت و پرسیاری وجوودی وەڵام ئەداتەوە، هەموو پرسەکانی قیامەت و پەنهانی وەکو زانستی پوخت دەخاتە بەردەست و ئیمان دروست دەکات.

## ئامانج لە گێڕانەوە و باسی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ

ڕووداوی ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم گونجاوە لەگەڵ قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ دا، قورئانی پیرۆز ژیانی ئیبراهیم لەهەموو قۆناغەکانی تەمەنی دا دیاری کردووە، گەنجێتی دیاری کردووە کە گرنگی دانی ژیانی بەچی بووە، هاوسەرگیری و بانگەواز و پیریەتی هەموو دیاری کراوە، مامەڵەی لە پیرو کۆتایی تەمەنیدا بوو.

ئەگەر پێش ژیانی هوود و صالح-مان باس کردبێت لە سوود و وانەکان تێیدا چی بووە، بەڵام ژیانی ئیبراهیم لەگەڵماندا دەژی و دەبێت شوێنی بکەویت، ئەگەر لێرەدا تەماشای ئایینەکە بکەیت و لاسایی بکەیتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ۝٦٨﴾ آل عمران

واتە: نزیکان و شوێنکەوتوان و یاوەرانی ئیبراهیم لە خەڵکی، ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش علیه صلاة وسلام و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە (بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و مووسا و عیساو محەمەد و هەموو پێغەمبەران بەگشتی علیهم السلام)، بێگومان خوا یارو یاوەری ئیماندارانە.

ئەگەر لێرەدا تەماشای ئایینەکە بکەین پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئیمانداران لەناو ئایەتەکەدا ناویان هاتووە بۆ شوێن کەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ.

## واتای پلەی خەلیل-ی خوا (خلیل الرحمن) چییە؟

پلەی خەلیلی تەنها دوو پێغەمبەر هەیانە، ئەویش حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، ئەم پلەیە کۆتا پلەی گەیشتنە بە خۆشەویستی خوا، هیچ مرۆڤێکی تر بێجگە ئەو دوو کەسایەتییە نەگەیشتونەتە ئەم ئاستە، هەندێک ئەم وشەیە (بە هاوەڵ بوون، یان هاوڕێ بوون) لە قەڵەم ئەدات، بەڵام پلەی خەلیلی واتا تێکەڵ بوون و خۆشەویستی بەهەموو لاشەو ڕۆح و ئەقڵ و مێشک و نەفس و ئارەزووەکان، کە ناتوانێت لەم خۆشەویستییە جیاببێتەوە.

ئەم پلەی خۆشەویستییە هیچ کەس بەدەستی نەهێناوە بێجگە ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێز و ئازیزەمان کە گەورەی مرۆڤایەتین، بۆیە باسکردن و شیکاری لەسەری تەنها بۆ تێگەیشتنێکە لەو پایە و ئاستە خۆشەویستییە تێبگەین، چونکە کەس پێی نەگەیشتووە تا وەسفی بکات.

خۆشەویستی قۆناغ و پلەبەندییە، هەموو مرۆڤەکان بێجگە حەزرەتی (محەمەد مصطفی و ئیبراهیم) علیهم السلام وەکو یەکن، خەڵکەکانی تر تێیدا جیاوازن، ئەم خۆشەویستییە و یاخود خۆشەویستی بە وەرزش کردن مرۆڤ دەتوانێت زیادی بکات، زۆرجار مرۆڤ کەسێکی خۆش دەوێت، بەڵام لەپڕ بەهۆکاری ڕووداوێک لە ژیان دەبێتە دوژمنی، بەڵام خۆشەوسیتی خوا بەزانست و دڵنیابوون و ئیمان پێوەرەکانی بەرز دەبێتەوە، لێرەدا پێوەری خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بەچەند قۆناغ و پێوەرێکە، جا مرۆڤ دەتوانێت هەر بەم قۆناغانە پلەی خۆشەویستی بۆ خوای پەروەردگار بەرز بکاتەوە.

قۆناغی یەکەم: مرۆڤ کە خۆشەویستی بۆ دروست دەبێت سەرەتا لە چاوەوە دەست پێدەکات، چاو کە تێربوو ئەوا قۆناغی دوای ئەو دەست پێ دەکات و دڵ ڕووی تێدەکات.

قۆناغی دووەم: ڕووگەی دڵ لە ئەوەوە دەست پێدەکات، بۆ نموونە مرۆڤی نێر کە حەز لە مرۆڤی ڕەگەزی مێ دەکات و پەسەندی دەکات، پاشان ڕووگەی دڵی دەکاتە ئەو کەسە، لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت مەیلی دڵ، کەواتە کە چاو پەسەندی کرد و دڵ ڕووی کردە خۆشەویست و ئینجا وابەستە بوونی دڵ ڕووئەدات، جا بە پێچەوانەوە بۆ هەردوو ڕەگەزەکەیە.

قۆناغی سێیەم: وابەستەبوونی دڵ واتا دڵ ئیتر ئاراستەی مێشک و بیرکردنەوە دەکات کە هەمیشە وابەستە دەبێت پێوەی لە خەیاڵ و خەون و بیرکردنەوە تە نانەت جاری وا هەیە دێتە بەرچاوی خۆشەویستەکەی.

قۆناغی چوارەم: لەم حاڵەتەدا مرۆڤ دەچێتە قۆناغێکی خۆشەویستی بەو واتایەی کە خواردن و خەوی لێ حەرام دەبێت و شەو و ڕۆژی لێ هەراسان دەبێت و ناتوانێت بیر لە خۆشەویستەکەی نەکاتەوە و شیعر و وێنای دەکێشێت، جا ئەگەر خۆشی نەتوانێت بە وێنا و شیعری تر بۆ خۆی دۆش داما و و شانۆی ژیانی خۆی و خۆشەویستەکەی نمایش دەکات، توانا و هێزی وازهێنانی نامێنێت و بەرەو بەدەست هێنانی تەواوەتی دەڕوات.

قۆناغی پێنجەم: دەچێتە قۆناغی دڵدار، چاو و دڵ و مێشک و بیرکردنەوە هیچ نابینێت و ناتوانێت لێی جیابێتەوە، لەسەر ڕێگاو جێگاکاندا چاوەڕوانی دەکات و بۆ بینینی حەز ناکات بە چرکە لێی دوور بکەوێتەوە.

قۆناغی کۆتایی: پێی دەوترێت مەدهۆشی لە عەرەبیدا پێی دەوترێت (الشغف) ئەم قۆناغە زۆر ترسناکە بۆ بەدەسهێنانی خۆشەویستەکەی ئامادەیە هەموو کارێک ئەنجام بدات، جا بە ڕێگای چاکە بێت یان خراپە، زۆرجار ئەوەندە بە خۆشەویستییەکە مەدهۆش دەبێت و دەچێتە

حاڵەتی کوشتن و زیندانی کردن، وەکو چۆن خێزانی عەزیز بۆ یوسف تووشی ئەم حاڵەتە بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ یوسف

واتە: وتیان: (سەیرە) ژنەکەی پاشا لاوەکەی خۆی بەگیر هێناوەو خۆشەویستی هەموو دڵ و دەروونی داگیرکردووە، بەڕاستی ئێمە بە ئافرەتێکی سەرلێشێواوی ئاشکرای دەبینین.

(ولله المثل الأعلى) مرۆڤ دەتوانێت هەر ئەم خۆشەویستییە بگوازێتەوە بۆ خوای پەروەردگار، لەچاو دروستکراوەکانی و پاشان وابەستە بوون بە خوێندنەوەی قورئان، خۆفێرکردن لە زانستی تەوحید تا دەگاتە ئاست و پلەی خۆشەویستی مەدهۆشانە بۆ خوای پەروەردگار کە خۆی لە ئاگر و ئاسن ناپارێزێت لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار ئەم ڕازی بوونەش بە خۆشەویستی دەبێت.

حەزرەتی ئیبراهیم کە گەیشتۆتە ئەم قۆناغە بیرو هۆش و دڵی تەنانەت چاوی لە مەخلوقی خوای گەورە بووە، هەمیشە لە مەلەکوتی خوای گەورەی ڕوانیووە، بۆیە گەیشتۆتە ئاستی خۆشەویستییەک کە ناوی (خلیل)ە.

هۆکارەکانی خۆشویستنی خوای گەورە چەند هۆکارێکن:

هۆکاری یەکەم: نوێژکردن مرۆڤ بە تێگەیشتن لە نوێژ و پاشان کردنی سوننەتەکان، خۆشەویستی بۆ خوای گەورە دروست دەبێت.

هۆکاری دووەم: زۆر خوێندنی قورئانی پیرۆز و خۆشارەزا کردن لە زمانی عەرەبی و خوێندنەوەی تەفسیرەکان و لەگەڵیشیدا خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ.

هۆکاری سێیەم: مرۆڤ بەردەوام بێت لە خوێندنی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران و...هتد.

هۆکاری چوارەم: خۆ ڕاهێنان لەسەر ئیخلاص و کارکردن لە پێناوی خوادا، واتا خۆ ساغ کردنەوە و دڵسۆزی بۆ پەروەردگار.

هۆکاری کۆتایی: لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی زۆر لەسەر دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار لە گەردوون و مرۆڤ، یاخود هەموو گیانداران و جیۆلۆجی و...هتد.

ئەم هۆکارانە و بە دڵنیاییەوە هۆکاری تریش زۆرە، بەڵام وەکو سەرەتایەک بۆ دروستبوونی خۆشەویستی خوا ئەم هۆکارانە سەرەکی ترن، مرۆڤ دەتوانێت دوای ئەو هۆکارانە هۆکاری تر بۆ خوشەویستی خوا بگرێتە بەر لەوانە (لێکۆڵینەوە لە ناوە پیرۆزەکانی خوا، خوێندنەوەی ژیانی پیاوچاکان و هاوەڵان و پێغەمبەران، وازهێنان لە حەرام و بەجێهێنانی سوننەتەکان...هتد).

مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی خوای پەروەردگار بێجگە دروشمە بەندایەتییەکان دەتوانێت بە (نیەت)ی خۆشەویستی خوای گەورە بەدەست بهێنێت، هەرگیز نەڵێت مرۆڤ ئەو کارە کەمە، زۆر کاری چاکەی کەم لای خوای گەورە بە گەورەیی تۆمار دەکرێت، ئەگەر ئاوات خواستنێکیش بووە، مرۆڤ دەتوانێت بە نیەتی خۆشەویستی خوا پاداشتی زۆر گەورە بەدەست بهێنێت، وەکو شەهیدی و هاوکاری فەقیر و هەژار و بێ دەرەتانەکان. قۆناغێکی تر کە مرۆڤەکان دەگەیەنێتە بەرزترین پلەی خۆشەویستی خوای گەورە عبودیەتە، خۆت بە بەندەی خوا بزانیت بە ڕاستگۆیی، بەندە بوونیش واتای: گوێڕایەڵی و بەردەوامی وسەرپێچی نەکردن و گەردن کەچی و زەلیلی نواندن بۆ خوای پەروەردگار، خوای گەورە بۆ هەموو پێغەمبەران وشەی (عەبد)ی بەکار هێناوە، بەڵام لەم پلەیە بەرزتر بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ وشەی (خلیل)ی بەکارهێناوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾ النساء

واتە: کێ هەیە ئایینی چاکترو پەسەندتر بێت لەو کەسەی کە ڕووی کردۆتە خوا، خۆی تەسلیمی ئەو کردووەو هەتا بتوانێت لە چاکەو چاکەکاریش درێغی ناکات، شوێنی ئایینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت لە کاتێکدا کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویست و ڕێزداری خۆی.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: خوای گەورە بە خەلیل هەڵیبژاردووم وەکو ئیبراهیم، خۆ ئەگەر لە ئوممەتەکەتدا خەلیلێکم هەڵبژاردایە ئەوا ئەبوبەکر ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت بوو (لێرەدا ئەگەر تەماشا بکەین بەمانای هاوڕێیەتی نایەت، چونکە ئەبوبەکر هاوەڵی پێغەمبەرە، بەڵکو بەواتای خۆشەویستییە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەبوبەکری

صدیقی زۆر خۆش دەویست، بەڵام خۆشەویستی خوای گەورە لەسەروو هەموو خۆشەویستییەکەوەیە).[٩٤]

کەواتە پلەی خەلیلی پلەیەکی زۆر بەرزە، کە تەنها ئیبراهیم و محەمەد بەو ئاست و پلەیە گەیشتوون، هەرچەندە پلە و ئاستەکان جیاوازە لەنێوان پێغەمبەراندا و لە هەندێکیشیاندا هاوبەش، ئیبراهیم خاوەنی خەسڵەتی باوکی پێغەمبەرانە کە لە هیچ پێغەمبەرێکدا نییە، پاشان خەلیلی خوایە و یەکێکە لە ئولولعەزم.

## تایبەتمەندییەکانی بە ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ

ئیبراهیم خاوەنی کۆمەڵێک خەسڵەت بووە کە تایبەت بووە بە خۆی، یاخود پێغەمبەرانی تریش هاوبەش بوون، لەو خەسڵەتانەدا یاخود خاسییتانەدا، ئاماژەمان پێکرد کە باوکی پێغەمبەرانە، خۆی تەنها لەم پلەیەدا بەشدارە پاشان خەلیلی ڕەحمانە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەشدارە لەم خاسییتەدا، هەروەها ئولولعەزمە کە پێنج پێغەمبەری تر لەگەڵیدا هاوبەشە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ۝٧﴾ الأحزاب

واتە: پەیمانمان لەپێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکتاپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بەتایبەت تۆ ئەی محەمەد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و لەنووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسای کوڕی مەریەم، بێگومان پەیمانێکی بەهێز و بتەومان لێ وەرگرتن.

واتای ئولولعەزم چییە؟: ئەو پێنج پێغەمبەرە کە دەوترێت تووشی زۆرترین ئازار و چەرمەسەری و ناڕەحەتی بوونەتەوە، تووشی زۆرێک لە وێستگە قورسەکان بوون، جیهادی ئەم پێنج پێغەمبەرە گەورەترین جیهاد بووە، بۆیە ناویان بە ئولولعەزم دەرکردووە، ئەمەش پلەو پایەیەکی یەکجار گەورەیە لای خوای پەروەردگار.

پلەو پایەی ئوممەت بوون واتای چییە؟: خوای گەورە لە وەسف و پێناسەی ئیبراهیم خەلیل دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝١٢٠﴾ النحل

---

[٩٤] جندب بن عبدالله سَمِعْتُ النبيّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أنْ يَمُوتَ بخَمْسٍ، وهو يقولُ: إنِّي أبْرَأُ إلى الله أنْ يَكونَ لي منكُم خَليلٌ، فإنَّ الله تَعَالَى قَد اتَّخَذَنِي خَليلًا، كما اتَّخَذَ إبْرَاهِيمَ خَليلًا، ولو كُنْتُ مُتَّخِذًا من أُمَّتي خَليلًا لَاتَّخَذْتُ أبَا بَكْرٍ خَليلًا، ألَا وإنَّ من كانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبورَ أنْبِيَائِهِمْ وصَالِحِيهِم مَساجِدَ، ألَا فلا تَتَّخِذُوا القُبورَ مَسَاجِدَ، إنِّي أنْهَاكُمْ عن ذلكَ/ صحيح مسلم، رقم ٥٣٢.

واتە: بەڕاستی ئیبراهیم هەر خۆی ئوممەتێك بوو، (هەر خۆی پێشەوایەك بوو) ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بوو، هەرگیز لە موشریك و هاوەڵپەرستان نەبوو.

(کان أمة) بەواتای گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار هێندەی ئوممەتێک بووە، هەرچەندە ئوممەت لە کوردیدا ئوممەت بە (گەل) مورادیف کراوە، بەڵام گەل بەواتا (الشعب)، لە زمانی کوردیدا ئوممەت بە ئوممەت دانراوەتەوە، دەتوانین بەم شێوەیە وێنای بکەین، بڵێین بەندایەتی و خواپەرستی هەروەکو ئوممەتی ئیسلام بووە کە لە مەغریبەوە تا ئەندەنوسیا، لە باکوور لە ئەلبانیاوە تا ناوەڕاستی ئەفەریقا، جا چەند ملیۆنە حەزرەتی ئیبراهیم هێندەی ئەو هەموو مرۆڤانە بەندایەتی و گوێڕایەڵی لای خوای گەورە بۆ نووسراوە هێندەی ئوممەتێک، بۆیە یەکێکی تر لە پێناسەکانی ئوممەتە.

ئەمەش مانای وانییە مرۆڤێکی تر خوای گەورە پاداشتی بۆ زیاد نەکات، بەڵکو ڕاستە بێجگە پێغەمبەری ئازیز ﷺ کەس ناگاتە ئاستی حەزرەتی ئیبراهیم، بەڵام مرۆڤ هەیە لە ئیسلامدا پلەوپایەی زۆری دراوەتێ لە پلەوپایایە هەزارەها کەسی تری بەدەست هێناوە بەتەنها خۆی، ئەبوبەکر و عومەر ئیمانیان ئیمانی ئوممەتێک بووە، خالیدی کوڕی وەلید، بەیەک ملیۆن مرۆڤ هەژمار کراوە لە ئیسلامدا، قەعقاع بە ١٠٠ موجاهید هەژمار کراوە، کەواتە من و تۆش دەتوانین ئاستی خۆمان بەرزبکەینەوە، چونکە حەزرەتی ئیبراهیم دەبێت لاسایی بکرێتەوە وەکو حەزرەتی محەمەد ﷺ، کەواتە هەوڵبدە پلەو ئاستی خۆت بەرز بکەرەوە لای خوای پەروەردگار.

پاشان سیفەتی گەردنکەچی و حەنیفی (قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا)، هەموو ناووناوبانگی ئایینی حەنیف، یاخود ئیبراهیم کە حەنیفی بوو واتاکەشی ئەوەیە لە ڕووی زمانەوانییەوە کە زۆر زۆر دوور بووە لە شرک و هاوبەش دانانەوە، هەرچی گومانی شرک و هاوبەشی لێبکرێت ئەو لێی دوور بووە، تەنانەت گومانیش!

هەردوو وشەکە بە واتایەکی تریش ئەوەیە کە بەتەواوەتی شکاوەتەوە بەلای خوای پەروەردگاردا و گەردنکەچ و گوێڕایەڵ و ڕەهایە بۆ خوای موتەعال.

سیفەتی شوکرانە بژێری خوای گەورە لە وەسفیدا، ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾﴾ النحل

واتە: (ئیبراهیم) زۆر سوپاسگوزاری خوا بوو لە بەرانبەر نازو نیعمەتی بێشوماری پەروەردگارییەوە، ئەویش هەڵیبژاردو ڕێنموویی کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست.

هەمیشە سوپاسگوزاری خوای پەروەردگار بووە (شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ) ئەویش بەهەدەر نەبووە، بەهەمان شێوە وەکو کورد دەڵێت: دەست نوقاو نەبووە کەسێکی دەستودڵ باش بووە، بەهەمان شێوەی لەسەر هەموو نیعمەتەکان کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە جەنابی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ سوپاسگوزار بووە.

سیفەتی وەفای هەبووە، خوای گەورە باسی ئەو سیفەتەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾﴾ النجم

واتە: یا لە بەرنامەی ئیبراهیمی بەوەفا (ئاگادارن؟!)

(وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى) ئەمەش مانای بەوەفا بوو، بۆ هەموو فەرمانێکی خوای پەروەردگار.

هەر ئەرکێک بەسەریدا بدرایە خێرا جێبەجێی دەکرد و بەوەفا بوو بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی کە پێی سپێردراوە لەلایەن خوای موتەعال، بەوەفا بوون لە بەرانبەر خوای گەورەدا، واتا جێبەجێ کردنی فەرمان و بەندایەتی و دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری و حەرام خواردن و ئەنجام دانی.

سیفەتی لەسەرخۆیی و لەخواترسی و ویقار و خۆش مەشرەب وەکو کورد دەڵێت، ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾﴾ هود

واتە: بەڕاستیی ئیبراهیم زۆر لەسەرخۆو غەمخوارو گەڕاوەیە بۆلای خوا.

هەرسێ وشەکە مانای تایبەتی خۆی هەیە (حَلِيمٌ) بەواتای هێمنی و لەسەرخۆیی و خۆش مەشرەب و شیرین زمان، (أَوَّاهٌ) بەواتای ترسانی زۆر لە خوای پەروەردگار، (مُنِيبٌ) بەواتای گەڕانەوە بۆ لای خواو تۆبەکار.

ئەم سیفەتانە کە کۆبۆتەوە لە جەنابی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ دا ئاماژەیە بۆ ئێمە داخۆ دەبێت ئێمە و مانان خاوەنی کام سیفات بین، خوای گەورە لە قیامەت حەزرەتی ئیبراهیم بە وەفا بانگ دەکات، دەبێت تۆ و من خۆمان ئامادە بکەین بە چ ناوێک بانگمان بکەن؟

بە فەرمووەدەی خوای موتەعال زۆر دڵ هەیە بەرد لێی باشترە، ئەوەندە ڕەقە هەرگیز لە ترسی خوا داناخورپێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾﴾ البقرة

واتە: کەچی لەوەو دوا دڵەکانتان ڕەق بوو (ئەی جوولەکەکان) هەروەك بەرد، بەڵکو ڕەقتریش (چوونکە) بەڕاستی بەرد هەیە کە ڕووباری لێ هەڵدەقوڵێ، هەشیانە لەت لەت دەبێ و ئاوی لێ دێتە دەرەوە، هەشیانە لە ترسی خوا لە لوتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە، خوایش بێ ئاگا نییە لەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

هەروەها سیفەتی میللەت بوونی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بۆ هەمووانە، هەرکەسێ خۆی بە شوێنکەوتووی حەزرەتی ئیبراهیم نەزانی لە ئایینی یەکتاپەرستی دا، ئەوا کەسێکی (سووک و ڕسوا و خوێڕیی)ە، ئەم سێ وشەیە لە قورئاندا بەواتای (السفاهة) هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾﴾ البقرة

واتە: کێ لە ئایینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، مەگەر ئەو کەسەی کە گێل و نادان و وێڵ بێت، بەڕاستی ئێمە ئەومان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە و (کردوومانە بە پێشەوا) و لەو دنیاشدا لە ڕیزی پیاوچاکاندایە.

سووک بەواتای ئەوەی قورسایی چاکەی نییە لە قیامەت، سووکە و هیچ نرخی نییە، ڕسوایە هەرکەس خاوەنی تەوحید و یەکتاپەرستی نەبوو سەرگەردان و ڕسوای دنیاو قیامەتە، خوێڕیەتیش بەواتای بێکەڵکی هیچ سوودێکت نابێت بۆ خۆت و دەورووبەر، ئەوەش مانای خویرێتییە.

سیفەتی نزیک بوونی لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەویش لەکاتی نوێژ و کاتی تریشدا ناسراوە، بەسەڵەواتی ئیبراهیمی کە (صلوات) لە پێغەمبەر محەمەد و ئیبراهیم دەدەین، کە فەرمانمان پێ نەکراوە بۆ هیچ کام لە پێغەمبەرانی تر (صلوات) بدەین، بێجگە حەزرەتی محەمەد و حەزرەتی ئیبراهیم -علیهم افضل الصلاة والسلام-.

ئەمانە بەشێکی گرنگ بوون لە ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ ، لەهەمووی گرنگتر لەکاتی دروستکردنی کەعبەدا دوعای کرد و فەرمووی: ﴿رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴿١٢٩﴾﴾ البقرة

واتە: پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی (کە لە ئایندەدا دێن) پێغەمبەرێك لەخۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە و فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتا قورئان) و دانایی یان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاك بکاتەوە، بێگومان تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت.

ئەم گیرا بوونی دوعایە هەزاران ساڵی خایاند، بەڵام دوعاکەی گیرا بوو خوای گەورە پێغەمبەری نازداری نارد لەناو قوڕەیشەوە.

دوعای دووەمی حەرام کردنی هەموو کارێکە لە مەککەدا، مەگەر ئەوەی خوای گەورە ڕێگای پێداوە لە بەندایەتی کردن، ئەمەش هەر دوعای حەزرەتی ئیبراهیم بوو کە فەرمووی: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ﴿٣٥﴾﴾ إبراهيم

واتە: کاتێك ئیبراهیم نزای کرد و وتی: پەروەردگارا، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شار و وڵاتەداو خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.

هەربۆیە پێغەمبەری نازدار فەرمووی: خوایە باوکم ئیبراهیم دوعای کرد کە شاری مەککە لە حەرام کراوەکان بێت، واتا (بيت الله الحرام)، منیش داوات لێدەکەم کە شاری مەئایینە بەهەمانشێوەی مەککە حەرام کراو بێت.[٩٥] کە مرۆڤ ڕاستگۆ بێت و دڵسۆزبێت لە دوعا کردن خوای گەورە گیرای دەکات، بەو شێوەیەی کە مرۆڤایەتی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەمەش مانای قەزا و قەدەری خوای گەورەمان نیشان ئەدات.

## پەیوەندی نێوان پێغەمبەر ئیبراهیم و محەمەد (عليهم السلام)

بەردەوام لە فەزڵ و پلەو پایەی گەورەیی حەزرەتی ئیبراهیم داین، خاڵێکی جەوهەری تر ئەوەیە کە لەنێوان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ دا پەیوەندیەکی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

(٩٥) أخرج أحمد ومسلم والنسائي وابن جرير عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إن إبراهيم حرم مكة وإني حرمت المدينة ما بين لابتيها، فلا يصاد صيدها ولا يقطع شجرها.

زۆر توندوتۆڵ هەیە، ئەگەرچی هەزارەها ساڵیان نێوانە، ئەم پەیوەندییە تایبەتەی نێوانیان بە پرسیارێکی هاوەڵان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانمان دەدات کە پرسیان چۆن دەعوە و بانگەوازەکەت دەستی پێکرد؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم بانگەواز و دەعوەیە لە باوکمەوە ئیبراهیم بۆم ماوەتەوە.[٩٦]

ئەوەش ئەو تایبەتمەندییەیە کە لەنێوانیاندا دەست پێ دەکات، هەر بەم هۆکارەش بوو کە لە خۆشەویستی باوکی، کوڕەکەی ناو ناوە ئیبراهیم، هەڵبژاردەی ناوی کوڕی حەزرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لەبەر خۆشەویستی حەزرەتی ئیبراهیم و ئەو پەیوەندییە تایبەتەیە کە لە نێوانیاندا هەیە، پەیوەندی زۆر بەهێزتریش هەیە کە بۆتە سوننەتی ئیبراهیم، نموونەی خەتەنە کردن، پاشان کورتکردنەوەی بەر سمێڵ کە نەیەتە سەرلێو، کاتێک پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دا و فەرمووی: ئێمەش بیکەین، فەرموویان: بەڵێ، چونکە سوننەتی ئیبراهیم بەو شێوەیە ئەنجامی داوە (هكذا فعل ابراهيم)، واتا شێوە و شکڵی دەرەوەمان لاسایکردنەوەی ئیبراهیم، بگرە لەوەش زیاتر لەکاتی سەربڕینی قوربانیدا وتیان بە پێغەمبەر ئەم قوربانییە چییە؟

مەبەستیان ئەوەبوو بۆ لە جەژن دا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوننەتی پێغەمبەرەکەتان ئیبراهیم-ە (سنة نبيكم إبراهيم)، هەڵبەت پرسیارەکە هاوەڵانیش دەگرێتەوە بۆ پاداشتەکەی نەک بۆچی ئەم کارە بکەن، بەڵکو ئەگەر کرا پاداشتەکەی چی دەبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هێندەی خوری و مووەکانی چاکە و حەسەنات دەست دەکەوێت (بكل شعرة حسنة) هەروەها هاوەڵان جەختیان لەسەر پاداشت دەکردەوە خوری تاڵەکانی زۆر وردە، پرسیاریان هێندەی مووی خورییەکەشی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هێندەی مووی خورییەکەشی (بكل شعرة من الصوف حسنة).[٩٧]

لەوانەیە کەسێک بڵێت من پارەم نییە لەکوێ ئەو هەموو چاکەیەم دەست بکەوێت، لەوەڵامدا دەڵێین: بە خوێندنی قورئان و فێرکردنی خەڵکی لە خوێندنەوەی قورئان و تەجویدی هەر پیتێک ١٠ چاکە و حەسەنەت بۆ دەنووسرێت. زۆر کاری خێرو چاکەی تر هەیە کە مرۆڤ

---

[٩٦] روى أحمد والطبراني وابن حبان والحاكم، والبغوي في شرح السنة، وابن هشام في السيرة النبوية: أن نفراً من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم قالوا له: يا رسول الله، أخبرنا عن نفسك؟، قال: نعم، أنا دعوة أبي إبراهيم، وبشرى عيسى.

[٩٧] قالوا : يا رسول الله، ما هذه الأضاحي؟ قال: سُنة أبيكم إبراهيم. قالوا: فما لنا فيها يا رسول الله؟ قال: بكل شعرة حسنة. قالوا: فالصوف؟ قال: بكل شعرة من الصوف حسنة/ابن ماجه و احمد.

پاداشتی زۆری لەسەر وەردەگرێت، هەر لە ڕۆشتن بۆ نوێژ و واتا بۆ مزگەوت و جیهاد و بانگەواز...هتد.

هەروەها پەیوەندییەکی گرنگی تری نێوان حەزرەتی ئیبراهیم و پێغەمبەری خوا محەمەد ﷺ فەرمووی: ئیبراهیم خەیرول بەرییە (خير البرية) کەسێک بانگی پێغەمبەری کرد ئەی (خير البرية) پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستەخۆ فەرمووی، بەڵکو خير البرية ئیبراهیمی باوکمە (خير البرية ذلك إبراهيم أبي)، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە کە باسی ئیبراهیمی کردووە فەرموویەتی باوکم ئیبراهیم.

لەو پەیوەندییە گرنگتر لە ئیسرا و میعراج دا کە بە خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام گەیشت لە ئاسمانی حەوتەم دا بینی کە جێگای ماڵی ئاوەدانییە واتا قیبلەی فریشتەکان کە ناسراوە بە (بيت المعمور) ڕۆژانە ٧٠ هەزار فریشتە دەچنە ئەو ماڵەوە تا ڕۆژی قیامەت نایەنە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاسمان هەڵیناگرێت لەبەر زۆری فریشتە، هەر نێوانی سێ پەنجە فریشتەیەکیان لە ڕکوعدایە یاخود سوجدە دەبات یان وەستاون بۆ بەندایەتی تا ڕۆژی قیامەت لەدوای تەواو بوونی بەندایەتیەکەیان دەپاڕێنەوە و دەڵێن: خوای پاکوبێگەرد بەڕاستی بەحەقی بەندایەتی بۆ زاتی بەرزت بەندایەتیمان نە کردووە، (سبحانك ما عبدناك حق عبادتك).

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە میعراج دا بینی کە فریشتەکان تەواف دەکەن، پاشان کە تەماشای ماڵی ئاوەدانی کرد و بینی کەسێک ماندووە و پشتی داوەتە بەماڵی ئاوەدانی، پێغەمبەر ﷺ بە حەزرەتی جوبریلی فەرموو: ئەو کەسە کێیە؟

جوبریل فەرمووی: ئەوە باوکتە ئیبراهیم![٩٨]

بە هێزترین پەیوەندییە لەنێوان هەردوو پێغەمبەرەکەدا سەلامی خوا لە هەردووکیان بێت.

ئەو پەیوەندییە تەنها پەیوەست نییە بە خودی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو پەیوەندی بە ئوممەتی پێغەمبەریشەوە هەیە، چۆنە ئەو پەیوەندییە؟ خودی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان ڕووندەکاتەوە و دەفەرموێت: کاتێک گەیشتم بە ئیبراهیم فەرمووی: بەخێر بێیت پێغەمبەری چاکەخواز و کوڕی چاکەخواز، (مرحبا بالنبي الصالح والإبن الصالح).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٩٨] ثم نظرت فإذا رجل اسند ظهره الى البيت المعمور، فقلت: من هذا يا جبريل؟ فقال جبريل: هذا أبوك إبراهيم/مسلم.

لەدوای جێگیر بوونی پەیوەندی کوڕو باوکایەتی نێوان حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: (ئەی محەمەد سڵاوی من بگەیەنە بە ئوممەتەکەت)، پێغەمبەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ سڵاوی ناردووە بۆمان، بەڵام لەگەڵ سڵاوەکەدا وەسیەتنامەیەکی بۆ ناردووین، داخۆ دەبێت ئەو وەسێتننامەیە چی بێت؟

(لَقيتُ إبراهيمَ ليلةَ أُسْرِيَ بِي فقالَ : يا محمَّدُ، أقرِئْ أُمَّتَكَ منِّي السَّلامَ وأخبِرْهُم).

وەسیەتنامەکە پێمان دەڵێ: خاکی بەهەشت لەبارە بۆ چاندن و ئاوی سازگاری تێدایە، جا بە بەندایەتی و خواناسییتان هەوڵبدەن ڕواندن و ئاوەدانی بکەنەوە.

(أنَّ الجنَّةَ طيِّبةُ التُّربةِ عذبةُ الماءِ، وأنَّها قيعانٌ، وأنَّ غِراسَها)

لەو بەندایەتی و یادو زیکر و فیکری پەروەردگارا نموونەی (سُبحانَ اللَّهِ والحمدُ للَّهِ ولا إلَهَ إلَّا اللَّهُ واللَّهُ أكْبرُ).

تەنها پێغەمبەران خەمباری ئەوەن کە خۆمان سەرقاڵ نەکەین بە شتی لاوەکییەوە و بنەڕەتی کارمان ئەوەیە کە بۆ بەهەشت دروست کراوین، بڕۆینە ئەو جێگایە و خۆمان سەرقاڵ بکەین بەو جێگایەوە، حەزرەتی ئیبراهیم لە ئاسمانی حەوتەمەوە غەمی ئوممەتی پێغەمبەرێتی، لەبەر ئەوەی تاکە ئوممەتە لەسەر حەق و ڕاستی بێت.

بەهەشتیش واتا خۆشبەختی هەتاهەتایی، سەیرە خەڵکی خۆشی نەبڕاوە لەبیربکات بۆ ژیانێکی خۆشی زۆر کورت!

لە گێڕانەوەی ئەم باسەدا واتا گەڕانەوەی لە ئیسرا و میعراج دا باسی جۆرێک لە شێوە و ڕووخساری پێغەمبەرایەتی کرد، پاشان لەباسی حەزرەتی ئیبراهیم دا فەرمووی: شێوە و ڕووخساری لە شێوە و ڕووخساری هاوڕێکەتان دەچوو، مەبەست خودی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، واتا ئیبراهیم و محەمەد ڕووخساریان یەک شێوە بووە، زۆر لەیەکەوە نزیک بوون، ئەمەش پەیوەندی نێوانیان زیاتر و زیاتر کردووە (إبراهيم فإذا أقرب اليه شبها صاحبكم).

## فەزڵی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە قیامەت دا

یەکێک لە گەورەیی و فەزڵی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە ڕۆژی قیامەت دا ئەوەیە کە یەکەم کەس جلوبەرگی دەکرێتە بەر، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: یەکەم کەس لە

دروستکراوەکانی خوای گەورە کە بەرگ دەپۆشێ لە قیامەت دا ئیبراهیم-ە، (إن اول الخلائق يكسى يوم القيامة إبراهيم)/مسلم.

ڕۆژی قیامەت هەموو ڕوت و قووتین هەروەکو چۆن لەدایک بووین، عائیشە ڕەزامەندی خوای لێ بێت پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا خەڵکی تەماشای یەکتری دەکەن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عائیشە ئەو ڕۆژە زۆر لەوە قورستر و نارەحەت ترە، خەڵکی بیانپەرژێتە سەر ئەوەی تەماشای یەکتری بکەن. (يا عائشة الأمر أشد من أن ينظر بعضهم الى بعض)البخاري.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: خوای گەورە دەفەرموێت بە فریشتەکان ئیبراهیم داپۆشن، ئیبراهیم داپۆشن (أكسي يا ملائكتي خليلي، أكسي يا ملائكتي خليلي).

ئەو ڕۆژە زۆر سەختە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ئەو ڕۆژەیان نیشان دام، خەڵکی جلوبەرگ و پۆشاک دەپۆشن بە گوێرەی ئایینەکەیان، هەیە ئایینی بە بەهێزی نەگرتووە، بەرگەکەی تا سەر سنگی دێت و مەمکی دادەپۆشێت، واتا دەشێت داپۆشرێیت بەڵام بەگوێرەی پابەندیت بە ئایینەوە، هەیە تا سەر قوڕگی داپۆشراوە، ئینجا فەرمووی عومەرم بینی پۆشاک و جلوبەرگی لێ دەخشێت ئەوەندە درێژە.

(رأيتنى يوم القيامة يعرض عليه الناس و عليهم قمص فمنهم من يصل القميص إلى ثدييه، ومنهم من يصل القمص الى ترقوته، ورأيت عمر بن الخطاب يأتى يجر قميصه)

جا دەبێت من و تۆش هەوڵ بدەین بزانین پۆشاکی بەرمان کوێمان دادەپۆشێت و هەوڵی زیاتر بدەین و پابەند بین بە ئایینەکەمانەوە.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لای ڕاستی خوا من دەوەستم، خوای گەورە ئەو جێگایە دەکاتە ڕێز و مەقامێک بۆ من و لە یەکەم کەس تا کۆتا کەس خۆزگەی پێ دەخوازن و حەزیان دەکرد ئەو جێگایە بۆ ئەوان بێت، کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (غبطة).

(ثم أقوم عن يمين الرحمن وكلتا يدي الرحمن يمين مقاما يغبطنى عليه الأولون الآخرون) مسلم و احمد.

ئەم باسەشمان بۆیە کردەوە لەم بەشەدا چونکە فەرموودەکە پەیوەندی بە حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ -ەوە هەبوو.

# هەنجەت و بیانوو دۆزینەوە

لە نێوانی نووح و ئیبراهیم علیهم السلام پێدەچێت هەزاران ساڵی نێوان بێت، هەردووکیان لە یەک ناوچەدا ژیاون ئەویش وڵاتی ڕافیدەین یاخود میزۆپۆتامیا، لە شارێک ژیاوە ئیبراهیم گەورەترین شار بووە، سەرەتای یەکەم شارستانییەتی مرۆڤایەتی بووە، پادشای ئەو سەردەمە هەموو سەرزەوی حوکم کردووە و قەڵەم ڕەوی ئەو بوون.

سەرباری هەمووی لەو شارەدا و بەگشتی لە جیهاندا فرە خوایی باوبووە، لە شاری بابل دا چەندین خوا پەرستراوە، هەر خودی شارەکە ناسراو بووە بە داهێنانی خوا وەکو بت و فرۆشتویانە، باوکی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ کەسێکی بازرگان و ناسراوی ئەو وڵاتە بووە بۆ بت فرۆشتن و تاشینی.

لەناو ئەو ژینگەیەدا کە هەموو دژی بانگەوازی یەکتاپەرستی بوون، بەڵام ئیبراهیم بەردەوام بوو جارێک لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی ئەو وڵاتەدا، جارێک لەگەڵ کاهین و جێگای بتەکانیان لەسەر هەموویانەوە لەگەڵ باوکی هەمیشە لەبانگەوازدا بووە، لەوانە گەورەترە لەگەڵ سەرۆکی یەکەمی وڵات پادشا و دەسەڵاتدارانی ئەو ئیمپراتۆریەتە لە بانگەواز و دیبەیت و گفتوگۆدا بووە بۆ یەکتاپەرستی و خواناسی بەڕاستی و حەق.

تەمەنی لە ١٦ ساڵی دابووە خراوەتە ناو ئاگر و لە ٢٠ ساڵیدا هیجرەتی کردووە و بەردەوام بووە لە بانگەواز دا، ڕۆژێک لە ڕۆژان ماندوو نەبووە، هیچ بیانوو و هەنجەتی نەهێناوەتەوە.

لێرەدا من و تۆش هیچ بیانوویەکمان نییە، بۆ ئەوەی بڵێین ناتوانین بانگەواز بکەین، بە دڵنیاییەوە حاڵوگوزەرانی ئێمە زۆر باشترە لە ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم، ئەو خوایەی کە خاوەنی ئیبراهیم بووە، بە دڵنیاییەوە هەر ئەو خوایە پەروەردگارەشە خاوەنی ئێمە.

هەرگیز بیانو و هەنجەتی ئەوەمانە بڵێین خێزانەکەمان ڕێگامان پێنادات، یاخود لە دەزگای ئاسایش و داپڵۆسێنەری طاغوتەکان دەترسم، یاخود ئەوانەی وا پەی دەبەن لە خوای گەورە داوا دەکەن و خوای گەورە بە هانایانەوە ناچێت، ئەوانە بە دڵنیاییەوە لاوازی ئیمانن، چونکە مرۆڤ کە دڵنیا بوو لە خواکەی دەزانێت کە داوای لێ کرد هەرگیز لەبیری ناکات، بەڵام بەو مەرجەی تۆش خوای موتەعال لە بیر نەکەیت، خۆ حەزرەتی ئیبراهیم کە گەیشتە پلەی ڕوشد و پێی گەیشت تەمەنی لە لاویدا بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ۝٥١﴾ الأنبياء

واتە: ئێمە ژیریی و هۆشمەیندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاک ئەومان دەناسی.

هەندێک بەوە لێکی دەدەنەوە کە گوایە باڵغ بووە یان ئەقڵی بەوە شکاوە کە ئیتر بتوانێت ژن بهێنێت.

لەڕاستیدا ڕوشد مانای ئەوە نییە کە مرۆڤ دوای ئافرەت و یان شەهادە و کارو کەسابەت بکات یاخود ببێتە خاوەنی کۆمپانیا و پارە...هتد.

ڕوشد و تێگەیشتن: واتای ئەوەیە کە مرۆڤ هەست بکات خاوەنی ئەرکەو فەرمانی بەسەردا دراوە، دەبێت بزانێت بۆچی هاتووە بۆ ژیان، هەروا بۆ گاڵتەوگەپ و کاری دنیایی نەهاتووە، ئێمە بنەڕەتمان دەگەڕێتەوە بۆ بەهەشت بۆ ئەوێ دروستکراوین. ڕوشدو تێگەیشتوویی واتا بانگەواز کردن بۆ یەکتاپەرستی بانگەواز و بۆ سوننەتی خواناس، بونیادنانی کەسایەتی خۆت لەسەر بونیادی پێغەمبەران، ڕوشد واتا دوورکەوتنەوە لە تاوان و حەرام، واتا ڕێکخستنی کات و ژیان و کارو پیشەو بازرگانی و...هتد لەگەڵ ئایینی خوادا و پەیوەیست بوون بە نوێژ و قورئان و مزگەوت و وانە ئایینیەکان و هەوڵدان بۆ زانست.

## صوحوفی ئیبراهیم

خوای پەروەردگار لە چەند جێگایەکی قورئان دا ئاماژەی بۆ کتێبی حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ کردووە کە ناوی صوحوف بووە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا و لە کتێبە ئاسمانییەکاندا ئەوەی کە گرنگە بۆ خەڵکی ئاماژەی پێکردووە گێڕانەوەی مێژوو نییە، بەڵکو گێڕانەوەی ئەو کارەساتانەیە کە بەسەر گەلانی ڕابردووودا هاتووە، بەهۆکاری پەرستنی بت و وازهێنان لە یەکتاپەرستی و سەرپێچی و خراپەکاری لە هەموو جۆرەکانی.

خوای موتەعال نموونەی تەورات و ئینجیلی بۆ باس کردووین چی تێدا فەرمووە، ئەمەش بۆ ڕیزبەندی و ناساندنی پەرتوکەکانی زاتی بەرزی خواییە، هەروەها لە صوحوفی ئیبراهیم دا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: هەموو صوحوف نموونە و وانەبووە بۆ خەڵکی، هەروەها نموونەیەکی بۆ باس کردووین لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ۝٣٦ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ۝٣٧ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۝٣٨ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ۝٣٩ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ۝٤٠ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ۝٤١ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ۝٤٢ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ۝٤٣ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ۝٤٤ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ۝٤٥﴾ النجم

واتە: ئاخۆ ئەوانە هەواڵی کتێبەکەی مووسا (تەوراتیان) پێگەیشتبێت؟﴿٣٦﴾ یا لە بەرنامەی ئیبراهیمی بەوەفا (ئاگادارن؟!)﴿٣٧﴾ (کە لەو بەرنامە پیرۆزەدا هاتووە): هیچ کەس گوناهی هیچ کەس هەڵناگرێت﴿٣٨﴾ بەڕاستی ئادەمیزاد هەر ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە کە دەستپێشخەری دەکات﴿٣٩﴾ بەرهەمی هەوڵ و کۆششەکەشی دەبینرێتەوە (لە قیامەتدا)﴿٤٠﴾ لەوهوودوا (خوای بەخشندە) (بەگوێرەی ئیمان و باوەڕو کارو کردەوەی) پاداشتی لەبارو بەجێی دەداتەوە﴿٤١﴾ بەڕاستی و دڵناییەوە دەڵێین: (کە ئەم ڕێگوزەرە) سەرئەنجامەکەی لەلای پەروەردگارتەوە سەرهەڵدەدات﴿٤٢﴾ هەر ئەو زاتەش دیاردەی پێکەنین و گریانی لە ئادەمیزادا بەدیهێناوە﴿٤٣﴾ هەروەها هەر خۆی مرێنەرەو ژیانبەخشە (بە هەموو بەدیهێنراوەکان)﴿٤٤﴾ هەر ئەو دوانەیە کە جوت و دوانە، نێرو مێی بەدی هێناوە﴿٤٥﴾

ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین هەموو وانەیە و ئاگادارییە، بەڵام لەناوەخنەکەیدا چەندین باسی مێژووی ڕووداوی گەلانی تری تێدا باس کردووە، پاشان هەمووی پەیوەیست کردۆتەوە بە نیعمەتی یەکتاپەرستی.

## لە ئیبراهیمەوە بۆ خێزان چی فێر دەبین

ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ خێزان و چۆنیەتی بانگەواز کردنی دایک و باوک و هەروەها لە بەکارهێنانی ژیری و ئاقڵی لە کاتی گفتوگۆدا. یەکەم قۆناغی بانگەوازی ئیبراهیم لەگەڵ باوکیدا بوو، لەگەڵ باوکێک کە بەردەوامە لەسەر تاوان، بت تاشە، بتفرۆشە، لەگەڵ ئەوەشدا ئیبراهیم چەند بە ئەدەب و لووطف و خۆشەویستییەوە بانگی باوکی دەکات وشەی (یا أبت) بەکار هێناوە نەک (أبي)، چونکە وشەی یەکەم کە (ئەبەتی) بە واتایەکی خۆشەویستی و هەست کردن بە سۆزو هەستی کوڕ بۆ باوکی، بەواتای من کوڕتم هەموو خۆشییەکم بۆ تۆ دەوێت، بێجگە لە تۆش کەسووکارم نییە، بەواتای ئەوەی تۆ پشتوپەنای بۆ من، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو سۆزو میهرەبانییە بە ڕاشکاوانە لەگەڵت دەدوێم لەهەمان کاتدا بە ئەقڵ و لۆژیک لەگەڵت قسە دەکەم ئەی باوکی بەڕێزم، چونکە من زانستێکم پێیە لای تۆ نییە، ئەویش ئایینە.

هەرچەندە باوک خاوەنی ئەو زانیاری و زانستە بێت کەلای منداڵەکانیەتی بۆ گەیاندنی ئەو زانیارییە، پێویستە مرۆڤ بە گەورەتر لەخۆی بە ئەدەبەوە ڕاگەیەنێت و بڵێت ئەشێت زانست و زانیاری زۆر لای تۆ کۆبووبێتەوە، بەڵام من زانست و زانیارییەکی ترم لایە لەوانەیە تۆ پێت نەگەیشتبێت، جا ڕێگەم بدە بۆت باس بکەم یاخود بۆت شیبکەمەوە.

ئوسلوبی پێغەمبەر ئیبراهیم بەم شێوەیە بووە، بە لۆژیک بە باوکی دەڵێت ئەوەی تۆ دەیپەرستی نە ئەبیستێت نە دەبینێت، هیچ سوود و زیانێکی نییە، ئیبراهیم نەچووە ناو بواری دەمەدەمێ و شەڕ و ئاژاوەی ناو ماڵ، بەڵکو بە ئەقڵ ئاخاوتنی کرد.

نەچوو ڕاستەخۆ بەباوکی بڵێت باوکە تۆ کافر و گومڕایت، تۆ سەر لێ شێواو و جاهیل و نەزانی، بەڵکو بەوپەڕی سۆز و میهرەبانی وتی: باوکە زانستێکم بۆ هاتووە کە جەنابت نەتبیستووە ئەگەر شوێنی زانستەکە بکەویت ئەوا ڕێگایەکی ڕاست و دروست و پەسەندت وەرگرتووە.

بۆیە لێرەدا ئایەتەکان دووبارە ناکەینەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە، بەڵام جۆرێک لە ڕەوشتی زۆر بەرز و ئەدەبێکی زۆر نایاب تێیدا بەرجەستە بوون، لێرەدا بەواتای خۆبادان و خۆنیشاندان نایەت، بەڵکو بەواتای ئەوەی منیش هەروەکو تۆ بووم، بەڵام ئەو زانیاری و زانستەم وەرگرت و چوومە سەر ئەو ڕێگا ڕاست و دروستە.

ئیتر خۆ بادان نەبوو، بڵێ باوکە من دەزانم قورئان بخوێنم و تۆ نایزانی و من خوێنەوارم و تۆ نەخوێنەواری، ئەو جۆرە قسانە بۆ ئیمامە یان بانگخوازێکە لەگەڵ بێ دین و عەلمانییەکان ڕووبەڕوو بێتەوە.

بەڵام لەگەڵ خێزان و کەسووکاردا دەبێت مرۆڤ بڵێت: شتێک فێربووم وەرن با بۆ ئێوەشی باس بکەم تا هەموومان لەو خێرە بەهرەمەند بین و بڕۆینە سەر ڕێگای ڕاست و دروست.

بەتایبەت ئێستا دایک و باوکمان ئیماندار و موسڵمانن، بەڵام زانیارییان وەکو زانیاری ئێمە نییە، دەبێت زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆیی فێریان بکەین حەق و فەرمانی ئەوان کە لە سەرشانمانە لە یادی نەکەین.

ئیمامی شافیعی لەگەڵ دایکی دا نانی دەخوارد وەستابوو تا دایکی تێری خوارد، ئینجا دەستی کرد بە نانخواردن، دایکی لێی پرسی کوڕم بۆ نانەکەت ناخۆیت؟ وتی دەیخۆم بەڵام جەنابت تەواو بن، چونکە دەترسم دەست بەرم بۆ لوقمەیەک لە خواردنەکە و تۆش حەزی لێبکەیت و دەستی بۆ بەریت، ئەو کات بۆ من دەبێت بەسەرپێچی و فەرمانی دایکایەتیم جێبەجێ نەکردبێت لە ئاستتدا!

پاشان ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ نموونەی ئەوەی بۆ دەهێنێتەوە کە شوێنکەوتووی شەیتان نەبێت، واتا شەیتان نەپەرستێت، لێرەدا بەتەواوەتی دەردەکەوێت کە سەرپێچی ئایینی خواو

یەکتاپەرستی پێچەوانەی پەرستنی شەیتانە جا هەر شتێک بێت، بت بێت یان بیروباوەڕی تری دنیایی وەکو عەلمانییەت و لیبراڵییەت...هتد.

باوکی ئیبراهیم شەیتانی نەدەپەرست، بەڵکو بتی دەپەرست کە فەرمانی شەیتان بوو لەسەریان بۆیە کارەکە دەدرێتەوە پاڵ شەیتان، لەبەرانبەر شەیتاندا داوای لێ دەکات پەرستن بۆ ڕەحمان بکات.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەزەیی خوای میهرەبان لەسەر تاوان، وەڵامی باوکی زۆر نابەجێ بوو وەکو هەموو باوکانی تری لووتبەرز کە گوێناگرن بۆ منداڵەکانیان وتی: لاچۆ ونبە لەبەرچاوم بڕۆ ئەگەر بەدڵت نییە ماڵ بەجێبهێڵە و بۆکوێ دەڕۆیت بڕۆ!

ئینجا ئیبراهیم بەوپەڕی ڕێزەوە بەباوکی فەرموو: باشە زۆر سڵاوت لێ بێت و هەوڵی داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، کە دەڵێیت بەجێم بهێڵە، هەرگیز بەجێت ناهێڵم بەڵام بۆ ماوەیەک لێت دووردەکەومەوە، باوکی وشەی (هجر) بەکار دەهێنێت، بەڵام ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ (إعتزال) بەکار دەهێنێت.

باوکی ئیبراهیم سەرکەش بوو، بەکافری مرد.

لەفەرموودەیەکدا هاتووە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: لەڕۆژی قیامەتدا حەزرەتی ئیبراهیم ئازەری باوکی دەبینێت کە ماندووە و عارەق بەناوچاویدا دێتە خوارەوە دەترسێت، حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێت: بابە نەموت بێ فەرمانیم مەکە، باوکی دەڵێت: ئیبراهیم ئیتر لەمڕۆوە بێفەرمانیت ناکەم، ئیبراهیم دوعا دەکات و دەڵێت: خوای گەورە پەیمانت داوەمەتێ، ئەمڕۆ با سەرشۆڕ نەبم، مەبەستی باوکییەتی کە سەرشۆڕی نەبێت و باوکیش لای کوڕ زۆر عەزیزە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئیبراهیم حەرامم کردووە بەهەشت لەسەر کافر[٩٩].

پێغەمبەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ ناتوانێت شەفاعەت بۆ باوکی بکات، تەواو چونکە لەدەست دەرچوون، هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناتوانێت بەهیچ شێوەیەک شەفاعەت بۆ ئەبو تاڵیبی مامی بکات با خۆشیشیان بوێت، بەڵام کافرن. ئەمەش مانای وانییە مرۆڤی موسڵمان

---

[٩٩] يلقى إبراهيمُ أباه آزرَ يومَ القيامةِ ، وعلى وجهِ آزرَ قَتَرَةٌ وغَبَرَةٌ ، فيقولُ له إبراهيمُ: ألم أقلْ لك لا تعصني ؟ فيقولُ أبوه: فاليومَ لا أعصيك ، فيقولُ إبراهيمُ: يا ربِّ ! إنك وعدْتَني أن لا تُخزيَني يومَ يُبعثون ، وأيُّ خزيٍ أخزى من أبي الأبعدِ ؟ فيقولُ اللهُ: إني حرمتُ الجنةَ على الكافرينَ ، فيقال: يا إبراهيمُ ! انظرْ ما بين رجلَيك ! فينظر فإذا هو بذِيخٍ مُلْتَطِخٍ ، فيؤخذُ بقوائمِه ، فيُلْقَى في النَّارِ/أخرجه البخاري، رقم ٨١٥٨.

نەتوانێت مرۆڤی كافری خۆشبووێت، واتا خۆشویستنی فیطری نەک خۆشویستنی سەركەوتن بەسەر موسڵماناندا، هەروەكو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ مامی خۆشدەویست.

(إنك لاتهدي من أحببت...)

كەواتە مرۆڤی موسڵمان دەتوانێت كافری خۆشبوێت بەو مەرجەی كاریگەری لەسەر ئایینەكەی دا نەنێت، واتا باوكت كافرە ئەشێت خۆشت بوێت وەكو باوكێک، یان دایک بەو شێوەیە. بەڵام خۆشەویستیان بەسەر ئایینەكەتدا زاڵ نەبێت و ئایینەكەت لەوان خۆشتر بوێت، پلەبەندی لەنێوانیاندا بكە، پلەی یەكەم ئایینەكەت دوای ئەوە خۆشەویستییەكانی تر دابەش بكە.

## ئەقڵ و چاو كوێربوون

خەڵكی بابل بتەكانیان لەناو جێگای عیبادەتی ڕاستەقینەدا دانابوو، بەبەڵگەی ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم كاتێک پێیان دەفەرموێت: بۆ ئەم بتانەتان لە جێگایەک داناوە كە جێگای بەندایەتییە، چونكە وشەی (إعتكاف) لەجێگای پیرۆزدایە، وەكو مزگەوت ئایەتەكەش كە پێشتر ئاماژەمان پێداوە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ الأنبياء

واتە: كاتێک كە بەباوك و قەومەكەی وت: ئەم بت و پەیكەرانە چیە؟! ئێوە بە دەوریدا دێن و دەیانپەرستن.

ئەمەش ئەوەمان نیشان دەدات واتا ئەسڵ و بنەڕەتی ئایینی ڕاستەقینەیان مابوو، بەڵام گۆڕانكاری یان بەسەردا هێنابوو لای جیلەكانی ڕابردووو بەهەڵەی ئەوان واتا جیلی ڕابردوویان، پێشینانیان، كەوتبوونە شوێن ئەم پەیكەرانە.

وەڵامیانداوە زۆر بە لاوازی و خۆدەرباز كردن وتیان: باووباپیرانمان پەرەستویانن ئێمەش دەیانپەرستین!

ئەمەش ئەوپەڕی جاهیلییە، چونكە كرداری باوباپیرانمان هەموو نابێت بەزانست و ئایین و ئاكار و ڕەوشت، بەدڵنیاییەوە باوباپیرانمان لە زۆر شتدا هەڵەیان كردووە.

ئەگەر نموونەی باوباپیرانی خۆمان وەربگرین لەم سەردەمەی ئێستاماندا زۆر دواکەوتوو و نەزان بوون لەبواری زانست و تەنانەت ئایینیشدا چ جای توانای داهێنان و پاشان باسی سەردەمێک دەکەین لە ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم کە بە هەزاران ساڵ لەنێوانماندا هەیە.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکە بکەین حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ زۆر بەتوندی لەگەڵیاندا ئاخافتن دەکات، پێشتر بانگەوازی دەکردن پێویستی بە نەرمونیانی بوو، بەڵام ئێستا ڕووبەڕووبوونەوەیە طەرەفی بەرانبەر بەرگری لە خواکەی دەکات و بتەکانی سەردەخات لێرەدا، مێتۆدی بانگەواز شکستی بەرانبەر دەردەخات، دەبێت خاوەن بەڵگە (ئارگۆمێنت) و وتەی بەهێز بێت، چونکە خەڵکی تر لەو نێوانەدا گوێگرە و تەماشاکەرە، هەر کەموکورتییەک لە تۆ دەبینرێت وەکو خاڵ بۆ طەرەفی خوانەناس هەژمار دەکرێت.

هەربۆیە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بەڕاستی ئێوە و باووباپیرانتان لەهەڵە و گومڕایی سەرلێشێوایدا بوون.

ئێستاش هەروەکو سەردەمی جاهیلییەتی ئیبراهیم بە خەڵکی دەڵێن ئەوکارە ئەنجام مەدە حەرامە؟ بەڵام ئەو وەڵامی ئەوە دەبێت دەڵێت نا حەرام نییە، باوباپیرانمان کردوویانە بۆچی حەرام نەبووە ئێستا تۆ حەرامی دەکەیت؟

لێرەدا دەبێت بڵێین ڕاستەخۆ باوباپیرانیشت هەڵە بوون و تاوانبار بوون، جا ئەگەر بە نەزانییە ئەوا جاهیلن، کە زانیویشیانە پەنا بەخوا سەرگەردان و ماڵوێرانی هەردوو دنیان.

ئینجا کە زانیان حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ زۆر جدییە و ئایینەکەی خوای بەڕاست دەزانێت و یەقینی هەیە، کەوتنە پرسیار ناچار بوون هەڵوێستیان لاواز بوو، وتیان ئیبراهیم بەڕاستی تۆ حەقت بۆ هێناوین یاخود گاڵتەمان پێدەکەیت، لێرەدا دەردەکەوێت کە زمانی ئەوان هێمن تر بووە و خاوەنی بەڵگەو ئارگۆمێنتی ئەمان، هەربۆیە خێرا دەستبەجێ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بەڵی خوای پەروەردگار ئەو پەروەردگارمە کە بەدیهێنەری ئەم گەردوونەیە، زاتی بەرزی هێناویە بوون، منیش لەسەر ئەوە ئیمانم هەیەو شاهیدم لەسەری و لەسەر ئێوەش.

ئیبراهیم شاهیدی لەسەر بەدیهێنەری کەونە، کە خوای تاک و تەنهایە، ئێمەش لاسایی ئەو پێغەمبەرە دەکەینەوە کە دەڵێت: (آشهد أن لا اله إلا الله) شاهیدی دان لەسەر ئیمان کە بوونی یەکتای خوای پەروەردگارە، سەرچاوەکەی چاو نییە، بەڵکو سەرچاوەکەی ئەقڵە کە چاو دەبینێت و ئەقڵ سەرەتا پەی پێدەبات، چونکە شاهید دەبێت ببینرێت بەچاو تا حاکم یان دادوەر لەهەر

بوارێکدا بێت شاهیدی قبوڵ بکات و وەریبگرێت، بەڵام ئەم گەردوونە بەئاشکرا و ڕاشکاوانە ئەوەت نیشان دەدەن کە دەستی خالقێکی پێوە دیارە.

بۆیە هەموو شاهیدی ئیمان دەدەین بە یەکتاپەرستی خوای موتەعال، بۆتە شاهیدیەکی ڕەها بۆ ئیمانداران.

هاوەڵێکی پێغەمبەر بەناوی (أبو خزیمه) بینی کە یەهوودییەک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کێشەی دروست کردووە لەسەر درعێک، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە درعی منە، جووڵەکە وتی: شاهیدت هەیە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: کێ شاهیدیم بۆ ئەدات کە ئەو درعە من خاوەنیم، ئەبو خوزەیمە ڕاستەوخۆ وتی: من شاهیدی ئەدەم کە ئەو درعە پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنیەتی، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زانیت ئەوە درعی منە؟

ئەبو خوزەیمە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من بڕوات پێ دەکەم لەلای جوبریلەوە وەحیت بۆ دێت و پێغەمبەری خوایت، ئیتر چۆن شاهیدی نادەم کە تۆ خاوەنی ئەو درعەیت، تۆ ڕاستگۆترین مرۆڤیت.

کەواتە شاهیدی دان لەبواری ئیمانی پێویستی بە بینین نییە، بەڵکو پێویستی بە ئەقڵە، ئەگەر ئەقڵ ساغ و تەندروست بێت ئەوە بە دڵنیاییەوە چاویش ساغ و تەندروست دەبێت.

پاشان بۆ جوڵاندنی ئەقڵی ئەو خەڵکە هەڵسا بە شکاندنی هەموو بتەکان و تەشوێکەی دایە دەستی بتە گەورەکە، کە بینیان بتەکان هەموویان شکاون تەنها گەورەکەیان نەبێت، زانییان ئیبراهیم ئەو کارەی کردووە، چونکە ئەو خۆی فەرمووبووی کە پلانێک دەدارِێژێت بۆ بتەکانیان بە ڕاستگۆیی قسەی کردبوو، هەربۆیە خوای موتەعال بە (صدیق) ناوی دەبات لە قورئاندا. بانگیان کرد وتیان تۆ وات کردووە لە بتەکانمان ئیبراهیم، نەک لەبەر ئەوەی گومانیان هەبێت بەڵکو دڵنیا بوون لەئەنجامدانی کارەکە لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە، بەڵام لە شێوەی لێکۆڵینەوە دا (تحقیق) ئەویش بۆ گاڵتەپێکردنیان و جوڵاندنی بیرو هزریان فەرمووی: تەشوێکە لای کێیە ئەوە کردوویەتی، دە لێی بپرسن، ئەوان هەموو تووشی شۆک بوون، بەڵام کوێر بوونی ئەقڵیان وای کرد کە مل بابدەن و بڵێن چۆن ئەوانە قسە دەکەن؟ ئەوانە بت و پەیکەرن، هیچ قسە و دەنگیان نییە.

ئیبراهیم فەرمووی: ئۆف لەدەستی ئێوە، شتێک دەپەرستن کە نەدەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن، نە دەتوانن قسە بکەن.

ئینجا ئەنجامی بێئەقڵی خۆیان نیشان ئەدات و ئەڵێت: ئێوە شتێک دەپەرستن بێجگە لەخوا هیچ دەسەڵاتێکیان نییە و زیان و سوودیان هیچ نییە، ئەمە چۆن ئەقڵ و تێگەیشتنێکە هەتانە؟

کە توانای ئەوەیان نەبوو بە ئەقڵ وەڵامی ئیبراهیم بدەنەوە، هاواریان کرد بیسوتێنن، لەدوای ئەوەی ئیبراهیمیان دەستگیر کرد، گاڵتەیان پێ کرد و لە خۆشیدا هەڵدەپەڕین، ئەمەش هەمیشە پیشەی ئەهلی جاهیلی کافر و گومڕایە کە توانای وەڵامیان نەبوو دەکەونە قسەی قۆڕ و گاڵتە کردن بە خەڵکی خاوەن ئەقڵ، تەنانەت توانای سوتاندنیشیان نەبوو، خوای گەورە حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ ی پاراست لە ئاگرەکە.

پێشتر دیبەیتی کردبوو لەگەڵ سەرۆکی ئیمپراتۆریەتی کلدانی نەمروود، حوججەو بەڵگەی بەهێزی بەرانبەر بەکارهێنا ئەویشی دەمکوت کرد.

## هیجرەت لە پێناوی خوادا

هیجرەت توخمێکی گرنگی ئیمانە و هەروەها ئیسلامە، هەموو مرۆڤێک پێویستی بە هیجرەت کردن هەیە، دەشێت هیجرەت لەناخی خودی مرۆڤەوە دەست پێ بکات، واتا لە خراپەکاری بەرەو چاکەکاری، هیجرەت لەناو دڵ و دەروونەوە بۆ چاکسازی دەکات.

پێغەمبەر ئیبراهیم لەدوای ئەوەی لووط ئیمانی هێنا بە پێغەمبەرایەتی و شوێنی بەرنامەی ئیسلامی حەنیف کەوت، حەزرەتی ئیبراهیم بڕیاری هیجرەتی دا کەئیتر بە وڵاتاندا و بەشارو لادێکاندا و هەموو شوێن و جێگاکاندا بگەڕێت بۆ بانگەواز تا بتوانن زۆرترین خەڵک بانگێشت بکەن بۆ یەکتاپەرستی، ﴿۞فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝﴾ العنكبوت

واتە: ئینجا لووط باوەڕی پێ هێنا، ئیبراهیم دوای ئەوەی کە نائومێد بوو لە قەومەکەی وتی : بەڕاستی من ئیتر کۆچ دەکەم بۆلای پەروەردگارم (بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو بۆم دیاری دەکات) چوونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی زۆر بە دەسەڵات و دانایە.

هاتووچۆی لەنێوانی ئەو جێگا و شارو وڵاتانەدا هەروا شتێکی بێ هوودە و بێ ئامانج نەبووە، بەدڵنیاییەوە هەمووی ئاراستەی وەحی لە پشتەوە بووە، هەمووی فەرمانی پەروەردگاری بووە.

لەڕابردووودا لەباسی ژیانی ئیبراهیم دا ئاماژەمان پێکرد کە چوونی بۆ میسر هەر هۆکاری بانگەواز بووە، هیجرەتی خاتوو هاجەریش هەر فەرمانی خوایی بووە، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە بانگەوازی یەکتاپەرستی بڵاوبکاتەوە، ڕاستە لەناو دۆڵی مەککە جێگای حەرەم لەنێوان سەفا و مەروا دە کەسی تێدا نەژیاوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە چواردەوری ئەو جێگایە خەڵکی تێدا بووە ئاوەدانی ئەو جێگایە لەلایەن ئەو خانەوادەوە هەروا شتێکی ئاسان و سانا نییە، بەڵکو ئاوەدانی ئەو جێگایە و هەڵقووڵانی ئاوی زەمزەم بۆ کارئاسانی ئەو خێزانە موبارەکەوە دەبوو لەلایەن خوای پەروەردگارەوە...

ئەوەش جێگای بڕوا نییە کە ئیبراهیم پێغەمبەر لەوێدا بەجێی هێشتبێتن و وازی لێهێنابێتن، هیچ سەرچاوەیەی ڕاستیمان لەبەردەستدا نییە، ڕێگاشی تێناچێت خوایەک بەو هەموو بەزەیی و میهرەبانییەوە فەرمان بە پێغەمبەرەکەی بکات کارێکی لەو شێوەیە ئەنجام بدات، پاشان هیچ ئامانجێکی لە پشتەوە نییە بۆ مرۆڤایەتی و بەندایەتی.

بەهەرحاڵ دەشێت ماوەیەک کەوتبێتنە نارەحەتی بەهۆکاری بێئاوی، خوای گەورە زەمزەمی بۆ هەڵقووڵاندن، بەڵام بەوجوودی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵیاندا، حەزرەتی ئیبراهیم لە نێوانی شام و حیجازدا لەهاتوچۆی بانگەوازدا بووە، کە لە داهاتوودا هەردوو جێگاکە دەبێتە سەرچاوەی ناردنی وەحی خوای گەورە بۆ پێغەمبەران بەگشتی.

هاتنی هۆزێک بۆ ئەو ناوچەیە بەناوی هۆزی (جورهەم) لە ڕێگای بانگەوازی ئیبراهیمەوە بووە، پاشان ئیسماعیلی کوڕی کە لەداهاتوودا باسی ژیانی جەنابیان دەکەین بەدووروودرێژی.

## شوێنکەوتنی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام چیمان فێردەکات؟

شوێنکەوتنی ئیبراهیم سێ خاڵی گرنگ فێری ئوممەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات کە ئەو سێ خاڵە لەهەموو ژیانماندا ڕێ دەکات.

خاڵی یەکەم: بەردەوام بوون لەسەر بانگەواز و دڵسۆزی و جەخت کردنەوە لەسەر گەیاندنی ئەم ئاینە بۆ ئەوەی وەسیەتی ئەو بهێنینە دی فەرمووی: خوایە کەسانێک هەن بەردەوام: لەلاڕێ کردنی بەندەکانت، بۆیە مرۆڤی موسڵمان دەبێت خوێن و گۆشتی بۆ ئیسلام بێت، هەروەکو چۆن لەجەنگی ئوحود دا دروشمیان بریتیبوو لە خوێن و گۆشت ئاینەکەمانە (لحمک و دمک هو دینک) ئەوە پێویستە یەکێک بێت لە سیفەتی بانگخواز، لە ئێستادا یەک لەسەر سێی زەوی خوای گەورە بەڕاستی ناپەرستن، ئایا ئێمە توانیومانە ئەو بانگخوازە بین کە حەزرەتی ئیبراهیم داوای لێکردووین؟

خاڵی دووەم: پابەندبوون بە ئایینی خوای گەورە (فمن تبعني فأنه مني) مرۆڤ ناتوانێت بانگخواز بێت هەتاکو خۆی پابەند نەبێت بە ئایینەکەیەوە، ناکرێت من بانگخواز بم و بەخەڵکی بڵێم نوێژ بکە و ڕۆژووبگرە و زەکات بدە، بەڵام خۆم ئەنجامی نەدەم، هەروەها مرۆڤی بانگخواز دەبێت خاوەن ئیخلاص و دڵسۆزی بێت بۆ ناوبانگ کار نەکات لەپێناوی ئایینەکەیدا هەموو شتێک ببەخشێت و قوربانی بدات.

خاڵی سێیەم: بەرانبەر بە خەڵکی بەبەزەیی و نەرم ونیان بێت، هەڵبەت ئەوانە کە شارەزا نین و سەرپێچی دەکەن و تاوانبارن، بەڵام دژایەتی ئایینی خوای گەورە ناکەن (ومن عصاني فإنک غفور رحيم)، هەڵبەتە بۆ ئەو کەسانە نییە کە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانەی کە گۆڕەپانی جەنگیان گرت لە موسڵمانان ناکرێت تۆ گوڵیان تێبگریت، دەبێت بەزمانی خۆیان و کرداریان وەڵام بدرێنەوە.

بەڵام ئەوانەی کە خەڵکی گشتی و هیچ نازانن بە حەرام و حەڵاڵ و شارەزا نین لە ئەحکام و بیروباوەڕی ئیسلامی پێویستە زۆر بە نەرم و نیانی لەگەڵیاندا بەرخورد بکرێت.

لێرەدا ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم لە گۆشەنیگای خودی خۆی کە تایبەتە بە جەنابیان کۆتایی پێ دەهێنین، بەڵام سێ قۆناغی گرنگ لە ژیانیدا جارێ لامان ماوە باسی بکەین، قۆناغی لەگەڵ حەزرەتی لووط و پاشان قۆناغی ژیانی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی و قۆناغی ژیانی حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی، ئەم سێ تەوەرە بەشێکی تر لە ژیانی ئەم پێغەمبەرە عەزیزە گەورەیە کە باوکی هەموو پێغەمبەرانە ڕوون دەبێتەوە، لەئەنجامی باسکردنی ئەو سێ پێغەمبەرەی تردا سەلامی خوا لە هەموویان بێت، کەواتە لێرەدا ژیانی بەجێ دەهێڵین و ڕوودەکەینە ژیانی ئیسماعیلی کوڕی کە ئەویش بە یەکێک لە پێغەمبەرانی سەرەتا هەژمار دەکرێت و مەملەکەتێکی نوێ بۆ ژیانی ئیسماعل عَلَيْهِ السَّلَامُ و باوکی بەڕێزی لەم کتێبەدا بونیاد دەنێین.

# مەملەکەتی هەشتەم:
# ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەر ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ

ناوی پێغەمبەر ئیسماعیل ١٢جار لە قورئان دا هاتووە.

ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی ئیسماعیل زۆرێک لە ڕەهەندەکانی دیار نییە، یان ئەوەیە کە دووبارەیە لەژیانی پێغەمبەرانی تردا، لەوانەیە بەم هۆکارە بێت خوای پەروەردگار بۆی باس نەکردبێتین لە قورئانی پیرۆزدا، بەڵام ڕەهەندە گرنگەکانی ژیانی لەگەڵ باوکی بەڕێزی حەزرەتی ئیبراهیم دا بۆمان ئاشکرا و ڕوون بۆتەوە.

ئیبراهیم خاوەنی دوو کوڕ بوو هەردووکیان پێغەمبەر بوون، ئیسماعیل یەکەم کوڕیەتی وەکو کورد دەڵێت: نۆبەرەیەتی لە خاتوو هاجەر، ئیسماعیل برایەکی تری بەناوی ئیسحاق هەبووە، ئەویش لایەنە زۆر گرنگەکانی ژیانی ئاشکرا نییە، هەر پێدەچێت ئەمەش بەهۆکاری ئەوە بێت کە بانگەوازی پێغەمبەران لەیەک دەچن، زۆرێک لە ڕەهەندەکانی ژیانی باس نەکراوە، بەڵام لەم دوو برایە پێغەمبەرستانێک هاتۆتە دی، بەتایبەت لە ئیسحاق کە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

لەدوای لافاوێکی زۆر لە نیوە دوورگەی عەرەبی، جێگایەک بەناوی بەنداوی (میئرەب) دەڕوخێت و زۆرێک لە ناوچەنشینەکانی عەرەب لەوڵاتی یەمەن بڵاوە دەکەن بەناو نیوەدوورگەی عەرەبیدا، عەرەبیش گەلێکی زۆر بوون لەو ناوچەیەدا، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمانی پێکرا کە ڕوو لەو ناوچەیە بکات، پێشتر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ لە بانگەوازی بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستی دابوو، لە عێراق و ناوچەی سوریای ئەمڕۆ بانگەوازی دەکرد، پاشان بەرەو فەلەستین و وڵاتی میسر هیجرەتی کرد، هەر بەهۆکاری بانگەواز و بڵاوکردنەوەی خواپەرستی، ئەوانەی کە دەڵێن: بەهۆکاری قات و قڕی و وشکە ساڵی کۆچی کردووە بۆ میسر هیچ بەڵگەیەک لەبەردەستدا نییە، تەنها گریمانێکە و هیچی تر، بەڵام کۆچەکانی تری لە ئوورەوە بۆ بابل و لە بابلەوە بۆ ناوچەکانی نەینەواو حەران و پاشان حەلەب و ناوچەی شام لە فەلەستینی ئەمڕۆدا و هەمووی بەهۆکاری بانگەواز بووە، ئەی بۆچی چوونی بۆ میسر بۆ بانگەواز نەبووبێت؟ لەکاتێکدا زۆریشی تێدا نەماوەتەوە و خێرا گەڕاوەتەوە بۆ شام، خۆ ئەگەر لەبەر قات و قڕی و وشکە ساڵی بوایە دەبوو زیاتر بمێنێتەوە، لە کاتێکدا زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بازرگانێکی دەوڵەمەند و خاوەنی مەڕومالاتی زۆر بووە، هەروەها چوونی بۆ

میسر بەهەمانشێوە بۆ بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرسی بووە، هەوڵی داوە بانگەوازەکەی بگاتە هەموو جێگاکان، هەر لەو کاتەدا ئاشنا دەبێت بە خاتوو هاجەر، جا ئەوەی کە لە تەورات سفری تەکوین دا هاتووە باسی جاریە و خزمەتکار بوونی خاتوو هاجەر دەکات، شێوەی دەمارگیری یەهودی پێوە دیارە و پێناچێت ڕووداوەکان کە باسکراوە بە شێوەیەکی ورد لەوێدا باس کرابێت.

وەکو ئەوەی خوای گەورە باسی کردووە لای هەمووان ئاشکرایە خوای گەورە دەفەرموێت: یەهود دەستکاری تەوراتیان کردووە و جێگا گۆڕکێی زۆریان بە وشەکان کردووە، بە ئارەزووی خۆیان نوسیوویانەتەوە. هێنانی خاتوو هاجەر و خستنەوەی منداڵ لەو خانمە بەڕێزە بە فەرمانی خوایە، نەک فەرمانی خێزانەکەی خاتوو سارا، چونکە ڕۆڵی وەچە خستنەوە لەناو پێغەمبەراندا خوای گەورە بڕیاری لەسەر دەدات، نەک سارا خاتوونی خێزانی، بەهەرحاڵ خاتوو هاجەر بووە خێزانی و کوڕێکی لێی بوو بەناوی ئیسماعیل.

دەگەڕێینەوە بۆ ناوجەرگەی مێژوو، لەو سەردەمەدا (بێزەنتین) سەرەتای دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتیان بوو، بەناوچەکانی کەناری دەریای ناوەڕاست پەلوپۆی هاویشتبوو، لە نیوەدوورگەی عەرەبیش کۆمەڵگە عەرەبییەکان بەهۆکاری لافاو لەناوچەی وڵاتی یەمەن پرژوبڵاو بوونەوە، یۆنان کە بە گریک ناسراوە، یاخود بە (بێزەنتینەی یەکەم) کەناوی خوای گەورەی ئەوان بووە، دوایی ناوی بێزەنتین لە پاشاکانیان دەنێن و ناوی خواکەیان دەگۆڕێت بۆ ئاپۆلۆ و زیوس و ژوپیتەر.

حەزرەتی ئیبراهیم وەکو کاری ڕێکخستنی بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستی و ئایینی حەنیفی ئیسلام، لوط عَلَيْهِ السَّلَامُ لەناو ناوچەکانی بندەستی یۆنان بانگەواز دەکات، ئیسماعیلیش لەناو عەرەب، ئیسحاق لە شام و دواییش بەهۆکاری یوسف دەچنە میسر، زۆرێک دەڵێن کە گوایە یەکێک لە پادشا و دەسەڵاتدارەکانی ئەو دەمە لەوڵاتی میسر بەناوی (هیکۆس) دەبێت، هەرچەندە (هیکۆس) لە سەردەمی ئیبراهیم دا بە دووری دەگرم، بەڵام دەشێت وابێت لەوانەیە چەند هیکۆس-ێک هەبووبێت بە ژمارە جیاکرابێتنەوە وەکو هیکۆس ١، ٢ و ٣...هتد.

خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئیبراهیم کە بنەوبارگەی لەناوچەی نیوە دوورگەی عەرەبی بخات لە ناو دۆڵی مەککە و سەرلەنوێ کەعبە دروست بکاتەوە لەکاتی چوونی بۆ مەککە، ماوەیەک لەو جێگایەدا مایەوە کەعبەی بە بەرد و کەڵەک بەرز کردەوە وەکو قۆناغی یەکەم، پاشان ناوچەکە کە تێیدا مانەوە زیاد یان زۆر بێ ئاو بوو، ئەمەش وای کرد کە دایکی ئیسماعیل بە هەڵەداوان لەنێوان تەپی سەفا و مەروادا هاتووچۆ بکات بگەڕێت و بڕوانێت، بەڵکو کاروانێک یاخود خەڵکێک لەو ناوچەیەدا بەدی بکات، تا داوای زاد و ئاویان لێبکات، لەوکاتەدا

حەزرەتی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام دوعا دەکات و دەفەرموێت: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾ إبراهيم

واتە: پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە، لەپاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لە پاڵ (بيت الحرام) دا، پەروەردگارا، بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بەچاکی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جاداواکارم دڵی هەندێک لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

خوای پەروەردگار ئاوی زەمزەمی هەڵقووڵاند لەبن قاچی حەزرەتی ئیسماعیل، ئاوی زەمزەم بووە ئاوەدانی بۆ دۆڵی مەککە و ئەو کۆچەرەوانەی عەرەب کە زانییان لەو جێگایەدا ئاو هەیە، ئەوانیش مانەوە هەڵبەت ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَام لەگەڵ هاتنی بۆ ئەو جێگایە دەشێت وڵاغ و وشتر و مەڕوماڵاتی پێ بووبێت، چونکە ناکرێت ڕێگایەکی چەند مانگەی نێوان شام و نیوەدوورگەی عەرەبیدا بێ وشتر و مەڕوماڵات هاتووچۆی کردبێت، هەر ئەو ئاوەش بووە هۆکاری ژیانی ئەو خانەوادەیە لەگەڵ ئەو مەڕو ماڵاتە و مانەوەی ئەو عەرەبە کۆچەرەوانە لەوێدا نیشتەجێ ببن و ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم هەر خەریکی بانگەواز و بڵاوکردنەوەی ئاینی خوایە تا ئەو کاتەی ئیسماعیل گەورە دەبێت و بەیەکەوە بناغەی کەعبە دادەڕێژنەوە و دیواری بەرز دەکەنەوە، ئەو جێگایە دەبێتە شوێنی حەجی خەڵکی و خەڵکێکی زۆر بەهۆکاری ماڵی خوا لەو ناوچەدا کۆدەبنەوە و بزووتنەوەی بازرگانی و پاشان بۆ پاراستنی ئەو بزووتنەوە بازرگانییە مانگە قەدەغە کراوەکان دادەمەزرێت، لە سەردەمی ئیسماعیلەوە چونکە بەهۆکاری ئەوەی ناوچەکە بێ بازرگانی و کشتوکاڵ بوو، خەڵکی ئەو نیوەدوورگەیە لەسەر ڕاو و ڕووت دەژیان، لەمانگی حەرام دا وەکو ناسراوە بە (ئیلاف) بازرگانی خۆیان دەکرد پاشان هۆزی جورهەم زۆر ڕێزی دایکی ئیسماعیل و خودی ئیسماعیل-یان دەگرت لە نەبوونی ئیبراهیم دا مەڕوماڵاتیان بۆ دەلەوەڕاندن و ئاگایان لەوان دەبوو لەبەرانبەریدا ئەوانیش سوودیان لە ئاوی زەمزەم وەردەگرت، بەم شێوەیە ژیانیان لەوناوچەیەدا دەڕۆیشت، لەدوای داواکردنی خوای گەورە لە ئیبراهیم کە بانگەوازی حەج بکات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ٢٦ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ٢٧﴾ الحج

واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەیاد بێنە) کاتێک شوێنی کەعبەمان دیاری کرد بۆ ئیبراهیم (دوای تەواوبوونی، فەرمانمان پێدا) کە هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت و (بیکە بە بنکەی یەکخواناسی) وماڵی من پاک بکەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، یاخود بە پێوەن یان لە کڕنووش و سوژدە بردندان﴿٢٦﴾ جا بانگی خەڵکی بکە و جاڕ بدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج، ئەوانیش بەپیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بەسواری (ئەو وشترانەی کە دووری ماوەکە) لاوازی کردوون و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێن﴿٢٧﴾

ئیتر بووە فەرز بەسەر هەموو ئیمانداریێک کە حەج بکەن و بڕۆنە ئەو جێگایە، ئەوە یەکەم جێگاو ماڵی خوایە کە شایستەی ئەوەیە حەجی تێدا بکرێت.

جا ئیتر بووە دروشم و لەناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە بانگەوازی ئیبراهیم لەدنیادا ناووناوبانگی دەرکرد و خەڵکی زۆر شوێنی ئایینەکەی کەوت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران

واتە: بەڕاستی یەکەم خانەو ماڵ ومەنزڵگایەک کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی (بۆ خوا پەرستی) ئەوەیە کە لە مەککەدایە کە هیدایەت و ڕێنمویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان﴿٩٦﴾ (لە کەعبەدا) نیشانەو بەڵگەی زۆرو ئاشکرای تیایە، شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئیبراهیمی لێیە، ئەوەی بچێتە ناوی ئەمین و ئاسوودەیە لە هەموو دەستدرێژیەک. خوای گەورە لەسەر خەڵکی بڕیاری داوە حەج و سەردانی (بیت، کەعبە) بەتایبەت ئەوانەی کە توانای (دارایی)یان هەیەو (تەندروستییان باشە)، جا ئەوەی کە باوەڕی نییە حەق پۆشە، ئەوە با بزانێت کە خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکان ( پێویستی بە چاکەو پەرستنی کەس نییە)﴿٩٧﴾

## سەربڕینی ئیسماعیل عليه السلام

ڕایەک هەیە کە لاوازە و زۆرێک لە مێژوونووسان باسیان کردووە کە ئەو دەمە لەناو خەڵکیدا باو بووە، کە یەکەم منداڵیان بکەنە قوربانی لە پێناوی خوای گەورەدا کە ئەمەش لەسەردەمی زوحاکی خوێنڕێژەوە هاتووە کە ئەو منداڵانی خەڵکی دەکردە قوربانی بۆ دەرخوارددانی مارەکانی، ئەم هۆکارە بووبووە کلتور لەناو خەڵکیدا و بەتایبەت لە خاکی عەرەب دا، ئیبراهیم

ئەو کارەی ئەنجام دا لەگەڵ ئیسماعیل دا بۆ ئەوەی لەو کارە عەرەب ڕزگار بکات و فیدیەی سەربڕینی منداڵەکانیان بووە قوربانی بە گۆشتی ئاژەڵان، تا خەڵکی سوودی لێ وەربگرن و واز لەو کارە چەپەڵە بهێنن.

هەرچەندە ئەم ڕایە لە مێژوودا بوونی هەیە و لاوازە لەڕووی سەردی مێژووییەوە، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر ڕێگای تێدەچێت و جێگای باوەڕە.

هەرچەندە دەڵێن ئیسحاقە، بەڵام ڕاست نییە چونکە دواى ئیسحاق ڕاستەوخۆ باسی یەعقوب هاتووە، ئەمەش گونجاو نییە بۆ سەربڕینی ئیسحاق، پاشان بەدوای ئەو ڕووداوەدا خوای گەورە دەفەرموێت: لەباسی ئەو ڕووداوەدا،

﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ۝ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ۝ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْيَ قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلْمَنَامِ أَنِّيٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ۝ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۝ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ۝ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ۝ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ۝ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ۝ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ۝ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ۝ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ۝ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ۝ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ۝﴾ الصافات

واتە: (ئینجا ئیبراهیم) وتی: من ئیتر دەڕۆم بۆلای پەروەردگارم (دەمەوێت هەر ئەو بپەرستم)، ئەو هیدایەت و ڕێنموونیم دەکات۝ (بەتەنیا کۆچی کرد قەومی نالەباری بەجێهێشت، لەو ڕێگەو بانەدا داوای لەخوا کرد) لە صالح و چاکانم پێ ببەخشە۝ ئێمەش مژدەی منالێکی حەلیم و خۆگرو (ژیرمان) پێ بەخشی کە (ئیسماعیل)ە ۝ کاتێک کە ئەو منالە کەوتەدەرو ماڵ لەگەڵیا (بەیانییەک پێی وت) کوڕم، کوڕی شیرینم من لە خەودا بینیومە کە تۆ سەردەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟! (کوڕی چاک و خواناس و خۆگر بە زمانی شیرین) وتی: بابە گیان هەر فەرمانێکت پێ دراوە جێبەجێی بکە، دەمبینی ئەگەر خوا حەزبکات، خوا بیەوێت لە ئارامگران دەبم ۝ کاتێک کە هەردووکیان تەسلیمی (فەرمانی پەروەردگار) بوون ئیبراهیم، بە ڕوودا (ئیسماعیل)ی خستە سەر خاک (بۆ ئەوەی سەری ببڕێت) ۝ بانگمان لێکرد کە: ئەی (ئیبراهیم) ۝ بێگومان خەوەکەت ڕاست بوو هاتە دی، ئێمە هەر ئاوا پاداشتی چاکەکاران

دەدەینەوە (لە تاقیکردنەوەکاندا سەریان دەخەین) ﴿١٠٥﴾ بەڕاستی ئالەمەدا تاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو سەرسوڕهێنەر هەیە﴿١٠٦﴾ ئێمە قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی (ئیسماعیل تا لەجیاتی ئەودا سەری ببڕێت)﴿١٠٧﴾ لەناو گەلان و نەوەکانی داهاتوودا ناوی (ئیبراهیم)مان هێشتەوە (بە ڕێزو سەروەرییەوە) ﴿١٠٨﴾ سڵاو و درووود و ڕێز لەسەر ئیبراهیم ﴿١٠٩﴾ ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە﴿١١٠﴾ بەڕاستی ئەمیش لە بەندە ئیمانداره‌کانی ئێمەیە ﴿١١١﴾ مژدەی هاتنە دنیای (ئیسحاق)یشمان پێ بەخشی کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان﴿١١٢﴾ خێر و بەرەکەتمان ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و بەسەر ئیسحاق دا و لە نەوەی هەردووکیان، واتە (ئیسماعیل و ئیسحاق)، چاکان و باشان و ستەمکارانی ئاشکراش هاتە دنیاوە ﴿١١٣﴾.

ئەگەرچی ڕای جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی ئیسماعیل بووە یاخود ئیسحاق، بەڵام لای ئەهلی ئیسلام ئەوە یەکلا بووەتەوە کە ئیسماعیل-ە و کۆڕای زانایانی لەسەر دروست بووە.

بەهەرحاڵ لەدوای ئەوەی کە پرۆسەکە ڕووی نەداو خوای گەورە گۆڕی بۆ ئاژەڵ فیدیەی درا، حەزرەتی ئیبراهیم مەڕێکی کردە قوربانی، ئەوانەی کە دەڵێن مەڕەکە لە ئاسمانەوە هاتووە، هیچ بەڵگەی ڕاست و دروست نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا گرنگ نییە مەڕەکە لە ئاسمانەوە بێت یان زەوی، بنەڕەتی موعجیزەکە لە ڕازیبوونی باوک و کوڕەکەدایە نەک مەڕەکە، چونکە مەڕەکە دەشێت لە مەڕو ماڵاتی ئیبراهیم بێت.

فەرموودەشمان هەیە کە سەنەدی ڕاستە کە ئەو بەرانە تا سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، شاخی بەرانەکە لەناو کەعبەدا بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە فرێدانی بۆ ئەوەی موسڵمانان سەرقاڵ نەکات لەکاتی نوێژدا، ئەم فەرموودەیەش زیاتر یەقینمان ئەداتێ کە ئەوەی ویستراوە سەرببڕێت ئیسماعیل بووە نەک ئیسحاق، چونکە ئیسحاق لە شام بووە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسی بکەین موعجیزەی ڕازی بوونی ئیسماعیل و ئەنجامدانی کارەکە بووە لەلایەن ئیبراهیم-ەوە کە خوای پەروەردگار بە گەورەترین موصیبەت و بەڵا ناوی بردووە: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ﴿١٠٦﴾﴾ الصافات

واتە: ئەمە بەڕاستی تاقیکردنەوەیەکی زۆر ئاشکرا بوو بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل (عَلَيهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتن و ناجیح بوون.

ئەم خۆڕاگرییەی ئیسماعیل بووە هۆکاری ئەوەی کە ڕاستگۆیی لە باوکی وەربگرێت و بگاتە پلەی پێغەمبەرایەتی، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ۝٥٤ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ۝٥٥﴾ مريم

واتە: لە کتێبی (قورئاندا) باسی ئیسماعیل بکە، بەڕاستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا ڕاستگۆ بوو، ئەو پێغەمبەرو فرستادەش بوو۝٥٤ (ئیسماعیل) هەمیشەو بەردەوام، فەرمانی دەدا بە خێزانی و خزمانی، کە نوێژەکانیان (بەڕێکو پێکی و لەکاتی خۆیدا) ئەنجام بدەن، زەکاتیش فەرامۆش نەکەن، ئەو لای پەروەردگاری شایستەی ڕێزو ڕەزامەندیی بوو۝٥٥

هەروەها دەفەرموێت:

﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ۝٤٥ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ۝٤٦ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ۝٤٧ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ۝٤٨﴾ ص

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ باس و یادی بەندە بەڕێزەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکە، هەموویان دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەیاندنی ئایینی خوادا، دەستێکی باڵایان هەبوو لە چاکە و چاکەکاریدا، هەروەها بەرچاو ڕوونی و شارەزایی تەواویان هەبوو لە هەموو ڕوویەکەوە۝٤٥ ئێمە بەڕاستی کردمانن بە بەندەیەکی تایبەتی خۆمان بەهۆی سیفەتی دنیانەویستی کە ئەویش یادەوەری ڕۆژی قیامەتە۝٤٦ بەڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمان بژاردوون و پەسەندمان کردوون۝٤٧ هەروەها باس و یادی -اسماعیل و اليسع و ذوالكفل- یشیان بۆ بکە کە هەریەکێک لەوانە لە هەڵبژاردە و پەسەندکراوەکانن۝٤٨

ئیسماعیل عليه السلام لەناو خاکی پیرۆزی مەککەدا مایەوە، لەوێ بانگەوازی دەکرد و خێزانی لە عەرەب دروست کرد و ناوی عەرەبی موسعەب لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

## میوانداری ئیبراهیم لەلایەن خێزانی ئیسماعیل-ەوە عَلَيْهِ السَّلَامُ

لە سەرچاوە مێژوویەکاندا هاتووە کە گوایە ئیبراهیم سەردانی ماڵی ئیسماعیل دەکات و خێزانەکەی بەباشی بەدەمیەوە ناچێت و دەڵێت میوان ڕاناگرین و کەسمان لەماڵ نییە، پاشان ئیبراهیم پرسیاری حاڵ و گوزەرانیان دەکات ئەویش دەڵێت: حاڵوگوزەرانمان زۆر خراپە و هیچمان نییە و هاوسەرەکەشم چووە بۆ ڕاو، ئیبراهیم دەڵێت: کەهاتەوە سڵاوی منی پێ ڕابگەیەنە و پێی بڵێ دەرگای ماڵەکەی بگۆڕێت!

کاتێک ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ هاتەوە باسی میوانەکەی بۆ گێڕایەوە، ئیسماعیل دەستبەجێ هەڵسا و وتی ئەوە باوکم بووە داوای لێکردووم تۆ تەڵاق بدەم لەبەر چاوچنۆکی و بەخیلیت، ئیسماعیل-یش لێی جیابوویەوە پاش ماوەیەکی تر ئیبراهیم گەڕایەوە بۆ مەککە، ئیسماعیل-ی بەهەمانشێوە لە ڕاو بوو خێزانی نوێی پێکهێنابوو، ئیبراهیم پێی وت: میوان ڕادەگرن؟

ئەویش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و بەخێرهاتنی کرد، پاشان ئیبراهیم پرسیاری لە حاڵوگوزەرانیان کرد، ئەویش بە پێچەوانەی خێزانی ڕابردووی ئیسماعیل وەڵامی دایەوە کە زۆر خۆش گوزەرانن، ئینجا ئیبراهیم داوای لێکرد کە سڵاوی من بگەیەنە هاوسەرەکەت و پێی بڵێ کە دەرگای ماڵەکەی بەهێزە با ئاگاداری بێت!

لە ڕێوایەتدا هاتووە کە بە سارا خاتوونی وتووە نایانبینم تەنها سەردانیان دەکەم، لە گەڕانەوەی ئیسماعیل دا خێزانی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەوە باوکمە ئاگاداری کردومەتەوە کە ئاگام لە تۆ بێت و هەرگیز لەگەڵت جیانابمەوە، ئەم ڕووداوە پێناچێت ڕاستی بێت و لەڕووی مێتۆلۆجییەوە داڕێژراوە و زۆر خەیاڵی دیارە! پاشان دەڵێت بەبۆنی زانی باوکێتی!

چونکە ئیبراهیم بڕوات بۆلای ئیسماعلی-ی کوڕی ئەو هەموو ڕێگایە ببڕێت ئەوەندە خەم سارد نییە کوڕە جگەرگۆشە پێغەمبەرەکەی نەبینێت!

هەروا بە ئاسانی دووجار چاوەڕێی کوڕەکەی نەکات تا لە ڕاو دەگەڕێتەوە، ئەمەش پێدەچێت لە خەیاڵ خەیاڵتر بێت، ئیبراهیم ئەوەندە پیاوێکی لاواز نەبووە گوێگربێت بۆ خێزانی، کاری زوڵمی پێ بکات، پێغەمبەران زوڵم قبوڵ ناکەن، سارا خاتوونیش شتی وا ناڵێت.

## کۆی گشتی باس

باسی ژیانی ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ و ئیبراهیمی باوکی عَلَيْهِ السَّلَامُ پەیوەندی تەواوی هەیە بەسەر هەموو تاکێکی موسڵمان، حیکمەت و وانەی لێ فێربوون لەم ڕووداوە ئەوەیە تۆ ئامادەدەیت چ قوربانییەکی بدەیت لە پێناوی خوای پەروەردگاردا؟ ئایا ئامادەدەی قوربانی بدەیت لە پێناوی ئایینی ئیسلام، تەنها قوربانی سەربڕینی ئاژەڵ نییە و گۆشتەکەی بەسەر ماڵە دراوسێ دا دابەش بکەین، ڕاستە ئەویش کارێکی گرنگە و لە خانەی قوربانی دایە، بەڵام تۆ ئیماندار و قوربانییەکەت چییە بۆ خزمەتی ئەم ئیسلامە و بانگەوازەکە.

گومان لەوەدا نییە کە قوربانی دان هەروا ئاسان نییە، مرۆڤی خواناس و دڵسۆز و ساغ و ئیمان کامڵی دەوێت، قوربانی دان ئازار و ئەشکەنجەی لە خۆگرتووە، پیاوی جوامێر ئافرەتی سوارچاکی دەوێت، قوربانی دان لە خۆبردوویی و کات تەرخان کردنی دەوێت، قوربانی دان پلەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە بۆ پلە بەرزەکانی بەهەشت، ئەگەر لێوردبوونەوە بکەین لە قوربانی دانی ئیبراهیم و ئیسماعیل-ی کوڕی (علیهم السلام) گەورەترین موعجیزە دەبینین، باوکێک تەسلیم دەبێت بۆ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و کوڕێکیش هێندەی باوکی ڕەزامەندی دەردەبڕێت بۆ سەربڕینی لە پێناوی خوادا، بەڵام ئەو دوو مرۆڤە خاوەنی هەست و سۆز و هەموو سرووشتێکی مرۆیین، بەڵام فەرمانی خوای موتەعال و پابەندبوونیان بە خۆشەویستی خوا و فەرمانەکانی دەبێتە هۆکاری دروستبوونی موعجیزە، موعجیزەکەشی لەو کارەدایە کە دەیانویست ئەنجامی بدەن، ئەوان هەوڵی ڕاستی خۆیان داو ڕاستگۆ بوون لە ئەنجامدانی کارەکەدا، دراما نەبوو بەڵکو ڕاستی و حەق بوو، بەدڵنیاییەوە خوای گەورەش میهرەبانە خاوەن بەزەیی ڕەحمی ڕەهایە چۆن کاری وا دەهێڵێت ئەنجامبدرێت، بۆیە لە جێگای قوربانی ئیسماعیل بەرانێک کرایە قوربانی کە هەزاران سوود لە خواردنی گۆشتەکە وەربگرێت، خوای گەورەش زوڵم قبوڵ ناکات و لەسەر زاتی بەرزی خۆی زوڵمی حەرام کردووە، زوڵمیش لەکەس ناکات منداڵی خۆی بکاتە قوربانی لە پێناوی خوادا بەسەر بڕین بەدەستی باوکی!

حەزرەتی ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر ژیانی لە بانگەواز و خواناسی فێرکاریدا بوو، لەنەوەی ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە بێجگە لە محمد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەبدولموتەڵیب صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە ئیمامی هەموو پێغەمبەرانە و کۆتا پێغەمبەری ئاخر زەمانە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

ئەوەی کە گرنگە لەم باسەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە بنەمای شارستانیەتی و ژیاری ئومەتی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر ئیسماعیل و ئیبراهیمی باوکی (علیهم السلام)، ژیانی پێغەمبەران ئەوەی کە بۆمان باسکراوە وەکو دەنکی ملوانکە وایە، هەموو

پەیوەندی هەیە بەیەکەوە ئەگەر پەتی ملوانکەکە پچڕا هەموو دەنکە مرواریەکان جیادەبنەوە ئەو پەتەش خودی دینەکەیە هۆنییویەتیەوە، باسکردنی ئاوی زەمزەم لەم باسەدا و هۆکاری موبارەکی دەگەڕێتەوە بۆ باسکردنی ئەوەی کە مرۆڤی موسڵمان بۆ هەر نییەتێک بیخواتەوە، چ شیفا بەخش بێت یاخود نیەتی تر بێت، وەکو وەرگرتنی زانست و تەقوا، خوای گەورە دەیبەخشێت. هەروەها پێکهاتەی ئاوی زەمزەم لەهەموو ئاوەکانی تر جیاوازترە لە تام و پاشان لە هێز و وەرگرتنی ئێنەرجی بۆ لاشەی مرۆڤ، خوای گەورە باسی کۆمەڵە هەڵوێستێک دەکات کە حەزرەتی ئیبراهیمی پێدا تێپەڕی کە سەرکەوتوو بوو لە هەڵوێستەکانیدا کە لە قورئان دا بە وشە (کەلیمە) هاتووە یاخود بە واتای (فأتمهن) هەر هۆکاری ئەو کۆمەڵە و وێستگەیە بوو کە هەڵوێستی تەوەکول بەخوا بوو، خوای گەورە ئیمامەتی پێبەخشی، ئەم ئیمامەتەش لە خۆی و نەوەکانیدا.

لەنەوەی ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ بێجگە پێغەمبەری ئازیز هیچ پێغەمبەرێکی تر نەهات، بەڵام نەوەکانی خاوەنی چەند خەسڵەت و ئاکاری بەرز بوون، ئەگەرچی تووشی تاوانی شەریک دانان بوون، بەڵام بەڕاستگۆیی مانەوە و خاوەنی کەرەم و دەست و دڵ باشی بوون، هەروەها ئازا و چاونەترس بوون، ماڵی دنیایان لا گرنگ نەبوو بۆیە خوای گەورە پلەی هاوەڵی بەخشییە هاوڕێیانی پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە لە نەوەی ئیسماعیل-ە، بەو ئاکار و خەسڵەتە بەرزانە توانیان ئەم دینە سەربخەن و پاشان بەم دینە زیاتر لە هەزار ساڵ حوکمڕانی هەموو سەرزەوی بکەن، تاکو ئەم ساتە وەختە من تێیدا دەنووسم ئومەتی ئیسلام هەر بەرز و بەڕێز و لە هەوڵ و کۆشش و جیهاد دایە و نەوەکانی بە جوامێر و ئازا و چاونەترس ناسراون.

حەزرەتی ئیسماعیل عَلَيْهِ السَّلَامُ دوو خێزانی هەبوو لە دوو هۆزی گەورەی عەرەب بوون هۆزەکانی عەمالیق-ە و جورهەم، خێزانی یەکەمی ناوی عیمارەی کچی سەعدی کوڕی ئوسامەی کوڕی ئەکیلی عەمالیق-ە بووە.

هەروەها خێزانی دووەمی کچی گەورە پیاوی هۆزی جورهەم بووە ناوی خێزانی نەهاتووە، بەڵام ناوی باوکی هاتووە بەناوی مضاض کوڕی عەمری جورهەمی.

منداڵەکانی ئیسماعیل ناویان: نابت، قیذر، مەنشا، مەسمەع، آذر، ماشی، دەما، یەطور، نیشا، طیما و قیذما، تەنها کچێکی هەبووە بەناوی نەسمە شووی کردووە بە عیصی کوڕی ئیسحاقی برای، دوو منداڵی هەبووە بەناوی یۆنان و ڕۆم!

لە تەمەنی ١٣٧ ساڵی وەفاتی کردووە لە جێگای (حیجر) نێژراوە لەگەڵ دایکی لە حەوشی کەعبەدا.

# پێڕست

# MAKWAN KERÎM

## MEMILEKETÎ PÊXEMBERAN - BERGÎ YEKEM

مەملەکەتی

# پێغەمبەران

باسکردنی ژیانی ئادەم بەو سادەیی و ساکارییەی کە مامۆستا و گەنجەکانی ئەمڕۆ لێی تێگەیشتون لە چەند کتێبێکی مێژووی کۆن تێپەڕیان نەکردوە، باسی ئادەم علیە السلام بە واتای دروست بوونی یەکەم بنەمای شارستانی لە ڕێگای هێزی زانست و دین بە واتای خوا پەرستی و مەنهەج و دامەزراندنی کۆمەڵ و کۆمەڵگە، ڕێکخستنی خێزان و خستنەوەی نەوە، بە واتای کۆمەڵگە ئەوەش سێ کوچکەی پێکهاتەی شارستانیەتە.





کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤




نرخ: ١٧٠٠٠

Cover Design: **Braw** Al-Najjar